

# زانستی تاقیگە

بۆ شیکردنەوەی پشکنینەکانی تاقیگە



ئامادەکردنی: هاوڕێ مستەفا



٢٠١٩



بەڕێوەبەرایەتی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر

سەرپەرشتیاری گشتی
سیروان عوسمان

| | | |
|---|---|---|
| ناوی کتێب | : | زانستی تاقیگە |
| بابەت | : | پزیشکی |
| نووسەر | : | هاوڕێ مستەفا |
| پیتچنین و هەڵەچن | : | نووسەر |
| نەخشەسازی ناوەڕۆك و بەرگ | : | شاخەوان جەعفەر |
| تیراژ | : | ٥٠٠ دانە |
| چاپ | : | چاپی یەکەم - چاپخانەی ڕۆشنبیری- هەولێر/ ٢٠١٩ |
| نرخ | : | ٦٠٠٠ دینار |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردن (٤٠٨)ی ساڵی (٢٠١٩)ی پێدراوە



[illegible]

## سوپاسنامە:

سوپاسی هاوکاری هاوپیشەم (ژیان محمد) دەکەم لە بەشی شیکاری نەخۆشیەکان کە یارمەتی دەرو پاڵپشتی تەواوم بوو بۆ وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردی، هەروەها سوپاسی هەر کەسێک دەکەم ئەگەر بۆ یەک جاریش یارمەتی داوم یان پاڵپشتم بوە.

# پێشەکی

**بەناوی خوای گەورە و میهرەبان**

سوپاس بۆ خودای گەورەو میهرەبان کە ئەو دەرفەتەی پێ بەخشیم بۆ ماوەی چوار ساڵ

لە هەوڵدان تێکۆشان کۆڵنەدان توانیم پەرتووکی زانستی تاقیگە تەواو بکەم کە تێدا بەشێکی هەرە زۆری زانیاری پشکنینەکانی تاقیگەی لە خۆدەگرێ،بۆ ئامادەکردنی ئەم پەرتووکە کە تێدا سوودم لە سایتی پزیشکی تاقیگەکان وەرگرتووە خستومەتە سەر زمانی شیرینی کوردی وە هەروەها سوودم لە بەشێکی کەمی سایتەکانی پزیشکی کوردی وەرگرتووە ،پاش ماندوبونێکی زۆر هەوڵم داوە کۆیان بکەمەوە کە تێدا پشکنینەکان بکەمە چەند بەشێک هەر بەشێک کۆمەڵە پشکنینێک لە خۆ دەگرێت بۆ ئەوەی کۆمەڵگەی کوردی سودی لێ وەربگرن، هیوادارم سودێکم بە نەتەوەکەمان گەیاندبێ هەرچەندە بە بابەتی کورتیش بێت، چونکە میلەتەکەمان زانیاری کەمە لەسەر زانستی تاقیگە کە تێدا ئەم پەرتووکە هەموو نیشانەکانی ئەم پشکنینانە رونکراوەتەوە ئەگەر پشکنینەکە بەرز یان نزم بێت مانای چ نەخۆشیەک دەگەیەنێ کە تێدا هەموو خوێنەرێک دەتوانی بە ئاسانی تێبگات لە پشکنینەکان وە هەروەها بە بەڵگەی زیندوو خۆم یەکەم کەسم کە سودێکی زۆر کاریگەرم تێدا بینیوە، هەروەها بەپێویستم زانی ئەم پەرتوکە بنوسمەوە بە تایبەت بۆ ئەو قوتابیانەی کە لەپەیمانگا و زانکۆکانن کە لە بەشی تەندروستی بە گشتی و بەشی تاقیگە بەتایبەتی پێویستە دوای تەواو کردنی خوێندن لە زانکۆ و پەیمانگەکان زانیاری تەواویان هەبێ لە پشکنینەکانی تاقیگە بۆ ئەوەی خزمەتێکی باشی نەتەوەکەمان بکەین.

به جوانترین شێوه چونکه نەتەوەی کورد هیچی کەم نیە لە نەتەوەکانی تر تاکو بگەین بەئەوان تەنها تۆزێک زانیاری هەوڵ و تێکۆشانمان دەوێ هەر چەندە ئەم پەرتوکە کورتکراوەیەکە کە لە سایتە پزیشکیەکان کە بە زمانی تر بڵاوکراوەتەوە خستومانە سەر زمانی کوردی کە تێدا بە یارمەتی چەند هاوکار و هاوپیشەم کەتیدا هەمیشە هاوکارو پالپشتم بوون بۆ تەواوکردنی ئەم پەرتوکە بۆ ئەوەی بیخەمە بەردەست خوێنەرانی خۆشەویست لە کۆتاییدا هیچ شتێک بێ کەموکوڕی نابێت لە کەموکوریمان ببورن پاک و بێگەردی هەر بۆ خوای گەورەیە بەهیوای سوود بینین.

**ئامادەکرنی**
**هاوڕێ مستەفا هەمزە**
**بەشیکاری نەخۆشیەکان**

# پێڕست

The usage of tubes per the colour of their cap

## Biochemistry test
## کیمیایەکان پشکنینی

## Inflammation test
## پشکنینی هەوکردنەکان



## Hematology
## زانستی خوێن

## Hormones Disease
## نەخۆشی هۆرمۆنات

## Rheumatology

### زانستی باداری (رۆماتیزمە)

## Infectious disease
## نەخۆشی زوو تەشەنەکردوو



## Cardiac disease
## پشکنینەکانی دڵ

## Microscopy and culture

### وردبین و چاندن(زرع)

## Gynco disease
## نەخۆشی ئافرەتان



## Tumor marker
## نیشانەدەری نەخۆشی شێرپەنجە

## Factor Disease

## نەخۆشی کارتێکەری خوێن مەیین



## Polymerase chain reaction

## پشکنینی (PCR)

# The usage of tubes per the colour of their cap

## بەکارهێنانی تیوبەکان بە پێی ڕەنگی سەرەکانیان

### ١- تیوبی سەر مۆر: (Lavender Top Tube)

هەروەها پێشی ئەوترێ EDTA تیوبی:- دژە مەینەو مادەی (anticoag-ulant)ی تێدایە، بۆ بەشی هیماتۆلۆجی و بەزۆری بۆ پشکنینی CBC بەکاردێ پێویستە تا نیشانەی دیاریکراو خوێنی تێ بکرێت.

### ٢- تیوبی سەر سوور: (Red Top Tube)

ئەم تیوبە هیچ دژە مەینێکی تێدا نیەو بۆ زۆربەی پشکنینە کیمیایەکان و دیاریکردنی ڕێژەی دەرمانەکان و بانکی خوێن بەکاردێ، هەرچەندی تێ بکرێ کێشە نابێ بە پێی پێویست خوێنی تێ دەکرێ.

### ٣- تیوبی سەر شینی تۆخ : (Navy Blue Top Tube)

ئەم تیوبە دووجۆری هەیە جۆرێکیان بێ دژە مەینە و جۆرەکەی تریان دژە مەینە بەکارهێنانی سەرەکی ئەم تیوبە بۆ دیاریکردنی ڕێژەی مادە کانزاییەکان و ژەهرەکانە لە خوێندا بە زۆری لە پشکنینی PT و PTT و INR و Lupus، Prothromin بەکاردێ، جۆرە بێ دژە مەینەکە هەرچەند خوێنی تێبکرێ کێشە نیە بەڵام جۆرە بە دژە مەینەکە ئەبێ تا نیشانەی دیاریکراو خوێنی تێبکرێ

### ٤-تیوبی سەر سەوز : (Green Top Tube)

ئەم جۆرەیان سۆدیۆم هیپارین یان لیسیۆم هیپارینی تێدایە بۆ هەندێ پشکنینی تایبەت بە پلازم یان ووۆل بلەد بەکاردێ پێویستە تا شوێنی دیاریکراو خوێنی تێبکرێ و ڕاستەوخۆش دوای تێکردن تۆزێک شەکیگی بۆ بکرێ بۆ ڕێگری کردن لە مەیینی خوێنەکە.

## The usage of tubes per the colour of their cap
## بەکارهێنانی تیوبەکان بە پێی ڕەنگی سەرەکانیان

### ١- تیوبی سەر مۆر: (Lavender Top Tube)

هەروەها پێشی ئەوتری EDTA تیوبی:- دژە مەینەو مادەی (anticoag-ulant)ی تێدایە، بۆ بەشی هیماتۆلۆجی و بەزۆری بۆ پشکنینی CBC بەکاردێ پێویستە تا نیشانەی دیاریکراو خوێنی تێ بکرێت.

### ٢- تیوبی سەر سوور: (Red Top Tube)

ئەم تیوبە هیچ دژە مەینێکی تێدا نیەو بۆ زۆربەی پشکنینە کیمیایەکان و دیاریکردنی ڕێژەی دەرمانەکان و بانکی خوێن بەکاردێ، هەرچەندی تێ بکرێ کێشە نابێ بە پێی پێویست خوێنی تێ دەکرێ.

### ٣- تیوبی سەر شینی تۆخ : (Navy Blue Top Tube)

ئەم تیوبە دووجۆری هەیە جۆرێکیان بێ دژە مەینە و جۆرەکەی تریان دژە مەینە بەکارهێنانی سەرەکی ئەم تیوبە بۆ دیاریکردنی ڕێژەی مادە کانزاییەکان و ژەهرەکانە لە خوێندا بە زۆری لە پشکنینی PT و PTT و INR و Prothromin، Lupus بەکاردێ، جۆرە بێ دژە مەینەکە هەرچەند خوێنی تێبکرێ کێشە نیە بەڵام جۆرە بە دژە مەینەکە ئەبێ تا نیشانەی دیاریکراو خوێنی تێبکرێ

### ٤-تیوبی سەر سەوز : (Green Top Tube)

ئەم جۆرەیان سۆدیۆم هیپارین یان لیسیۆم هیپارینی تێدایە بۆ هەندێ پشکنینی تایبەت بە پلازم یان ووڵ بلەد بەکاردێ پێویستە تا شوێنی دیاریکراو خوێنی تێبکرێ و راستەوخۆش دوای تێکردن تۆزێک شەکیمگی بۆ بکرێ بۆ ڕێگری کردن لە مەیینی خوێنەکە

**٥-تیوبی سەر زەرد : (Yellow Top Tube)**

پێشـی ئەوتـری gel Tube :- ئـەم جـۆرە تیوبانـە بـۆ بەشـی کیمیـای و بەشی بانکی خوێن سەرجەم پشکنینە سیریۆلۆجیەکان بەکاردێن لە ڕێـەوە سیرەمان دەست دەکەوێت.

مادەی Clott Activator ی تێدایە هەرچەند خوێنی تێبکرێ کێشە نیە.

**٦- تیوبی سەر ڕەساسی: (Grey Top Tube)**

ئـەم تیوبـە پۆتاسـیۆم ئۆگزالەتـی تێدایـە و بەشـێوەیەکی سـەرەکی بـۆ پشـکنینەکانی تایبـەت بـە گلوکـۆز و شـەکرە بـەکار ئەهێنرێـت، پێویستە هەتـا شـوێنی دیاریکـراو خوێنـی تێبکرێـت



# Biochemistry test

# کیمیایەکان پشکنینی

## Blood suger Test

نەخۆشی شەکرە یەکێکە لە نەخۆشییە درێژخایەنەکان کە پێویستە بەر لە تووشبوون زۆر بە وریاییەوە مامەڵە بکرێت، چونکە کاریگەری تەواو لەسەر جەستە جێدەهێڵێت وەک سڕبوونی دەست و قاچ هەروەها درەنگ چاکبوونەوەی برین و تەسکبوونەوەی دەمارەکان.

نەخۆشی شەکرە یەکێکە لەو نەخۆشیانەی هەر کات تووشی کەسێک بوو چارسەر کردنی مەحاڵ دەبێت لە سەرتاسەری جیهاندا نزیکەی ( ٥٠٠) ملیۆن تووشبووی ئەم نەخۆشییە هەیە، چەند کاریگەرییەکی لەسەر جەستە هەیە و پێویستە بە وریاییەوە ئاگاداری ئەو کاریگەریانە بیت، هەروەها پزیشکان ئامۆژگاری دەدەن کە بەر لە تووشبوون زۆر بە وریاییەوە مامەڵە بکرێت لەگەڵ هۆکارەکانی تووشبوون بە نەخۆشی شەکرە.

نەخۆشی شەکرەی کاریگەری زۆری لەسەر لیمفە دەمارییەکانی دڵ هەیە کە دەبێتە هۆی تەسکبوونەوە و پەستانی خوێن بەرز دەکاتەوە کە ئەگەری تووشبوون بە جەڵتەی دڵ زیاد دەکات.



لە کاتی تەسکبوونەوەی دەمارەکانیشدا سووڕی خوێن تێکدەچێت بەمەش بە تایبەت لە دەمارەکانی قاچ و دەستتدا کە دەبێتە هۆی سڕبوونیان، بە گوێرەی توێژینەوەیەکی ئەمریکی بۆ نەخۆشی شەکرە ٤٤٪ی وەستانی گورچیلەکان بە هۆی نەخۆشی شەکرەوەیە چونکە توانای پاڵاوتنی تەواوی هەموو ماددەکانی نییە و لە کار دەکەوێت.
یەکێک لە نیشانە دیارەکانی نەخۆشی شەکرە درەنگ چاکبوونەوەی برینە لەسەر جەستە ئەمەش بە هۆی نا چالاکی سووڕی خوێنەوە ڕوودەدات، هەروەها بە گشتی تەندروستی پێست تێکدەدات کە پێست وشک دەبێتەوە و پەڵەی تۆخ دروست دەبێت.

**نیشانەکانی توشبوون نەخۆشی شەکرە**

نەخۆشی شەکرە یەکێکە لە نەخۆشیە مەترسیدارەکان کە توشی مرۆڤ دەبێت و هەندێکجار ئەم نەخۆشیە دەبێتە هۆی مردنی کەسی توشبوو، چەند نیشانەیەك ئەم نەخۆشیە ئاشکرا دەکات لەوانەش:
١- لاواز بوونی توانای بینین: بەرز بونەوەی ڕێژەی شەکری گلوکۆز لەناو خوێندا هۆکارە بۆ لاواز بوونی بینای و لێڵ بونی بینین، چونکە گلوکۆزەکە لە دەوری هاوێنەی چاوەکە کۆدەبێتەوە و ئەمەش وادەکات بەرچاو لێڵ بێت .
٢- زۆر میزکردن: ئەم حاڵەتە یەکێکی دیکە دەبێت لە نیشانەکانی توشبوون بە نەخۆشی شەکرە.
٣- تینوێتی بەردەوام و تێر نەبوون لە خواردنەوەی ئاو، ئەمەش بەهۆی میزکردنی زۆرەوە دەبێت.
٤- سڕ بوونی پەلەکان (دەست و قاچ): بەرز بونەوەی ئاستی شەکر لە خوێندا هۆکارە بۆ سڕبوونی دەست و پێ و کەسی توشبوو بە نەخۆشی شەکرە جۆرێك هەستی لا دروست دەبێت وەك ئەوەی دەرزی بکرێت بە پەلەکانی جەستەیدا .
٥- زیادبوونی ئارەزووکردنی نانخواردن : ئەو کەسانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە زیاتر لەوانەی نەخۆشی شەکرەیان نیە ئارەزووی نانخواردن دەکەن .

٦- دەرکەوتنی جۆرێك پەڵەی ڕەنگ ڕەش لە پشتە مل یەکێکی دیکە دەبێت لە نیشانەکانی توشبوون بە نەخۆشی شەکرە، دەرکەوتنی ئەم ڕەنگە ڕەشە لە پشت مل کاردانەوەی جەستە دەبێت بۆ ئەوەی کە ڕێژەی ئەنسۆلین لەناو خوێندا لە ئاستی پێویست نیە.
٧- درەنگ سارێژ بوونی برین: یەکێك لە نیشانەکانی توشبوون بە نەخۆشی شەکرە.
٨- بەردەوام هەستکردن بە ماندوێتی و بێ ئەوەی کەسی توشبوو کاری قورس و گرانی کردبێت.
٩- هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەڕۆ بەشێوەیەکی بەردەوام، ئەمەش لەگەڵ هەموو نیشانەکانی دیکەدا مانای توشبوون بە نەخۆشی شەکرە دەگەیەنێت.

# HBA1C Test

ئەم پشکنینە ئەنجام دەدرێ بۆ دڵنیابون لە تەندروستی و ئاگاداربون لە نەخۆشی شەکرە لەناو ئێمە باوە پێی دەڵێن شەکرەی سێ مانگی ئەمە واتا شەکرەی سێ مانگی رابردوو پیشانی نەخۆش ئەدات و خەزنی سێ مانگی رابردوو لەبەر ئەوەی پێی دەڵێن دەڵێن سێ مانگی لە وێنەکە دیارە شەکرە لەگەڵ هموگلوبین یەکدەگرێ دمێتە glecohemoglobin بەمەش لەناو خرۆکە سورەکە دەمێنیتەوە ٩٠ -١٢٠ رۆژە کە کەمترین ژیانی خرۆکەکەیە دەکاتە ٣ مانگ. ئەو پشکنینە هەر کاتێک بێت دەتوانرێ بکرێت ئەمەش چونکە (خواردن، وەرزش، خەم، خواردنی دەرمانی نەخۆشی شەکرە، گوڕانیەڵ نەبونی نەخۆش) هیچ کار لە ئەنجامی پشکنینەکە ناکات، بۆیە بەنەخۆش دەوترێ کە پێویست ناکات بەرۆژوو بێت و ئاسایە نان بخوات. نەخۆشیەکانی خوێن کاردانەویان لەسەر ئەنجامی ئە پشکنینە هەیە بۆ نمونە (تالاسیمیا، شێوەداسی، کەمخوێنی،.....) هەر بۆیە ئەگەر نەخۆش ئەو حاڵەتانەی هەبوو ئەنجامی پشکنینەکە بە ئەگەرێکی زۆر هەڵە دەردەچی هەندێ جار.

هەرکەسێک بەتایبەت ئەوانەی تازە تووشی نەخۆشی شەکرە بوون یان خراونەتە سەر دەرمان یان تازە دەرمانیان گۆردراوە وە ئەگەر دوو جار یان سێ مانگ شەکرەکەی کۆنترۆڵ بوو ئەنجامەکەی ئەوا دواتر شەش مانگ جارێک دەکرێت.



# Islet cell antibody Test

ئەم پشکنینە بریتیە لە دەستنیشانکردنی ڕێژەی ئەو دژەتەنانەی کە هێرش دەکەنە سەر خانەکانی پەنکریاس (Beta Cell) کە بەرپرسن لە دروستکردنی ئینسۆلین (Insulin) لە لەشدا، ئەم دژەتەنانە پێکدێن لە پرۆتینێک کە لەلایەن سیستمی بەرگری لەشەوە دروست دەکرێت دژ بە لەش و کار لە فەرمانی پەنکریاس دەکات و بڕی بەرهەمهێنانی ئینسۆلین (Insulin) کەم دەکاتەوە و دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی یەکێک لە باووترین نەخۆشیەکانی جیهان ئەویش نەخۆشی شەکرەیە.

**نەخۆشی شەکرە (Diabetes):**

نەخۆشی شەکرە یەکێکە لە باووترین نەخۆشیەکانی جیهان کە ملیۆنان کەس بەدەستیەوە دەناڵێنن، بەگشتی نەخۆشی شەکرە دابەش دەکرێت بەسەر دوو جۆری سەرەکیدا:

شەکرەی جۆری یەک (Type 1 Diabetes).

شەکرەی جۆری دوو (Type 2 Diabetes).

**ئەم پشکنینە بۆچی ئەنجام دەدرێت؟**

کاتێک کەسێک تووشی نەخۆشی شەکرە دەبێت، پێوستە دەستنیشانی جۆری شەکرەکەی بکرێت (ئایا شەکرەی جۆری ١) یان (شەکرەی جۆری ٢)، بۆ دەستنیشانکردنی جۆری شەکرە پێویستە پشکنینی ئەو دژەتەنانە ئەنجام بدرێت کە دژ بە خانەکانی پەنکریاس کاردەکەن. یان بۆ ئەو کەسانەی کە ڕێژەی شەکرەیان لە ڕێگەی دەرمان و پارێزی خۆراکیەوە بە ئاسانی کۆنترۆڵ ناکرێت پێویستە ئەم شیکارییە ئەنجام بدەن. سوودی لێ وەردەگیرێت بۆ دەستنیشانکردنی پێشووەختەی تووشبوون بە جۆری یەکەمی نەخۆشی شەکرە لەو کەسانەی کە ئەندامێکی پلەیەکی خێزانەکەی تووشی هەمان جۆر هاتووە.

**پەیوەندی نێوان (Islet cell antibody) و نەخۆشی شەکرە چیە:-**

دژەتەنەکە هێرش دەکاتە سەر خانەکانی پەنکریاس (Beta Cell) و تێکیان

دەشکێنێت بەمەش بڕی بەرهەم هێنانی هۆرمۆنی ئینسۆلین(Insulin) زۆر کەم دەبێتەوە و بەرەونەمان دەچێت.

ئینسۆلین (Insulin) هۆرمۆنێکە یارمەتی خانەکانی لەش دەدات بۆ بەکارهێنانی گلوکۆز (Glucose) وەک سەرچاوەی سەرەکی وزە، کاتێک بڕی ئینسۆلین کەم بەرهەم بهێندرێت لەلایەن پەنکریاسەوە شەکر لە خوێندا کەڵکە دەبێت (Hypergly-cemia) لەلایەن خانەکانەوە بەکار ناهێنریت و دەبێتە هۆی نەخۆشی شەکرە کە ئەمەیان بە جۆری یەکەمی شەکرە ناسراوە.

زیاتر لە ٩٥٪ ی ئەوکەسانەی کە جۆری یەکەمی شەکرەیان هەیە بەهۆی دژەتەنەکانەوە تووشبوون، چونکە لە جۆری دووەمی شەکرە بە دژەتەنەکان بەهیچ جۆرێک ڕۆڵ نابینن، هەربۆیە پشکنینی دژەتەنەکانی پەنکریاس گرنگترین پشکنینە بۆ جیاکردنەوەی هەردوو جۆری شەکرە و وەرگرتنی چارەسەری دروست.

مانای پشکنینەکە چی دەگەیەنێت؟

١- ئەگەر دژەتەنەکە (Islet cell antibody) بوونی هەبوو لەلەشدا مانای وایە جۆری یەکەمی شەکرەیە (Type 1 Diabetes).

٢- ئەگەر دژەتەنەکە (Islet cell antibody) نەبوو مانای وایە جۆری دووەمی شەکرەیە(Type 2 Diabetes).

٣- هەندێک جار لە جۆری یەکەمی شەکرەشدا دژەتەنەکە دەرناکەوێت، بەهۆی هەرهۆکارێکی ترەوە بێت پەنکریاس بڕی پێویست لە ئینسۆلین بەرهەم ناهێنێت بەڵام ئەمە حاڵەتێکی دەگمەنە.

ئەم پشکنینانەی پەیوەندیدارن:-

سەرەتا کاتێک کەسێک گومان دەکرێت تووشی نەخۆشی شەکرە بووبێت، پێویستە شیکاریەکانی (Blood Glucose)(%HbA1c) ئەنجام بدات، پاشان بۆ دیاریکردنی جۆری شەکرەکەی شیکاری دژەتەنەکانی وەک (Islet cell anti-body)ی بۆ ئەنجام دەدرێت..

# Gtt test
# Glucose Tolerance Test

ناسراوه به پشکنینی شەکرەی دووگیانی لە ڕنگەی خوێن پێوانە دەکرێ وەڵام دانەوەی لەش دەکات بۆ شەکرە (جلوگۆز) بەکاردێ بۆ زانینی پشکنینی شەکرەی جۆری دووەم و شەکرەی دووگیانی وە ئەو ئەو جۆرە بەرز دەبێت لە کاتی دووگیانی دا.

**چۆنیەتی کردنی ئەم پشکنینە**

نەخۆشەکە نابێ ١٢ سەعات نانی خواردبێ ئەو کات خوێنی لێ وەردەگیرێ پاشان ٧٥ملگرام گلوکۆز پاودێر دەکرێتە ناو بەرداخێک کە لیتر ئاوی تیابێت، بەڵام پێش ئەوەی گلوکۆزەکە بکەینە ناو ئاوە یەک لیترەکە ئەبێ سەرەتا چارەگێکی لێ فرێ بدەین پاشان گلوکۆزەکە تیابکەین ئەوکات نەخۆشەکە لەماوەی ٥ تا ١٠ خولەک دەبێ هەموو ئاوەکە بخوات پاشان سەعات دەگرینەوە سەعاتی یەکەم خوێنی لێ وەردەگرین پاشان سەعاتی دووەم خوێنی لێ وەردەگرین پاشان سەعاتی سێ یەم خوێنی لێ وەردەگرین بەم شێوەیە پاشان سەیری ئەنجامەکان دەکەین بۆ زانینی توشبوو بە شە کرە.

**تێبینی:** پێویستە لە هەفتەی ٢٤-٢٨ی دووگیانی پشکنینی شەکرەی بکەنە هەموو ئافرەتێکی دووگیان لەوانەیە دکتۆر زووتر داوابکات ئەگەری هەیە بۆ توش بون بە نەخۆشی شەکرە.

١-توشبون بە شەکرەی دووگیان بەهۆی زووی دووگیان بون
٢-بونی شەکرەی بۆ ماوەی لە خێزان
٣-قەلەوی
٤-بونی حاڵەتیک کە پەیوەندی هەبێ بە شەکرە

# C-Peptide Test

وا دادەنرێت هۆرمۆنی ئەنسۆلین هۆرمۆنێکی پرۆتینیە دەردەدرێت بە یارمەتی خانەکانی بیتا لە دورگەکانی لانگرهانس لە پەنکریاسە ئەو بەرپرسە لە ماندووبوون و کەمبوونەوەی ئاستی گلوکۆز لە خوێن لەبەر ئەوە ئاستی دیاری دەکرێ بە پێی ئەنسولین.

کاری دەردانی هۆرمۆنی ئەنسۆلین پشت دەبەستی لەسەر ئاستی گلوکۆز لە خوێن ئەگەر ئاستی گلوکۆز زیادبوو ئەوا دەردانی ئەو هۆرمۆنە زیاد دەبێ وە وەڵام دانەوەی خانەکانی پەنکریاس پشت دەبەستی بە ئایۆناتی (Ca++) بەوە هاتنە ژورەوە بۆ پەنکریاس وە کاتی ئەو پشکنینە دەکرێ دەبێ نە خۆش ٨-١٠ سەعات نانی نەخواردبێ.

**ئەو پشکنینە بۆچی بەکاردێت**

١- بۆ دیاری کردنی جۆری شەکرەکە

٢- بۆ زانینی وە بەرهێنانی ئەنسولین لەلایەن پەنکریاس

٣- ئایا ئەو ئەنسۆلینەی بەرهەم دیت کاریگەری هەیە یان نا

**تێبینی:** ئەو منداڵانەی شەکرمیان زۆرە ئەوا خانەکانی بیتا تێکشکایە وا چونکە بە هۆی ئەم تێکشکانەوە دەردەدرێ.




**هۆکاری بەرز بونی ئاستی ئەنسولین**

١- لە حاڵەتی ئەنسولینوما

٢- نە خۆشی کوشج

٣- تەحامل نەکردنی شەکرەی فرە کتۆزد گلاکتدز

٤-لە حاڵەتی قەڵەوی هەندێ جار

**ئەنسولین زیاتر کارە کاتە سەر ئەو خانانەی زیاتر**

١- خانەی جەرگ

٢- خانەکانی ماسولکە

٣- خانە چەوریەکان

# Blood urea test

پشکنینی یوریا لە خوێن دا بۆ کۆمەڵێک مەبەست دەکرێت وەکو کێشەکانی گورچیلە و کۆئەندامی میز و میزەڕۆ، بۆ چاودێری کردنی کاری گورچیلە دەکرێت، یان ئەوانەی غەسلی گورچیلەیان بۆ دەکرێت، ئەم پشکنینە بە زۆری لەگەڵ پشکنینی کریاتینین لە خوێن دا پێشنیار دەکرێت لەلایەن پزیشکەوە......

بۆ ئەم پشکنینە پێویستە تیوبی سەر سوور یان زەرد بەکاربهێنرێت، یان بەڕێگای میز ئەم پشکنینە دەکرێت لە میزێکی کۆکراوە لە ٢٤ کاتژمێر تێپەر نەبوبێت......

**ڕێژەی یوریا لەم حاڵەتانەی خوارەوە بەرز دەبێتەوە:**

١- سستی و شکستی گورچیلە.

٢- کێشە لە کۆئەندامی میزەڕۆدا.

٣- گیرانی کۆئەندامی میز.

٤- بەکارهێنانی هەندێک دەرمان وەکو ئەمینۆگلایکۆسایدەکان....

**لەم حاڵەتانە نزم دەبێتەوە:**

١-شکستی جگەر.

٢- وشکبوونەوەی زۆر.

٣- هێنانی پرۆتینی ناتەواو.

٤- کێشەی دووگیانی.

Normal ranges: 7-45 mg/dl



# Creatinine Test

پشكنینی كریاتینین بریتییە لە شیكاری كردنی بڕی كریاتینین لە (خوێن و میز)دا ،كریاتینین پێكهاتەیەكی كیمیاییە لە ئەنجامی تێكشكانی كریاتینین بۆ دەستكەوتنی وزە لەلایەن ماسولكەكانەوە بەرهەم دێت ،لەش بڕی زۆری كریاتینین لە لایەن جگەرەوە بەرهەم دێنێت و بڕێكی كەمی كریاتینین لەڕێگەی خواردنەوە وەردەگیرێت وەك (گۆشت) و لە ماسولكەكاندا هەڵدەگیرێت. هەردوو (Creatine) (Creatinine) لە لەشدا بە بڕێكی جێگیر هەن (لە كەسێك بۆ كەسێكی تر بڕەكەی جیاوازە و بەستراوە بە قەبارەی لەش و بڕی ماسولكەكانەوە)، گورچیلە ڕێژەی كریاتینین لە لەشدا ڕێكدەخات وكریاتینینی بەرهەمهاتوو لەلایەن ماسولكەكانەوە فڕێ دەداتە دەرەوەی لەش (بۆ ناو میز). هەربۆیە بوونی بڕێكی ئاسایی كریاتینین لە خوێندا ئاماژەیەكی باشە بۆ تەندروستی گورچیلەكان. ئەگەر گورچیلە بە باشی كار نەكات ئەوا بڕی كریاتینین لە خوێندا زیاد دەكات

**ڕێژەی ئاسایی پشكنینەكە.**

ڕێژەی كریاتینین بە گشتی لە پیاواندا زیاترە بە بەراورد بە ئافرەت و منداڵ بەهۆی (قەبارەی لەش و بڕی ماسوولكەوە)

پیاو (0.6to1.2 mg/dL)

ئافرەت (0.5to1.0 mg/dL)

منداڵ (0.5to1.0 mg/dL)

لەوكەسانەی یەك گورچیلەیان هەیە یان یاری ئاسن ئەنجام دەدەن و پرۆتین و مادەی وزە بەخش بەكار دێنن دەكرێت ڕێژەی (Creatinine) تا (1.6mg/dL) ئاسایی بێت.

بەڵام ئاسایی نییە ئەگەر كەسێك بڕی كریاتینین بۆ نمونە (0.6mg/dL) بێت و پاش ماوەیەكی كەم بەرز بێتەوە بۆ (1.0mg/dL)، هەرچەندە هەردوو

ڕێژەکە ڕێژەی ئاسایی تێنەپەڕاندووە بەڵام بەرز بوونەوەکەی نائاساییە.
**ماددەی کریاتین:** پێکهاتەیەکی کیمیاییە بەشداری دەکات لە چالاکی لەکاتی گرژبووندا (بۆ دەست کەوتنی وزە)، ڕۆژانە نزیکەی ٢٪ ی کریاتین ی لەش دەگۆڕدرێت بۆ کریاتینین لە ئەنجامی کار و چالاکی ماسوولکەکان و بڕی کریاتینینی بەرهەم هاتوو لەلایەن گورچیلەوە فڕێ دەردێتە دەرەوەی لەش (گورچیلە بڕی کریاتینین لە خوێندا بە جێگیری ڕادەگرێت)، لەبەر ئەوەی بڕی ماسوولکەکان جێگیرە (لەکەسێکی ئاساییدا) هەربۆیە بڕی کریاتینین پێویستە بە جێگیری بمێنێتەوە.

**کەی پشکنینی Creatinine ئەنجام دەدرێت؟**
پشکنینی کریاتینین پشکنینەکی گرنگە و بە گشتی هەموو کەسێک پێویستە شەش مانگ جارێک ئەم پشکنینە ئەنجام بدات تا لە تەندروستی گورچیلەکانی ئاگاداربێت. بەگشتی لەم بارودۆخانەدا پێویستە ئەنجام بدرێت:
١- کاتێک کەسێک نیشانەی نەخۆشیەکانی گورچیلەی تیادا دەردەکەوێت.
٢- لەو کەسانەی نەخۆشی گورچیلەیان هەیە یان گورچیلەیان بۆ چێندراوە پێویستە (مانگانە یان چەند مانگ جارێک) شیکاریەکە ئەنجام بدەن.
٣- لەکاتی بەکارهێنانی ئەو دەرمانانەی کە کاریگەری لاوەکیان هەیە لەسەر گورچیلە.
٤- لەکاتی هەبوونی ئەو نەخۆشیانەی کە کار لە فەرمانی گورچیلە دەکەن وەک (بەرزی فشاری خوێن، شەکرە).
٥- لە کاتی بەکار هێنانی کەپسولی پاڵپشتی و دەرمانە مێتابۆلیکیەکان وەک (دەرمانەکانی دابەزاندن و زیادکردنی کێش یان پرۆتین و ماددەی وزە بەخش لەلایەن ئەو کەسانەی یاری ئاسن دەکەن).
٦- لەو کەسانەی گرفتی گورچیلەیان هەیە و چارەسەری وەردەگرن بۆ چاودێری کردنی کاریگەری چارەسەریەکە.

٧- لەکاتی ئەنجامدانی شیکاری تیشکی کە بە (ملەومن ناسراوە) و (CT scan) کە پێویستی بە پیدانی جۆرە دەرمانێکە کە کاریگەری لاوەکی لەسەر گورچیلە دەبێت.

## نیشانەکانی نەخۆشیەکانی گورچیلە

١- گۆڕانی ڕەنگی میز (قاوەیی بوون یان شیری بوون) ڕەنگەکەی و کەفکردن و بوونی خوێن لە میزدا.
٢- کەمبوونەوەی بڕی میزکردن لە بڕی ئاسایی.
٣- ماندوێتی، گرفتی لەکاتی خەوتندا.
٤- ئاوسانی لەش بە تایبەتی (دەموچاو، ژێر چاو، پاژنەو پێیەکان، دەست و مەچەک).
٥- گرفت لەکاتی میزکردن (سوتانەوە، هەستکردن بە خاڵی نەبوونەوەی میزەڵدان).
٦- ئازاری بەشی خوارەوەی پشت خوار دواین پەراسوو.

## مانایی پشکنینەکە چی دەگەیێنێت؟

بەرزی ئەنجامی پشکنینە (مانایی وایە گورچیلە بە باشی کاری فرێدانەدەرەوەی (Creatinine) ئەنجام نادات).
١- لەکاتی بوونی گرفت لە گورچیلەکاندا و تێکچوونی فەرمانی گورچیلە: (ئاوسانی خوێنبەرەکانی گورچیلە (Glomerulonephritis)، هەوکردنی گورچیلە (Pyelonephritis)، مردنی خانەکانی گورچیلە بەهۆی ژەهراوی بوون یان دەرمانەوە (Tubular Necrosis).
٢- لەکاتی گەورەبوونی پرۆستات یان بوونی بەردی گورچیلە ( دەبێتە هۆی گیرانی ڕێڕەی میز و گرفت بۆ کاری گورچیلە دروست دەکات.
٣- کەمبوونەوەی بڕی خوێنی گەیشتوو بە گورچیلە بەهۆی (وشکبوونەوە،

نەخۆشـی دڵ، (Atherosclerosis)، شـەکرە.

٤- سـوتانی بڕێکـی زۆری (Creatine) لەلایـەن ماسـولکەکانەوە یـان خواردنـی خۆراکـی دەوڵەمەنـد بـە پرۆتیـن.

## نزمی ئەنجامی پشکنینە:-

کەمبوونـی بـڕی (Creatinine) تاڕادەیـەک دەگمەنـە و لەکاتـی نەخۆشـی و لاوازبوون و پوکانەوەی ماسوولکەکاندا وەک (Myasthenia Gravis Or Muscular Dystrophy) بڕی (Creatinine) کـەم دەبێتـەوە، یان کەمی بڕی پرۆتیـن لـە ژەمەخۆراکـی ڕۆژانـەدا، هەندێـک جـار بەهـۆی نەخۆشـیەکانی جگـەرەوە بڕی بەرهـەم هێنانـی (Creatine) لەلایـەن جگـەرەوە کـەم دەبێت، هەندێـک جار لەکاتی سکپڕیدا بڕی (Creatinine) کـەم دەبێتـەوە و دوای منداڵبوون ئاسایی دەبێتـەوە.

پشکنینە پەیوەندارەکان:

Creatinine Clearance , Blood Urea , Urine Albumin/Creatinine Ratio , (ACR) ,Urine Protein/Creatinine Ratio (UP/CR) , Urine Albumin .Urine Protein , Total Serum Protein , Serum Albumin



# Cross match Test

ئەم پشکنینەیە دەکرێت بۆ گواستنەوەی گورچیلەی کەسێک لەش ساغ بۆ کەسێکی کە گورچیلەیەکی وەستاو بێت یان هەردوو گورچیلەی خەریک بێت لە دەست بدات .ئەم پشکنینە دەکرێت لە سەر packed cells,RBCs سەرەتا چۆنیەتی کردنی ئەم پشکنینە بە رێکەوتن لە نێوان نەخۆشەکەو ئەو کەسەی کە گورچیلەکە دەبەخشی واتا بەخشەر
چۆنیەتی کردنی ئەم پشکنینە بۆ ئەوەی بزانری دژە تەنەکە لە نەخۆشەکە نیە. کاتیک نمونەکە وەردەگرین کە دەبێتە هۆی کارلێکی ترسناک کە لەشی نەخۆشەکە بە تەنی بێگانە دایدەنیت ئەگەر کارلێک بکات واتا متابەقە نەبیَ کە ئەمەش وادەکات رفزی ئەو خوێنە بدات یان ئەو بەشە بکات.

## چۆنیەتی کردنی بە دوو رێگا دەبێت

تیوبێکی بەتاڵ دێنین دوو دڵۆپ لە سیرەمی نەخۆش دوو دڵۆپ لە خوێنی بەخشەر تێدەکرێتە ناو تیوبە بەتاڵەکە پاشان دوو دڵۆپ لە بۆڤین ئەلبومین تێدەکەین ،
-ئەگەر تۆپەڵ بون دروست بوو لە ژێر مایکرۆسکۆپ دەلالەت لە نەگونجانی گورچیلەی هەردووکیان دەکات
-ئەگەر تۆپەڵ بون دروست نەبوو لە ژێر مایکرۆسکۆپ دەلالەت لە گونجانی گورچیلەی بەخشەر دەکات بۆ نەخۆشەکە.
-لە حاڵەتی گونجاندن compatible (fit) لە دوای washing دژە تەنەکان لادەچن پاشان Human globulin کە فەرمانی گەران بەدوای دژە تەنە لە کەسی وەرگر ئەویش بەهۆی سەیرکردنی لە ژێر مایکرۆسکۆپ
لە حاڵەتی نەگونجان in compatible دەبێتە هۆی یەکگرتنی دژە تەنی وەرگر

تەنی بێگانەی بەخشەر پاشان لەدوای washing دژە تەنەکان نارۆن لەبەر ئەوەی نوساوە بە تەنە بێگانەکان وە پاش زیادکردنی AHG دژە تەنەکان بە تەنەبێگانەکان دەبەستێتەوە تاوەکو جوانتر دەربکەوێ لە ژێر مایکرۆسکۆپ و ئەنجامەکەی تۆپڵە روودەدات.

Blood group: جۆری خوینە لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤیکی تر جیاوازە کە پێک دێت لە چوار جۆر هەرکۆمەڵێک جیاوازە لەوەی تر بەهۆی بوونی مەوادی دیاری کراو لەسەر (o-ob-a-b).

خرۆکە سورەکان وە ئەگەر دووکۆمەڵەی جیاواز یەکیان گرت ئەوا ئەنجامی ترسناک دەبێت بۆ دووربون لەم ئەنجامە ترسناکە پێویستە جۆری بەخشەر لەگەڵ وەرگر یەکسان بێت یان گونجاو بێت .

## کاری شوشتن بە مەحلولی بە سودە بۆ؟

١- بۆ لابردنی هیمۆلایسیس بۆ ئەوەی دژە تەنەکان بە جوانی دەربکەوێت نەک مەینی خرۆکە سورەکان وەک anti-Lc –anti- leb .

٢- لابردنی سیرەمی بەخشەر کە مادەی lewis substance کە نزیکەی ٩٠٪ بەخشەرەکان هەیانە کە کارلێک دەکات لەگەڵ دژە تەنەکان کە هەیە لەگەڵ خوینی نەخۆش کە ئەنجامەکە راست دەرناچێ.

**تێبینی:**

کە ئیشەکانمان تەواو کرد پشکنینەکە لە ژێر مایکرۆسکۆپی خوێندەوە ئەگەر ئەنجامەکە نەرێنی بوو ئەوا combs chech cell بۆ زیاد دەکەین کە ئەویش دەلالەت لە خانەی(o)ی Sensitized دەکات لە دژەتەنەکان پێویستە ئەنجامەکە ئەرێنی دەرچی ئەگەر دەرچوو ئەوا ئەوە دەگەیەنێ کە AHG بە تەواوی زیاد کرایە و رێگای ئیشکردنەکە بەراستی کرایە، بەڵام ئەگەر combs chech cell بۆ زیادکرا ئەنجامەکە هەر نەرێنی دەرچوو ئەوا واتە ئەم پشکنینەکە بە ناتەواوی کرایە بۆیە دەبێ دووبارە بکرێتەوە.

## هەڵەکردنی ئەم پشکنینە

١- کاری شوشتنی لە کۆتایی ڕنگەکانی دا بە جوانی نەکراوە وە پاشماوەی سیرەمەکە ئیشی AHG یەکەی پوچەڵ کراوە.

٢- مەحلولی AHG هەر بۆ زیادنەکراوە ئەسلەن.

٣- مەحلولی AHG ئیش ناکات.

بۆچی لە کاتی نەشتەرگەری خوێن و پلازماو پەرەکانی خوێن بە تەنیا دەگوازرێتەوە بۆ نەخۆشەکە لەرێگەی بانکی خوێن بۆی ئامادە دەکرێ کە تێدا خوێنیش هەمووی تیایە؟

١- گواستنەوەی خرۆکە سوری سەرەکی: ئەمە لەکاتی نزمبونی ئاستی هیمۆگلۆبین و بونی نەزیفیەکی زۆر لەکاتی گواستنەوەی گورچیلە لە حاڵەتی ئەنیمیای بەرز بە تایبەتی ئەنیمیای منجلی و تالاسیمیا.

٢- گواستنەوەی پلازمای نوێی بەستوو:ئەو نەخۆشانەی کە الامینوجلوبین کەمە وە لە کاتی نەزیفبونەکی زۆر بۆ یارمەتی دانی بەرگری و خوێن مەین شۆکی ناوەندی و نەشتەرگەری لەناوچوی شانەی تێدایە بۆیە پیویستە ئەمەی تێبکرێ نەخۆشەکە.

٣- گواستنەوەی پەرەکانی خوێن: وەردەگیری کاتی پەرەکانی خوێن زۆر کەم بێت بەتایبەت ئەگەر خوێن بەربونێکی زۆری لەگەڵ بێت .

| Recipient | Blood donor | | | |
|---|---|---|---|---|
| | O | A | B | AB |
| O | ✓ | X | X | X |
| A | ✓ | ✓ | X | X |
| B | ✓ | X | ✓ | X |
| AB | ✓ | ✓ | ✓ | ✓ |

# Uric Acid Test

پشکنینی Uric Acid سودی لێ وەردەگیرێ بۆ دیاری کردنی ڕێژەی Uric Acid لە خوێن و میز دا، مادەیەکی کیمیاییە لە ئەنجامی تێکشکانی پیورین بەرهەم دێت کە تێدا پیورین نایترۆجین لە پێکهاتنیدا هەیە و بەشداری دەکات لە خانەکانی لەش و بۆماوە مادەدا(DNA)، کاتێک خانەکان دەمرن شیدەکرێنەوە پیورین دەچێتە ناو خوێنەوە یان لە ڕێگای خواردنەوە وەردەگیرێ، بەشێکی زۆری Uric acid لەلایەن گورچیلەوە فڕێ دەدرێتە دەرەوە، ئەگەر بڕێکی زۆری لە Uric Acid بەرهەم بێت یان لە ڕێگەی میزەوە فڕێنەدرێتە دەرەوە ئەوا لە لەش دا کۆدەبێتەوە (Hyperuricemia).
زیاد لە رادەبەدەری Uric Acid دەبێتە هۆی چەندان گرفتی تەندروستی وەکو نەخۆشی پاشای، زیاد بونی ڕێژەی Uric Acid و بەردەوام پاڵاوتنی و فرێدانە دەرەوەی لە ڕێگەی میزەوە گورچیلە ماندوو دەکات وە یەکێکیشە لە هۆکارەکانی دروستبونی بەردی گورچیلە.

**نەخۆشی پاشا یان داء الملوک یان gout چیە:-**
نەخۆشی پاشا یەکێکە لە نەخۆشیە باوەکان کە بەهۆی زیاد بونی لە رادە بەدەری Uric Acid و کۆبونەوەی لە لەشدا سەرهەلدەدا ،کە دەبێتە هۆی ئازارو هەوکردنی جومگەکان (بەتایبەت پەنجەکانی دەست و قاچ) و ناوسان و سووربونەوە و لەکارکەوتنیان بەجۆرێک گرفت لە جولەی جومگەکان دروست دەکات،کە ئەمەش بەهۆی دروست بوونی پێکهاتەی کریستاڵی لەو شلەیەی کە لە نێو جومگاکان دا هەیە یان نیشتنی لە گورچیلەدا دروست کردنی بەردی گورچیلەیە، بەڵام دەستنیشانکردنی نەخۆشی پاشا تەنها بە شیکاری Uric Acid نییە و رەنگە پێویست بە شیکاری کردنی شلەی ناو جومگەکانیش بکات (Synovial fluid) .

**کەی و بۆچی پشکنینی Uric Acid ئەنجام دەدرێ:-**

١- لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشی پاشای.

٢- بۆ چاودێر کردنی ڕێژەی Uric Acid لەو کەسانەی کە توشی شێرپەنجە بوون و چارەسەری کیمیایی یان تیشکی وەردەگرن .

٣- بۆ دەستنیشانکردنی هۆکاری دروست بوونەوەی بەردی گورچیلە.

٤-چاودێری کردنی کاری گورچیلە.

**ئەو هۆکارانەی کاردەکەنە سەر ئەنجامی پشکنینی Uric Acid:-**

١-زۆرخواردنی جگەر و گۆشت

٢-خواردنی ماسی دەریای

٣-پاقلەمەنی وشک کراوەکان

٤-خواردنەوەی کحولیەکان بەتایبەت بیرە

٥-دابەزاندنی کێش

٦-وەرزشی توند و هیلاکی زۆر

**مانای ئەم پشکنینە چی دەگەیەنێ**

بەگشتی ڕێژەی ئەم پشکنینە لەم بارانەوە بەرز دەبێت

١- نەخۆشی پاشای

٢- وەرگرتنی چارەسەری کیمیای

٣- بونی گرفت لە مۆخی ئێسک دا وەک شێرپەنجەی جۆری (Multiple myeloma)

٤- خواردنی خۆراکی دەوڵەمەند بە پیورین

## رێژەی ئەم پشکنینە کەم دەبێت لە نەخۆشیانەدا

١-نەخۆشی (Wilsons disease)

٢- نەخۆشی (fanconi syndrome) کە نەخۆشیەکی گورچیلەیە

٣-بونی نەخۆشی جگەرو گورچیلە

٤-کەمی پیورین لە ژەمە خۆراکی رۆژانەدا

٥-لەکاتی ژەهراوی بوندا



# Cholestrol Test
# HDL LDL Test

کۆلیسترۆل ماددەیەکی شێوە مۆمییە لە خوێندا، لەشمان بەکاری دێنێت بۆ بنیادنانی خانەکان و هۆرمۆن و ڤیتامین D، جگەر هەموو کۆلیسترۆل بنیاد دەنێت کە پێویستە لە ڕێگەی خۆراکەوە، کۆلیسترۆل لە خوێندا ناتوێتەوە بەڵکو دەبەسترێ بە ماددەیەک پێی دەڵێن Lipoprotein بۆ گواستنەوەی بۆ خانەکان.

### جۆرەکانی کۆلیسترۆل چین:-

بەشێوەیەکی سەرەکی دوو جۆری سەرەکی لە کۆلیسترۆل هەیە کە دەبەسترێ بە جۆری جیاواز لە لیپۆپرۆتین.

جۆری یەکەمیان بریتیە لە Low density lipoprotein یان(LDL) کە ناسراوە بە کۆلیسترۆلی زیان بەخش، بەرزی لە ڕێژەی ئەم جۆرەیان مەترسیە بۆ توشبوون بە نەخۆشیەکانی دڵ، جۆری دووەمیان بریتیە لە High density lipoprotein یان (HDL) کە ناسراوە بە کۆلیسترۆلی سوود بەخش کە ئەمەش ئەرکێکی گرنگی هەیە لە پاراستن لە نەخۆشیەکانی دڵ، بەڵام ئەوەی گرنگە پێویستە ڕێژەیەکی تەندروست لە هەردوو جۆرەکە هەبێت.

### مەترسی بەرزی کۆلیسترۆڵ چیە:-

ئەگەر ڕێژەی کۆلیسترۆل زۆر بەرز بێت ئەوا لە ناو لولە خوێنەکاندا دەنیشێت و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە لولە خوێنەکە تەسک بکاتەوە ئەم حاڵەتەش پێی دەڵێن atherosclerosis، ئەمەش دەبێتە هۆی کەم ڕۆشتنی ئۆکسجین لە خوێنەوە بۆ ماسولکە خانەکانی دڵ، بەڵام ئەم حاڵەتەی کە باسمان کرد ئەگەر لە مێشکدا ڕوویدات ئەوا دەبێتە هۆی جەڵتەی مێشک stroke.

## کاتێک پێویستە ئەم پشکنینە ئەنجام بدرێ:-

هەموو کەسێک پێویستە ئەم پشکنینە ئەنجام بدات بە تایبەت لە تەمەنی ٢٠ ساڵی وە زیاتر، لەگەڵ ئەوەشدا رێژەی بەرزی مەترسیدار لە دواتردا روودەدات، لە پیاواندا پێویستە لە تەمەنی ٤٠ ساڵیەوە بە زیاتر چاودێری کۆلیسترۆل بکەن، رێژەی بەرزی کۆلیسترۆل لە پیاواندا زیاتر باوە بە بەراورد لەگەڵ ئافرەتاندا هەتا تەمەنی بێ ئومێدی، وەستانی سوری مانگانە لە ئافرەتدا، دوای ئەمە بەرزبوونەوە لە ئافرەتدا زیاترە لەبەر ئەم هۆکارە لە ئافرەتاندا پێویستە لە دەوروبەری تەمەنی ٥٥ ساڵیدا بە وردتر پشکنینی کۆلیسترۆل ئەنجام بدەن.

## ئەو هۆکارانەی کاردەکانە سەر کۆلیسترۆل:-

١-خواردن: ئەو خواردنانەی کە بەرهەم ئاژەڵن وەک هێلکە و گۆشت و پەنیرو....هتد

٢-کێشی لەش: جولە نەکردن و قەڵەوی وادەکات کۆلیسترۆلی خراپ زیاد بێت کۆلیسترۆلی باش کەم بێت.

## ئەو هۆکارانەی ناتوانری بە ئاسانی [illegible] بەسەر کۆلیسترۆل دابگرێ:

١-هۆکارە بۆ ماوەیەکان: بەرزبونی کۆلیسترۆل بەهۆی جینایەتی بۆماوەی کە لە باوانەوە دەگوازرێتەوە کە لەتەمەنی زووی منداڵی دا دروست دەبێت وە دەبێتە هۆی جەلتە لە تەمەنی زووی دا.

٢-تەمەن و جووت بوون پاش تەمەنی پێکگەشتن زیاد دەبێت بەڵام پاش تەمەنی ٥٠ ساڵیدا کۆلیسترۆلی خراپ لە ئافرەتدا بەرزتر دەبێت لە چاو پیاو.

## پێویسته چی بکەین بۆ کەم کردنەوەی مەترسییەکانی بەرزی ڕێژەی کۆلیسترۆل:-

ئەوەی کە پێویسته لەسەر ئێمە بۆ کەم کردنەوەی ئەم مەترسیانە جوڵە و وەرزشێکی تەندروستانەیە کە توێژەرانی ئەمریکی ئاماژە بەوە دەکەن کە وەرزشکردن بۆ ماوەی ٣٠ خولەک ڕۆژانە مەترسی بەرزی ڕێژەی کۆلیسترۆلی (LDL) کەمدەکاتەوە،هەروەها یارمەتیمان دەدات لە دابەزینی کێشمان، کە زیاد بوونی کێش هۆکارێکە بۆ بەرزی کۆلیسترۆلی زیان بەخش، هەروەها کەم خواردنی ئەو خواردەمیانەی کە چەوری تێریان تێدایە وەک گۆشتی سوور و هەندێ بەرهەمی شیرەمەنی وەک پەنیر و....هتد، پێویسته هەرکاتێک هەستمان بە مەترسیەکان کرد ئەوا سەرداتی پزیشک بکەین، بۆ وەرگرتنی چارسەر کە زۆر کات ستاتین دادەنێت بە مەبەستی کەم کردنەوەی ڕێژەی کۆلیسترۆل.



# Triglyceride Test

ئەم پشکنینەیە دەکرێ بۆ زانینی ڕێژەی چەوری ژێر پێست کە ئەمەش خراپە بۆ لەشمان، چونکە توانای ئەوەی هەیە لە بۆری خوێن جێگیر بێت ئەگەر بەرادەیەکی کەمیش چەوری بخۆیت ئەوا لەشمان توانای دروست کردنی زۆرە لە ڕێگای ئاڵوگۆرکردن لە شەکر، کاربۆهیدرات، مەشروب

چۆن بتوانین ئاستی ئەم جۆرە چەوریە خراپانە کەم بکەینەوە لە لەشدا:-

کەم کردنەوەی خواردنی ڕۆنە ئاژەڵیەکان، زیاتر بەکارهێنانی ڕۆنە ڕوەکیەکان، زۆر خواردنی سەوزەو میوە، پاشان بیرمان نەچیت کە وەرزش کردن زۆر پێویستە بۆ چەوری زیان بەخش.

**ئەو هۆکارانە چین کە دەبنە هۆی بەرزی ئەم پشکنینە:-**

١- قەڵەوی

٢- کۆنترۆڵ نەکردنی شەکرەی خوێن

٣- لیکە ڕژێنی دەرەقی

٤- نەخۆشی گورچیلەکان

٥- خواردنەوەی زیاد لە کحول




**خۆ پاراستن لەم نەخۆشیە:-**

١- کەم کردنەوەی کێش

٢- وەرزش کردن بە بەردەوامی

٣-دورکەوتنەوە لە خواردنی کحول و جگەرە کێشان

# Digoxn Test

سەرەتا دەرمانێکە بەکاردێ بۆ دیاری کردنی ئەو کەسانەی کە لێدانی دڵیان نارێکە.
هەروەها بەکاردێ بۆ دیاری کردنی ڕێژەی لە ناو خوێن Digoxn
Heart failure واتە دڵ هێواش دەبێ.
ئەگەر لێدانی دڵ هێواش بوو ئەوا نیشانەکانی، ئەوا خوێن کۆ دەبێتەوا لەو شوێنانە:
١- دەستەکان، ٢- پێەکان، ٣- جەرگ، ٤- سیەکان ، ٥- تەنگەنەفەس دەبێ
ئەو شوێنانە توشی ئەستور بون دەبێ.
لەوکاتەدا نەخۆش Digoxn دەخوات کە ئیشی گرژبونی و ماسولکەکانی دڵە وادەکات دڵ بە هێز بێت بەمەش ئەو نیشانانە نامێنێ.

**ئەگەر لێدانی دڵ خێرا بوو ئەوا نیشانەکانی:**

١- شلەژاوی، ٢- چاوی لێل دەبێ، ٣- رشانەوە ، ٤- سک چون، ٥- نارێکی دڵ، ٦- تەنگە نەفەسی

هەندێ گۆڕانکاری فیزێکی هەیە کە کاردەکاتە سەر digoxn لە ناو خوێن
١- گورچیلە ٢- غودە ٣- شێرپەنجە ٤- گەدە
ئەگەر digoxn خواردبوو نابێ ئەو پشکنینە بکات ٦-٨ سەعاتی بەسەر نەچێ.

**تێبینی:** کێ digoxn لە خوێن دەباتە دەرەوە
گورچیلە دەیباتە دەرەوە بۆیە لە هەمان کاتدا ئەگەر ناتەواوی لە دڵدا هەبوو ئەوا دەبێت پشکنینێکی تری بۆ بکەین ئەویش پۆتاسیومە بەمەش دەردەکوێ کە گورچیلە کێشەی هە یە یان نا.




Normal rang: 0.5—2.0

# GGT
# (Gamma glutamyl tran peptidase)

ئەو ئەنزیمەیە کە لە جەرگ وگورچیلە و پەنکریاس و سپلین دا هەیە ئەم پشکنینە بۆ زانینی چۆنیەتی ئیشکردنی ئەو ئەنزیمە دەکرێت.

**نیشانەکان:**

١- ماندووبوون و بێهێزی
٢- نەمانی ئارەزوی خواردن
٣- ئەستور بوونی سک
٤- ئازار لە سک
٥- میزی رەنگی تاریک دەبێت
٦- پیسای رەنگی رۆن دەبێت
٧- خورانی لەش

**نیشانەکانی لە کاتی بەرزبونەوە**

١- کاتی زیانی گەورە بەر جەرگ و زەردوی بکەوێ.
٢- لەکاتی بەرزبونی هەریەکە لە ئەنزیمەکانی جەرگ ئەم پشکنینە بەشێوەیەکی زۆر بەرز دەبێت.
٣- خواردنی کحول کە زیانێکی زۆری لە جەرگ دەدات ئەمەش دەبێتە هۆی بەرز بونی ئەم پشکنینە.
٤- ئەگەر ئەلکەلاین و ئەو پشکنینە بەرز بوو ئەوا واتا جەرگ زیانێکی زۆری بەرکەوتوە.
٥- ئەگەر ئەلکەلاین بەرز بوو ئەوا ئەنجامەکە نزم بوو ئەوا واتا زیان بە جەرگ نەکەوتوە زیان بە ئێسک کەوتوە.

**ئەنجامی ئەم پشکنینە واتای چی دەگەیەنێ:-**

١- واتا هیچ نەخۆشیەکی جەرگی نیە

**تێبینی:** خواردنەوەی رێژەیەکی کەم لە کحول وادەکات ئەم پشکنینە بەرز بێت بۆیە نەخۆش نابێ لە کاتەنە ئەم پشکنینە بکات.

**ئەو دەرمانانە وا دەکەن بەرز بێت**

١-ڤینیتۆین ٢ -کاربامازیبین ٣-الباربیتورات ٤-المینوبابیتال





# Amylase test

بە شێوەیەکی سەرەکی لە پەنکریاس دەردەدرێ دەچێتە ناو کۆئەندامی هەرس کە نیشاستە تێک دەشکێنێ لەلایەن ئەو ئەنزیمە ئەو ئەنزیمە بڕێکی کەم لە خوێن دا هەیە، بەڵام زیاد دەکات لە کاتی کە خانەی پەنکریاس بریندار بێت بە هۆی بوونی بەردی زراو یان گیرانی بۆری پەنکریاس یان بەهۆی بوونی شێرپەنجە ئەو ئەنزیمە ڕێگای خۆی دەدۆزێتەوە دەچێتە ناو خوێن، لە ڕێگای ئەم پشکنینەوە پێوانەی بڕی Amylase دەکرێت لە خوێن یان لە میزدا.

Amylase: بریتییە لە ئەنزیمێک یان پرۆتینێکی تایبەتە یارمەتی هەرسکردنی خۆراک دەدات، زۆربەی زۆری Amylase دروست دەبێت لە پەنکریاس و لیکە ڕژێنەکاندا، بەشێوەیەکی ئاسایی بڕێکی کەم لەم ئەنزیمە لە خوێن و میزدا هەیە، بەڵام ئەگەر ڕێژەکەی زیاتر بێت یان کەمتربێت لەڕێژەی ئاسایی خۆی ئەوا دەرخەری نەخۆشیە لە پەنکریاسدا یان هەوکردن یان بەکارهێنانی زۆری ئەلکهول و چەندین حاڵەتی دیکە normal range:up to 65 IU/L

**لە چ کاتێ ئەم پشکنینە دەکرێ:**

١- ئازاری توندی سک

٢- تایەکی زۆر

٣- لە دەستدانی ئارەزوی خواردن

٤- سەرسوڕان

**ئامانجی ئەم پشکنینە چیە:**

کاتێ کە پەنکریاس ئلتهاباتی کردیە ئە وا ئەو ئەنزیمە زۆر زیاد دەکات کە تێدا ٥-١٠ جار لە ئاستی ژمارەی پێوانەی خۆی زیاترە، لەڕێگەی پشکنینی خوێنی Amylase دەتوانین پشکنین و چاودێری بوونی هەر ناتەواویەک بکەین کە لە پەنکریاسدا هەبێت بۆ نمونە هەوکردنی پەنکریاس، هەروەها ئەم پشکنینە بە ڕێگای پشکنینی میزیش ئەنجامدەدرێت، جا بەتەنها بێت یان لەدوای پشکنینی خوێن،

ئەم ڕێگایەش بەهەمان شێوە بۆ دەستنیشانکردن و دیاریکردنی تێکچونەکانی پەنکریاسە، هەروەها بۆ دیاریکردنی هەر تێکچون و ناتەواویەک کە لە لیکە ڕژێنەکاندا هەبێ، هەر یەکێک لەم دوو پشکنینە دەتوانرێت وەک ڕێگایەکی چاودێری کردن بەکاربهێنرێت بۆ ڕێژەی Amylase لە لەشی کەسێکدا کە چارەسەری نەخۆشییەکانی پەنکریاس یان هەر تێکچونێکی دیکەی پەیوەندیدار بەم ئەنزیمە بەکاربهێنێت زۆرجار پزیشک لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی نەخۆشی پەنکریاس ئەم پشکنینە دەکرێت.

**لەوانەیە کەسەکە تووشی یەکێک لەم نەخۆشانە بیێت:-**

١- شێرپەنجەی پەنکریاس

٢- نەخۆشی زراو

٣- تێک چونی کۆئەندامی هەرس

٤- دەرمەی ڕەحم ٥-گوێ ڕەپە (ملە خرێ)

**تێبینی/** ئەگەر پزیشک گومانی ئەوەی کرد کە هەوکردن و ئیلتهاباتی پەنکریاس بوونی هەیە ئەوا باشترە کە لەگەڵیدا پشکنینی خوێنی Lipase ئەنجام بدرێت (Lipase Blood Test)، چونکە Lipase ئەنزیمێکی دیکەیە کە پەنکریاس دروستی دەکات، وە بۆ دیاریکردنی حاڵەتی هەوکردنی پەنکریاس ئەم پشکنینی زیاتر وردتر و دەقیقترە بەتایبەت بۆ حاڵەتی هەوکردنی پەنکریاس کە هۆکارەکەی خراپ بەکارهێنانی ئەلکهول بێت.




بەرز بونی Amylase دەبێتە هۆی بەرزبونی lipase

**تێبینی/** ئەگەر نەخۆشەکە ئسپرینی خواردبو نابێ ئەو پشکنینیەی بۆ بکەی.

# Lipase test

ئەنزیمێکە بە شێوەیەکی سەرەکی لە پەنکریاس دەردەدرێ لە کۆئەندامی هەرس فەرمانی شیکردنەوەی چەوریە بە شێوەیەکی سەرەکی هەمان نیشانەکانی amylase هەیە.

normal range:up to 65 IU/L



# Micro albumin test

ئەگەر دکتۆر شک بکات کە نەخۆشەکە توشی لە ناوچونی گورچیلە یان نەخۆشی گورچیلە بووە ئەوا داوا لە نەخۆش دەکات ئەو پشکنینەی بۆ بکات بەرێگای پشکنینی میز دەکرێت کە ئاستی ئەلبومین دیاری دەکات ئەلبۆمین ئەو پرۆتینەیە کە لەش بەکاری دێنێت بۆ گەشەکردنی خانەکان و یارمەتیدەرە بۆ چاکردنەوەی خانەکان عادەتەن لە ناو خوێن دا هەیە بوونی لە میز بە رێژەیەکی دیاری کراو بەرزتر دەبێت کە دەلالەت لە بوونی نەخۆشی گورچیلە یان لە ناوچونی گورچیلە دەکات گورچیلەکان بەرپرسن لە فرێدانی و خاوین کردنەوەی خوێن و رێککردنی ئاستی شلە لە لەش و بۆ ئەو کارە مەواد غەزائی (خۆراک)و پرۆتینات گرنگە وەک ئەلبومین گرنگە بۆ زانینی گورچیلە بە شێوەیەکی رێک ئیش دەکات کە وابکات ئەلبومین لە خوین بمێنێتەوە ئەگەر گورچیلە زیانی بەرکەوی ئەوا ناتوانی ئەلبۆمین لە خوین بهێڵیتەوە فرێی دەداتە ناو میز بەمەش دەزانین کە گورجیلە زیانی پێکەوتوە.



# Insulin resistance Test

بەرگری ئەنسولین: بریتیە لە توانای نزم بوونەوە بۆ وەڵام دانەوەی لە ئەنسولین بەتایبەت لەلایەن شانەی ماسولکە و چەوری ئەنسولین ئەو هۆرمۆنەیە دەردەدرێ لەلایەن خانەی B لە پەنکریاس عادەتەن کەمێک دەردەرێت پاش نان خواردن بۆ یارمەتیدانی گواستنەوەی گلوکۆز،بۆ خانەکانی لەش کە پێویستی بە بوونی گلوکۆزە بۆ دروست کردنی وزە و هەروەها خانەکان پێویستیان بە گلوکۆزە بۆ مانەوە لە ژیان، خانەکان خەزنی دەکەن وەک چەوری خەزنکراو لە لەش.

واتە گلوکۆز لەوانەیە سوکەری مانگانەکەی زۆربێت لە خوێن دا لەوانەیە ببێتە هۆی بەرزی ئاستی شەکر لە خوێن،کاتێک لەش بەرگری دەبێت لە دژی ئەنسولین ئەوا وادەکات کە زیاتر تەحاملی لەگەڵ ئەنسولین بکات.

**تێبینی:** ئەنسولین گلوکۆز هەڵدەگری دەیباتە ناو خانەکان، بەڵام ئەگەر بەرگری دژی ئەنسولین دروست بێت ئەوا ناتوانی گلوکۆز بگوازێتەوە بەمەش نەخۆش شەکرەی بەرز دەبێتەوە.

**نیشانەکانی بەرگری ئەنسولین**

لە سەرەتا هیچ نیشانەیەکی نابێت،کاتێک نیشانەکانی دیار دەدات کە دەگاتە ئاستی ناوەندی وەک بەرز بونەوەی ئاستی شەکرە لە خوێن کاتێک ئەمە روودەدات نیشانەکانی.

١-تەمبەڵی و ماندووی ٢-برسیەتی ٣-گرانی لە تەرکیز کردن

نیشانەکانی تر لە زۆربەی کاتەکان کە دەناڵێنن بە دەست بەرگری ئەنسۆلین

١- قەڵەوی لە کەمەر

٢- پەستانی خوێنی بەرز

٣- ئاستی کۆلیسرۆلی بەرز

ئەگەر بەرگری ئەنسولین پێشکەوت بۆ نەخۆشی شەکرە لە جۆری دوو ئەوا نیشانەکان دەبێتە بەرزی شەکرە لە خوێن.

**هۆکاری بەرگری ئەنسولین**

ئایا دەتوانین بەرگری ئەنسولین کەم بکرێتەوە

بە دڵنیاییەوە دەتوانرێ پاشەماوەی بەرگری ئەنسولین کەم بکرێتەوە بە چەند رێگایەک:

١- کەم خواردنی کاربۆهیدرات و دروستبونی کیتۆن لە خواردن

٢- کەمکردنەوەی پلەی گەرمی بەشێوەیەکی بەرچاو

٣- نەشتەرگەری کەمکردنەوەی کیش

٤- کردنی برێکی زۆر لە وەرزش وە لەگەڵ بەرنامەیەکی خواردنی رێک



# INSULIN Test

ئەو هۆرمۆنەیە دەردەدرێ لە لایەن خانەکانی بێتا B لە ناو رژێنی غودەی پەنکریاس هەیە بەر پرسە لە خەزنکراوی شەکرە وادەکات ئاستی گلوکۆز لە خوێن زیاد بکات تاکو ئەنسولین زیاد بێت لە لەش. ئەنسولین وادەکات گلوکۆز بچێتە ناو خانە ئەوەش وادەکات گلوکۆز لەخوێن کەم بێتەوە
لەکاتی توشبوونی منداڵ شەکرەی جۆری یەکەم خانەکانی بێتا بەر زیان دەکەوێ لە پەنکریاس، ئەمەش وادەکات کە بەرهەم هێنانی ئەنسولین کەم بێت لە ئەنجامی ئەمە دا گلوکۆز لە خوێن زیاد دەکات.
بەڵام شەکرەی جۆری دووەم پەیوەندی نیە بە ئەنسۆلین لێرەدا بەرگری شانەکانی لەش بۆ جوجۆلی ئەنسۆلین بەردەوام دەبێت کە وادەکات پەنکریاس رێژەیەکی زیاتر ئەنسولین بەرهەم ببێت لەو حاڵەتانەی رێژەی ئەنسولین ئاسایی بێت یان زیاتر دەبێت لە رێژەی خوێن پێی دەڵێن جۆری دووەم.
پشکنینی ئەنسولین لە خوێن یارمەتی دەرە بۆ زانینی جۆری شەکرە.



# Ceruloplasmin Test

پەیوەندی بە مسەوەیە. یارمەتیدەرە بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشی ویلسون. نەخۆشیەکی بۆماوەیە پەیوەندی بە زیادەی مس هەیە لە جەرگ و مێشک دا زۆربەی جار سایتۆپلازم لەگەڵ پشکنینی کەپەر پێکەوە دەکرێت، بۆ زانینی نارێکی مس لە لەشدا، مس بە دوو شێوە کەم دەکات یان بە سروشتی یان بە بۆماوەی ئەم دوو پشکنینەش بۆ ئەوە دەکرێ تاکو بزانین بۆ ماوەیە یان سروشتیە.

سایتۆپلازم ئاستی ئەو پرۆتینە دیاری دەکات کە مس هەلی گرتوە بەرهەم دێت لە جەرگ کە یارمەتی دەرە بۆ گواستنەوەی مس لە لەش هەروەها یارمەتی دەرە بۆ شیکردنەوەی ئاسن.

دابەزینی ئاستی سیریلۆپلازمە بە بەرزبونەوەی مس لە میزدا نەخۆشی ویلسونە کەمی سیریلۆپلازمە لەگەڵ کەمی مس دەلالەت لە کەمی مس دەکات لە خوێن و میز.

**نیشانەکان**

١- کەم خوێنی کە وادەکات هەست بە لاوازبون و ماندی بوون بکات

٢- ئازاری سک رشانەوە

٣- زەردبونی چاو پێست

٤- گۆڕانی هەڵسوکەوت گۆڕانی مەزاج

٥- گرانی لەرۆشتن

٦- ئارەقەکردن

٧- رەقبونی ماسولکەکان بە شێوەیەکی نا ئاسای

**سیرۆپلازم لە هەندێ حاڵەت بەرزدەبێت**

١- لەناوچونی خانە

٢- شۆک

٣-حاڵەتی ئیلتهابات وەک ئیلتهاباتی رۆماتیزم

٤- شیرپەنجە

٥- بەکارهێنانی هەندێ دەرمان وەک

(هۆرمۆنی ئسترۆجین، کارابامازابین، ترشی فالبرۆیک، دووگیانی)



# Zinc Test

یەکێکە لەپێکهاتە گرنگەکانی لەشە بۆ سیستەمی بەرگری و هەستی بۆنکردن و تامکردن وە جەستە پێویستی پێیەتی بۆ تەواو بونی و دروست بونی وە زۆر گرنگە بۆ چاک بونەوەی برین DNA ترشی.
لە لەشدا رێژەی ٢-٣ غرامە کە لە پرچ و ئێسک و ددان و جەرگ و ماسولکە و پێست و هێلکەدا هەیە لە چالاکی ئاسندا هەیە مرۆڤ نزیکەی ٤-٩ ملگرامی پێویستە رۆژانە.
دەناسرێتەوە بەهۆی کەمی بۆنکردن و تام کردن و نەخەوتن و سک چون و کەم خوێنی و جەرگ ئەستووربوون و زیاد بونی ئیلتهابات بەهۆی کەمی بەرگری وە درەنگ چاکبونەوەی برین وە پرچ هەلوەرین کە پەیوەندیان هەیە بەو دوو پشکنینە (ALK.PHOPHATS-TESTOTERON).



**لەم حاڵەتانە بەرز دەبێتەوە ئەم پشکنینە :**

١- ئاستی شەکرە

٢- بەرکەوتنی سەر

٣- خواردنی هەندی کحولیەکان

٤- نەکردنی کارەکانی گورچیلە

**لەم حاڵەتانە نزم دەبێتەوە ئەم پشکنینە:**

١- زۆرخواردنی ئاو زیاد لە پێویست

٢- کەی ئاستی سۆدیۆم

٣- نەخۆشی سینگ

٤- شێرپەنجە

٥- سکچون

٦- سوتان

٧- مغەزی زۆر بەکارهێنان واتا خواردن لە رێگەی ملولەکان

# LDH Test

ئەنزیمێکە بە نزیکەی لە هەموو بەشەکانی لەش هەیە کاردەکات لە دروستکردنی وزەی خانەکان، ئاستێکی بەرزی هەیە لە خانە ماسولکەکانی دڵ، پەیکەرە ماسولکە.

**بە پێنج جۆری جیاواز دەردەکەوێت**

١- (LDH1) بە شێوەیەکی سەرەکی لە ماسولکەی دڵ دا هەیە

٢- (LDH2) خانەی خڕۆکە سورەکان و کلیەدا هەیە

٣- (LDH3) بەشێوەیەکی سەرەکی لە سییەکان و پەنکریاس دا هەیە

٤- (LDH4) لە جەرگ و پەیکەرە ماسولکە و کلیەدا هەیە

٥- (LDH5) لە جەرگ و پەیکەرە ماسولکەدا هەیە



ئـەو ئەنزیمـە لـەو شـانانەوە دەچێتـە نـاو خوێـن کاتێـک شـانە بەرکەوتنێکـی بەرکەوێـت بۆیـە هـەر کاتێـک ناتەواویـەک لـە بـۆری خوێنـی ملولـەکان یـان سـییەکان دا هەبێـت ئـەوا بەرزدەبێتـەوە.

لە چەند حاڵەتێک وەک:

١- لە شێرپەنجەی لیمفاوی

٢- ئیلتهاباتێکی زۆری هەبی لە ماسولکەکانی دل

٣- بەرکەوتنی دەماغی

٤- نەخۆشی گورچیلە

لەو حاڵەتەدا زەرتکیشی بەرزە Himolysis

٥- لە کاتی

٦- کەم خوێنی

٧- نەخۆشی پەیکەرە ماسولکە

نزم بوونەوەی هیچ هۆکارێکی دیاری کراو نیە

# ALT(GPT) Test
# Alanine_aminotransferase

ئەم پشکنینە پێوانەی ڕێژەی ALT لە خوێندا. ALT ئەنزیمێکە دروست دەبێت لەلایەن خانەکانی جگەرەوە. پرۆتینەکان کە پێیان دەوترێت ئەنزیم یارمەتی جگەر دەدەن لە تێکشکاندنی پرۆتینەکاندا تا لەش بە ئاسانی بتوانێت هەلیمژێت. ALT یش یەکێکە لەو ئەنزیمانە کە ڕۆڵێکی سەرەکی هەیە لە مێتابۆلیزمدا کە ئەویش گۆڕینی خواردنە بۆ وزە. لە حاڵەتی ئاساییدا ALT لەخانەکانی جگەردایە، بەڵام کاتێک جگەر زیانی بەردەکەوێت یاخود توشی هەڵئاوسان دەبێت ALT دەچێتە خوێنەوە. ئەمەش وادەکات ڕێژەی سیرەم ALT لە خوێندا بەرز بێتەوە. پێوانەکردنی ڕێژەی ALT لە خوێندا یارمەتی دکتۆر دەدات لە دیاریکردنی کێشەکانی جگەر و باش کارنەکردنی.
ئەم پشکنینە پێشی دەوترێت سیرەم گلوتامیک پایروڤیک ترانسەمینەس(SGPT).

**بۆچی ئەم پەشکنینە دەکرێت؟**

ئەم پشکنینە دەکرێت بۆ دیاریکردنی ئەوەی ئایا کەسێک جگەری ئازاری گەشتبێت یاخود لاوازبوبێت.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە:**

١- زەردوویی (زەردبونی چاو و پێست)
٢- دڵ تێکهەڵاتن.
٣- ڕشانەوە.
٤- ئازار لە بەشی سەرەوەی لای ڕاستی سک.

نەخۆشی جگەر بەگشتی هۆکاری بەرزبونەوەی ڕێژەی ALT لە خوێندا.
تەنها بەکردنی ئەم پشکنینە ناتوانرێت نەخۆشی جگەر بەتەواوی دیاری

بکرێت بەڵکو بەکردنی کۆمەڵێک پشکنینی تر کە پەیوەندن بە جگەرەوە دەتوانرێت دیاری بکرێت.

**هۆکاری بەرزی رێژەی ALT لەخوێندا:-**

١- هەوکردنی جگەر یان رەقبونی

٢- ژەهربوونی قورقوشمی

٣- راهێنانی زۆر یاخود بریندابونی توندی ماسولکەکان

٤- کەوتنەبەر کاربۆن تێتراکلۆراید CCl4

٥- مردنی خانەکان

٦- بەکارهێنانی دەرمانەکانی وەک:

ستاتین statin, ئەسپرین asprin, barbiturate, nacrotic, antibiotic.

٧- نەخۆشی یەک ناوکە.



# AST(GOT) Test
# Aspartate_aminotransferase

ئەو ئەنزیمەیە لە جەگەر و ماسولکەکانی دڵ دا هەیە، ئەگەر ڕێژەی ئەم پشکنینە بەرز بوو ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێ کە جگەر توشی هەوکردن بوە یان توشی نەخۆشیەکانی تری جگەر بووە، هەورەها ڕێژەی ئەم پشکنینە پەیوەندی هەیە بە نەخۆشیەکانی دڵ هەوکردنی پەنکریاس، هەندێ لەو کەسانەی کە مەترسیان زیاترە وەک لە کەسانی ئاسای ئەویش ئەو کەسانەن، ئەوانەی نەخۆشی شەکرمیان هەیە یان قەڵەون یان ئەو کەسانەی کە مادە کحولیەکان دەخۆنەوە یان بەکار هێنانی هەندی دەرمان.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

١-زوو ماندی بوون

٢-ئازاری سک

٣-ئارەزوو نەکردنی خواردن

٤-ڕشانەوە

٥-ڕەنگ زەرد بوون

هۆکارەکانی بەرزی ئەم پشکنینە

١-نەخۆشی لە ناوچون و زیان پێگەیاندنی خانەکانی جگەر بە هەر هۆکاریکەوە وەخانەی شانەی تر

٢-ئلتهابی جەرگ

٣-نەخۆشی جیا جیاکانی جەرگ (شێرپەنجە و لە ناوچونی جەرگ)

٤-ئلتهابی پەنکریاس

٥- زۆر خواردنەوەی مادە کحولیەکان

**هۆکاری کەمی ئەم پشکنینە**

١- کەم دەبێ لە کاتی کەمی VB6

٢- لە کارکەوتنی گورچیلە

٣- لەکاتی دووگیانی دا

٤- جەڵتەی سینگ



## a Ati trypsin Test

جۆرێکە لە پرۆتین پێی دەوترێت چەسپ کردنی پرۆتین کە A1AT لە جەرگ بەرهەم دێت کە بەرگری لە سییەکان و جەرگ دەکات. وە شانەکان دەپارێزێت لە ئەنزیم و خانە ئیلتهابیەکان جەرگ زۆرجار کە سەرکەوتوو نابێ لە بەرهەم هێنانی A1AT ئەمەش دەبێتە هۆی لە ناوچونی جەرگ لە گەنج و منداڵدا.

ئەو بە تەمەنانەی کەوا A1AT کەمە یان زۆر کەمە دەبێتە هۆی گەورە بوونی سییەکان لە زۆربەی کەسەکاندا جگەرە کێشان وادەکات کە سییەکان گەورەتر بن بەمەش جگەر کیشان لای ئەو نەخۆشانە بە هەموو شێوەیەک قەدەغەیە.

لەوانەیە دکتۆر ئەشیعەی بۆ بکات بۆ ئەوەی بزانی تا چەند سییەکانی گەورە بوە یان بۆ زانینی کێشەی جەرگ تا بزانی لە چ ئاستیک دایە. ئەم پشکنینە دەکرێتن بۆ زانینی ئاستی ئۆکسجین چەندە لە دەمارەکان هەتا بزانی سییەکان تا چەند کاردەکەن .

لەوانەیە دکتۆر پارچەیەکی بچوک لە جەرگ وەربگری بۆ زانینی ئاستی بەرکەوتنەکەی لە جەرگ دا، سەرەڕای ئەوەی کە چارەسەری نییە، بەڵام دکتۆر دەرمانی دەداتێ بۆ بەرز کردنەوەی ئەو پرۆتینە تاوەکو سییەکان گەورەتر نەبێت ئەو چارەسەرانەی پێویستە بە درێژای ژیان دەبێت بیخوات ئەگەر کێشە لە بۆ دروست بوو لە هەناسەدان پێویستە ئۆکسجین وەربگرێ بەرێگای ئامێری تایبەت بەهەناسەدان.

ئەم نەخۆشیە نازانرێ هەتا دەگاتە ٢٠-٤٠ ساڵی ئەو کات لێ بە دیار دەکەوێ کە هەست بە هەناسە تەنگی دەکەیت وە لەکاتی راکردندا توشی زیخە زیخی هەناسە دەبێت ئەمەش دەبێتە هۆی ئیلتهاباتیکی زۆر لە سییەکاندا.

**پرسیاری دکتۆر**

١-هەست بە تەنگە نەفەسی دەکەیت

٢-هەست بە زۆری سەرما بون دەکەیت

٣-لەم ماوەیە هەست بە کەمی کێشت کردوە

٤-دکتۆر پشکنینی هەناسەدان دەکات

٥-هەستت بە زەردوی پێست و چاو کردیە لەم ماوەیەدا

٦-بۆ تەکید کردن پێویستت بە ئەم پشکنینە دەبێت تاکو بزانی کرۆمۆسۆمەکان شکاون کە دەبێتە هۆی کەمی لە A1AT



**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

١-هەناسەتوندی

٢-هەوکردنی سیەکان کە چەندجار دەبێتەوە

٣-زیاد لێدانی دڵ

٤-بونی کێشە لە سیەکان

٥-کەمبونی کێش

٦-گیرانی سیەکان

٧-گەورەبونی سک

٨-پێستیان زەردو چاویان زەرددەبێت

**تێبینی**- کەمی A1AT واتە بونی نارێکیەکی بۆماوەی

# Protine Test

ئەم پشکنینە دەکری بۆ زانینی رێژەی پرۆتین لە خوێن دا پرۆتینەکان زنجیرەیەکی زیندەگی گەورەن پێک دێت لە زنجیرەیەکی درێژ یان لە ترشە ئەمینیەکان دەورێکی گرنگیان هەیە لە زیندە چالاکیەکانی لەش.وە هەروەها پرتۆتینەکان دەورێکی گرنگیان هەیە لەگشت خانە و شانەکان پرۆتینەکان گرنگن بۆ گەشەی لەش وە بەرەو پێش بردنی تەندروستی لەش خوێن ئەلبۆمین و گلۆبینیشی تێدایە کە تێدا ئەبومین بەشێکە لە پرۆتین کە پارێزگاری لە رۆشتنی شلە لە دەمارەکان دەکەن وە دەورێکی گرنیان هەیە لە سیستەمی بەرگری.

**نیشانەکانی ئەم پشکنینانە**

١- کەمبونی کێش، ٢- ئەستور بونی لەش بەهۆی کۆبونەوە شلە لە شانەکاندا ٣- نیشانەکانی نەخۆشی گورچیلە و جگەر.

**هەندێک لەو دەرمانانەی کە کاردەکەنە سەر ئەم پشکنینە**

١- ستروێداد ٢- هۆرمۆنی گەشە ٣- ئەنسولین ٤- پرۆجیسترون ٥- ئایوناتی ئەمونیوم. ٦- هۆرمۆنی استروجین ٧- دەرمانی دوو گیان نەبوون.

**تێبینی:** پرۆتین لە کاتی دووگیان بوون هەندێ جار بەرز دەبێت

**هۆکاری زیاد بوونی ئەم پشکنینە**

١- ئیلتهابات ٢- ڤایروسی کەمی بەرگری C,B

٣- نارێکی لە نخامی ئێسک وەک مایلوما و نەخۆشی الدستروم.

**هۆکاری کەمی ئەم پشکنینە**

١- خوێن بەربون ٢- نارێکی لە جەرگ ٣- نارێکی لە خواردن ٤- سوتانی زۆر ٥- نەخۆشی گورچیلە

## Albumin Test

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی رێژەی ئەلبوین لە ناو خوێندا، ئەم ئەلبومینە پرۆتینێکە کە جگەر بەرهەم دێت کە تێدا فەرمانی پاراستنی شلەی ناو جۆگەی خوێنە کە رێگە دەگرێ بچێتە ناو شانەکانی تر، وە ئەلبومین کە تێدا چەند مادەی جۆراو جۆری تر هەڵدەگرێ لە خوێن دا وەک هۆرمۆنەکان و ڤیتامینەکان و ئەنزایمەکان، بۆیە کەم بوونی ئەم مادەیە مانای ئەوە دەگەیەنێ کە کێشە لە جگەر یان گورچیلە هەیە.

**هۆکاری کەمی ئەم پشکنینە:**

١- نەخۆشی جگەر

٢- هەوکردنی ریخۆڵەکان

٣- نەخۆشی رژێنی غودە

٤- نەخۆشی گورچیلەکان

**هۆکارەکانی بەرزی ئەم پشکنینە**

١- کەمی شلەی ناو لەش

٢- سک چونی زۆر تا رادەیەک

٣- بەکارهێنانی هەندێ دەرمان وەک لە پشکنینی پرۆتین باسمان کرد



# Globulin Test

کۆمەڵێکە لە پرۆتینات لە خوێن کە لە جەرگ بەرهەم دێت لە لایەن سیستەمی بەرگری وە دەورێکی گرنگی هەیە لە کاری جەرگ و خوێن مەین وە چوار جۆری هەیە ئەوانیش ئەلفا و بیتاو ئەلفا۲ گاما. ئەگەر ڕێژەی کەم بێت دەلالەت لە بونی نەخۆشی جەرگ وگورچیلە دەکات بەکاردێ بۆ زانینی هەندێ نەخۆشیەکان وەک:

١- لەناوچونی جەرگ یان نەخۆشکەوتنی جەرگ

٢- نەخۆشی گورچیلە

٣- نارێکی لە بەرگری خودی

٤- نارێکی لە خوراک

٥- توشبونی هەندێ لە جۆرەکانی شێرپەنجە



## نیشانه‌کان

١-ماندووبـوون و ئاره‌قه‌کردن بـه مه‌رجێـک ببێتـه هـۆی زه‌ردووی ده‌موچـاو خـوار چـاو

٢- رشانه‌وه‌و هێلنج هاتن

٣- ماندوبونی به‌رده‌وام

٤- کۆبونه‌وه‌ی ئاو له ناو سک و قاچ و پێه‌کان

٥- نامانی ئاره‌زوی خواردن

## له‌م حاڵه‌تانه به‌رز ده‌بێت

١- ده‌لاله‌ت له‌بونی شیرپه‌نجه‌ی غوده‌ی لیمفاوی ده‌کات

٢- نه‌خۆشی هودجکین

٣- له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا هه‌ندێ جار ئاستی به‌رزه به‌س به‌هۆی هه‌ندی ده‌رمان

٤- نارێکی له موخی ئێسک وه‌ک المایلوما

# Bence jones Test

پرۆتینیکی کارەبایە لە میز امونوفیکلساتیون کارەبای ،ئەم پشکنینە بەکاردی بۆ پرۆتینی میز بە تایبەتی بۆ مایلۆما ئەویش جۆرێکە لە شیرپەنجە کە ئەنجامی بنس-جۆنز ناناسایی دەردەچێ بە بوونی گریەکی لیمفاوی پیس پێی دەوترێ شیرپەنجەی لیمفاوی،گرێی نخامی ئەویش شێرپەنجەی خوێنە لە خانەی پلازما ئەوە خانەی کۆئەندامی بەرگرییە کە بەشی تایبەت بەرهەم دەهێنێت پیان دەوترێ دژە تەنەکان کە بۆ یارمەتی بنبڕکردنی ئیلتهابات لەبەر ئەوەی زۆربەی خانەکانی پلازما لە نخامی ئیسک دەژین.

**مایلۆما کارەکاتە سەر چەند جۆرێک لە بەشەکانی خوێن:**

١- کەمی پەرەکان ئەمەش کەمی پەری کەمەکانی خوێنە کە پێویستە بۆ خوێن مەین.

٢- کەمی دەبێتە هۆی خوێن بەربوون یان صدمە.

٣- کەمی لە خرۆکە سپییەکانی خوێن کە وادەکات کۆئەندامی بەرگری بێ هیز بێت.

**مایلۆما:** نەخۆشیەکی شیرپەنجەیە کە توشی پلازمای جۆری B دەبێت کە دەبێتە هۆی لە ناوچونی خانەکان بە شێوەیەکی ناناسایی.

**هۆکارەکانی توشبون**

وەک هەموو شیرپەنجەکانی تر ناتوانری هۆکارەکەی بزانریت ،هەندێک لە لە سەرچاوەکان دەڵێن بەهۆی بەرگریەوەیە یان بەرکەوتنی هەندێک مادەی کیمیاوی روودەدات وەک (مژین و گولە و بۆیەی قژ) زیادەکات.




**بۆ دەستنیشانکردنی چەند پشکنینێکی بۆ دەکەین**

هەندێک پشکنینی بۆ دەکرێ لە ئیشی گورچیلە و ئاستی کالسیوم لە خوێن وە کارەبای پرۆتیناتی بۆ دەکرێت بۆ زانینی دەردانی کە هەر پرۆتینێکی نائاسایی نەناسراو کە دەردەدرێ لەلایەن خانەی شیرپەنجە وەک پرۆتین بنس-جۆن.

گرێی مایلوما وا لە دژە تەنەکان دەکات ببنە (احادیة المنسلیة) واتە هەموویان یەک بن یەک شێوە بن کە ئەمەش وای لێدەکات کە دژە تەنەکان ئیشی خۆی نەکات و هەروەها زیان بەخشیش بێت.

نەک لەبەر ئەوەی کە وا دژی تەنەکان ناوەستی بەڵکو کار دەکاتە سەر گورچیلە خانەکانی مایلوما وادەکات کە نیشانەی کیمیاوی کە خانە خۆرەکان زیاتر ئیش بکەن. خانەخۆرەکان ئەو خانانەن کە ئیسک لەناو دەبەن کە وادەکات ئیسکەکان بشکین بەمەش کالیسیوم بەرز دەبێت لە خوێن دا لەبەر ئەوە چەندان کێشە دروست دەبێت کە وادەکات گورچیلە تێنوبیت و میز وشک بێت بەمەش کیشەی گورچیلە دروست دەبێت.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە چیە**

١- ئازاروشکان بەهۆی بەرزبونی خانەی تێکشکێنەری ئێسک

٢-کەم خوێنی وە لاوازبونی کۆئەندامی بەرگری بەهۆی دروست نەکردنی خانەکان بەرپرسن لە دروستکردنی پێکهاتەکانی خوێن

٣- نارێکی لە بەرگری میز بەهۆی زیادی میز

**تێبینی:** عادەتەن پرۆتینی بنس –جونس نیە لە میز دا ئەگەر هەبی لەوانەیە بەهۆی بونی گرێی نخامی معدەکەوە یان حاڵەتی شازی تر کە پێی دەوتری الدنستروم ماکسروغلوبولین الدم کە ٪٥٠-٪٨٠ لە خەلک کە بنس-جونسیان هەیە دەنالینن بە دەست گرێی نخامی معدەوە

**تێبینی-** هەندی جار بە هۆی نارێکی گاماش ئەم پرۆتینە زیاد دەکرێتن کە پێویستی بە چارەسەر نییە بۆ دەبیت سەردانی دکتۆر بکات.

میز وەردەگیرێت لە ٢٤ سەعات دەبێت هەمو میزەکە هەڵبگیرێ دوایی پشکنینی Protein electro بۆ بکرێت . بەڵام پشکنینی بێنز-جونز یەکسەر دەکرێتن پێویست بە ٢٤ سەعاتی ناکات .



# COPPER TEST
# ( Blood cu Test)
# (Urine cu Test)

مس معدەنێکی سەرەکیە لە خوێن بۆ لەش بەڵام زیادی دەبێتە هۆی ژەهراوی کردنی خوێن کە زۆربەیان لە سایتۆپلازم کۆدەبێتەوە بەس بەشێکی کەمیان نەبێ بە سەربەستی دەمێنیتەوە کاتێک نەخۆش نیشانەکانی پەیدا دەبێ زۆر گرنگە لێکی جیابکەینەوە کەپەر لەگەڵ نەخۆشی ویلسون .

**نەخۆشی ویلسون:** نەخۆشیەکی بۆماوەیە کە مس لە جەرگ کۆدەبێتەوە ناتوانرێ بە تەواوی مسەکە لە ناو ببرێت بڵاودەبێتەوە لە چاو پەنکریاس لە شانەی دەماری هەستەوەر کە وادەکات نەخۆش عەقلی و هەستەوەری بگرێ جگە لە نەخۆشی جەرگ و عادەتەن چارەسەری بکرێ بەردەوام یان لابردنی مسەکان، بەڵام هەندێ جار سەرکەوتوو نابێت دەبێت چاندنی(زرع) گورچیلە بۆ بکرێت.

**ژەهراوی بونی مس ئەمانەن نیشانەکان**

١- بونی ئازار لە زگ

٢- ئارەقەکردن

٣- گۆرانی هەلسوکەوت

٤- لەرزین

٥- گرانی لە رۆیشتن

٦- شلەژان

**کەمی مس بە شێوەیەکی نائاسای**

١- هشاشە عظام

٢- دواکەوتن لە گەشەی منداڵ

مس لەکاتی بوونی دووگیانی لەگەڵ سایتۆپلازم بەرزدەبێت

هەندی جار بڵاوی مس لە جەرگ بەشێوەیەکی رێک نابێت ناتوانری بەهۆی پشکنین کردن بزانری.
١-کەم بونی مس لە خوێن لەگەڵ بەرز بونی لە میز وە سایتۆپلازم بەرز دەبێت و مسی جەرگ بەرز دەبێت کە ئەمەش لەگەڵ نەخۆشی ویلسون ناگونجێ.
٢-زیاد بونی مس لە خوێن و میز وە زیادبونی وە زیادبونی سایتۆپلازم کە دەلالەت لە بونی نەخۆشی جەرگ دەکات یان ئیلتهاباتی جەرگ.
٣-کەم بونی مس لە خوێن و میزدا وە نزم بوونی سایتۆپلازم دەلالەت لەکەم بونی مس دەکات لە لەش.

**ئەو هۆکارانەی کە ئەنجامی پشکنینێکی نارستمان دەداتێ:-**

١- دەرمانی کارمازبیین والفینوباربیتال ئاستی مس زیاد دەکات
٢- هەوکردنی رومانتیزم
٣- هەندێک شیرپەنجە
٤- لە کاتی لە دایک بوون کەم دەکات دوای دەگەڕێتەوە ئاستی جارانی دوای ماوەیەک.



# Phenyl Alanine Test

ئەو پشکنینە دەکرێت بۆ ئەوەی بزانی بەکتریا ئەنزیمی فینەل دەردەدات کە بەکاردێ وەک سەرچاوەی کاربۆن و وزە، هەندێ بەکتریا دەتوانن ترشی فینەل الانین دروست بکەن، وە هەروەها ئەم پشکنینە لە ڕێگای چاندن (زرع))ەوە دەکرێت. لە ڕێگەی بۆماوەیەوە دەگوازرێتەوە.

**فینیل الانین:** ترشی ئەمینیە کە لە پرۆتین هەیە پێویستە بۆ گەشەی منداڵ لە گەورەش پێویستە لە شیرو هێلکە دا هەیە وە عادەتەن دەگۆڕێ بۆ تایرۆسین لە جوم جومەی مرۆڤ. لەش پێویستیەتی لە کاتی زیندە چالاکیەکاندا.

**نیشانەکانی بەرزی ئەم پشکنینە**

١-لەرزینی دەست لەکاتی گرتنی قەلەم ،دەست لەرزینی لەکاتی خواردندا ٢- زەردبونی پرچ ٣- تەمبەڵی ٤- ناجێگیری لە ئەقل ٥- نارێکی جومجومەی دەماخ ٦- هەوکردنی پێست ٧-پێست وشک بون ٨- دروست بونی لەکە لە پێست وەک ئەکزیمیا ٩- دواکەوتن لە قسەکردن و ڕۆشتن و گەشەی منداڵ ١٠- تەشەنوجات تا دەگاتە ئاستی ڤێ ١١-بۆنی ناخۆش لە میز ١٢-ڕیژمیەکی زۆر کۆبونەوەی ترشی فینیل الانین بۆنیکی جیاواز لە پێست دروست دەکات ١٣-هەلسوکەوتی نەشیاو.

**نیشانەکانی نزمی ئەم پشکنینە**

١-کەمی ترشی تایرۆسین دەبێتە هۆی گۆڕینی رەنگێکی روون وفاتح لە پێست دا بەهۆی کەمی رەنگی میلانین.

**چارەسەر**

پێویستە نەخۆش خشتەیەکی خۆراکی ڕێکوپێک دابنێت هەتا تەمەنی ١٣ساڵی.

ئەو خۆراکانەی ئەم ترشەیان تێدایە وەک گۆشتی ئاژەڵ، مریشک، ماسی، هێلکە، بقلیات، پەنیر.

زیاتر میوە و بابەتەکانی باشترین خواردنە بۆ ئەم نەخۆشیە



# Urine proteine Test

ئەم پشکنینە بەکاردێ بۆ زانینی بونی پرۆتین لە میزدا زۆر جار بەکاردێ بۆ زانینی کاری گورچیلە وە بۆ زانینی لە ناوچونی گورچیلە لە کاتی زوو یان لە کاتی نەخۆشی.

**چەند جۆر پشکنینی پرۆتین دەکرێت**

١-بە عەشوای لەکاتی کردنی پشکنینی میزدا دەکرێت کە بەشێکە لە شیکردنەوەکە.

٢-پرۆتین دەکرێت لەگەڵ کریاتینی میز

٣-قیاس کردنی لە پشکنینی ٢٤ سەعاتی تا بزانرێ لە ٢٤ سەعاتی چەند پرۆتینی فرێداوە.

پرۆتینی پلازما گرنگە بۆ هەموو بەشەکانی لەش کاتێک گورچیلە توشی زیانێک دەبێت ناتوانێ بە تەواوی خاوێنی بکاتەوە وادەکات پرۆتین زۆر بێت.



# Prot/cr ratio Test
# (Proteine /creatinine ratio)

ئەم پشکنینە بەکاردێ بۆ زانینی بونی پرۆتین لە میزدا زۆر جار بەکاردێ بۆ زانینی کاری گورچیلە وە بۆ زانینی لە ناوچونی گورچیلە لە کاتی زوو یان لە کاتی نەخۆشی، ئەگەر زانرا پرۆتین بەرزب و لە میز. دووبارە داوای لێ دەکرێ لە رۆژێکی تر بکرێتەوە تێبینی لەسەر ئەوە دەکرێ کە بزانی نزمتر بوە یان هەر بەرزە ئەگەر بەرز بوو ئەوا پرۆتینی میز بۆ دەکرێ لە ٢٤ سەعاتی لەگەڵ هەنی پشکنینی تر.

**لەچ کاتێک ئەم پشکنینە دەکرێت**

١-لەکاتی بوونی دووگیانی

٢- لەکاتی بوونی هەوکردنی لە رێڕەوی میز

٣- بۆ زانینی کاری گورچیلە

**نیشانەکای ئەم نەخۆشیە ئەگەر بەرز بێت**

١- بەهۆی خواردنەوە وای لێهاتوە

٢- وەرزشی قورس

٣- بەرکەوتنی سەرمایەکی زۆر

ئەگەر بەرز بو ئەوا دەبێ لە سێ رۆژ سێ جار ئەم پشکنینە بکاتەوە ئەوکات ئەگەر هەر بەرز بوو ئەوا پرۆتینی ٢٤ سەعاتی بۆ دەکرێت. ئەمەش لەوانەیە ببێتە هۆی چەندین نەخۆشی وەک:

١- داء نەشوانی ٢- شێرپەنجەی رێڕەوی میز ٣- لەکارکەوتنی دڵ ٤- نەخۆشی شەکرە ٥- وەرگرتنی دەرمانی ژەهراوی بون بە گورچیلە ٦- بەرزبونی پەستانی خوێن ٧- مایلۆما ٨- ئیلتهاباتی رێڕەوی میز ٩- ژەهراوی بون لەلایەن ئافرەتی دووگیان .



# CPK Test
# Creatine phospho kinase

ئەو ئەنزیمە لە هەموو ماسولکەکان هەیە وە لە ماسولکەی دڵیش دا هەیە دەورێکی گرنگی هەیە لە دەردانی وزە بۆ ماسولکەکان وە بەرێژەیەکی دیاریکراو لە مێشک دا هەیە، یان ماسولکەی دڵ توشی خراپ بون دەبێت ئەو ئەنزیمە دەرژێتە ناو ماسولکە توشبوەکە کە وادەکات رێژەی بەرز بێت لە خوێندا.

ئەو ئەنزیمە دروست دەبێ لە ئەنجامی شیبونەوە و وە مردنی خانە ماسولکەکان وە هەموو مرۆڤێک ئەو خانانەی هەیە کە بە شێوەیەکی ئاسایی دەمرێت رۆژانە ئەو خانانە کە دەمرێ ئەنزیمەکانیان دەرژێنە ناو خوێن.

**لەم حاڵەتە زیاد دەبێت**

١- زیان پێ گەیشتنی دڵ
٢- جەڵتەی سینگ
٣- کەم بونەوەی فشاری خوێن لەکاتی نەشتەرگەری
٤- بەرکەوتنی دڵ
٥- دەرزی لێدان لە ماسولکەکان
٦- کەمی رێژەی پۆتاسیوم
٧- کەمی غودە دەرەقی
٨- بەرزبونەوەی پلەی گەرمی
٩- تێکچونی دڵ بەهۆی خواردنەوە

## لەم حاڵەتانە کەم دەبێت

هیچ هۆکارێکی تایبەتی نیە ببێتە هۆی کەم بونەوە و بەهۆی بۆماوەی دەگوازرێتەوە بۆ نەوەکان وە دەبێتە هۆی.

١- درەنگ کەوتنی گەشەی بەشەکانی لەش
٢- لاوازی و زیادبونی ماسولکەکان بە پێی تێپەڕبون کات
٣- ناتەواوی لە تەوازنی منداڵ بەتایبەتی لەکاتی ڕۆیشتن
٤- درەنگ تێگەشتن
٥- کەمبونەوەی زیرەکی لە هەندێ منداڵ
٦- لەگەڵ ڕۆشتنی کات نارێکی لە ماسولکەکان دروست دەبێ
٧- قەبارەی ماسولکەکان گەورە دەبێ لە چاو قەبارەی ئاسای خۆی
٨- لە فەترەیەکدا وای لێ دێ ناتوانێ بڕوات
٩- هەندێ جار ناتوانێ فەرمان بە ماسولکەکانی بکات واتا ناجولێ



# ADA Test
# (Adenosine Deaminase Fluid)

ئەنزیمێکە نیشی لەناوبردن و دروستکردنەوەی ترشی ناوک لە ناو ناوک بەرپرسە لەگۆڕینی ئەدینوس بۆ ئاستێکی تر پێی دەوترێ (ئینۆسین) ئەو ئەنزیمەیە لە ناو هەموو خانەکانی لەش هەیە، بەڵام لە کاتی کەمبوونی ئەم خانەی کە لە هەمووان زیاتر زەرەری بەردەکەوێ خانەکانی خوێن کە خڕۆکە سپیە لیمفاویەکانن، هۆکاری کەمی ئەنزیمی(ئدینۆسین د ئەمینین) کە دەبێتە هۆی کۆبونەوەی (ئەینۆسین د ئۆکسی) ئەو مادەیە کە بە ژەهراوی دادەنرێ بۆ خڕۆکە سپیەکان بەرەو مەرگی دەبات هەموو خانە لیمفاویەکان هەستیارن بۆ ئەو مادەیە بەتایبەتی خانەی لیمفاوی (ت نێسک).



هەروەها یارمەتی دەرە بۆ زانینی دڵنیا کردنەوەی نەخۆشی سییل بۆ زانینی شلەی لەش وەک شلەی پرۆتین شلەی نخامی.
چ کاتێک ئەم پشکنینە دەکری کاتێک شک لە بونی نەخۆشی سیل دەکات ئەویش بەهۆی ئەوەی کە نەخۆش دەناڵێنی بە دەست ئازاری سینگ یان قورسی هەناسەدان لەوانەی سیلیان هەیە کە گەشتۆتە بەتانەی دەوری سییەکان.

**نیشانەکان**

١- تایەکی بەردەوام
٢- ئارەقەکردنی شەوانە
٣- کەمبونی کێش بە بێ هۆ
٤- ئازاری سینگ
٥- سکچونی بەردەوام
٦- سینگ ئێشان

## Drug Level Test

بەسودە کە پشکنینی ئاستی دەرمان بکەین بۆ ئەو نەخۆشانەی کە دەرمان دەخۆن، ئاستی مخدرات هەندێک جار ئەوەندە بەرزە کە جێی پەنجە بەجێ دەهێڵێت لەسەر کەسەکە،کاتیک دەکریت کە نەخۆش لەسەر دەرمانێک خواردویەتی وازی هێناوە دکتۆر ئەم پشکنینەی پێ دەکات تا بزانی تا چەند دەرمانەکە جێ پەنجەی ماوە لە لەشدا بۆ ئەوەی بە گوێرەی ئەم پشکنینەکە دکتۆر دەرمانەکەی بۆ زیاد و کەم کات، دەکرێت بزانین بە هۆی ئەو دەرمانە توشی هیچ بەزەهیربونێکی خوێن بوە یان بۆتە هۆی ئەوەی کەوا هیچ کاریگەریەکی خراپی لەسەر نەخۆش دروست بکات، یان بزانین تا چەند نەخۆش سودی لەو دەرمانانە کردوە، وە تا چەند ڕێژەکەی هەیە لە لەش، یانیش بۆ ئەوەی بزانین کە ئەو کەسەی مخدەرات دەخوات تا چەند لە خوێن دا هەیە ڕێژەکەی تا چەند زیانی بەر بەشەکانی لەش گەیاندوە یان پێویستە تا چەند چارەسەر وەربگرێت، یان ئەو چارەسەرەی وەری دەگرێت کاری کردۆتە سەر کەم بونەوەی لە لەش دا.



# Lithium Test

ئەم پشكنینە دەكرێت بۆ زانینی رێژەی لیثیوم لە خوێن كە ئەو دەرمانەیە بەكاردێت بۆ ئەو نەخۆشانەی كە نەخۆشی دەرونیان هەیە كە نارێكی لە مەزاجیان هەیە یان كەسایەتیەی دوو دەوریە یان هەوەستێكی زۆر ئەو پشكنینە بەكاردێت بۆ دانی برێكی پێویست لەو دەرمانە ئەگەر تازە دەستی پێكردبێت وە هەروەها بەكاردێ بۆ ئەوەی بزانی كە دەبێ بەردەوام بێت لە وەرگرتنی یان نا، ئەگەر برێكی زۆری لێ وەربگری ئەوا چەند لایەنێكی خراپی زۆری دەبێت وە ئەگەر برێكی كەمی لێ وەربگری ئەوا یارمەتی دەر نابێت بۆ چاكبونەوە، وە هەفتەی دووجار بەكاردیت وە هەروەها بەكاردێ ئەگەر ماوەیەك بێت بەكاری بێنێت ئەم پشكنینە دەكرێتەوە بۆ ئەوەی بزانرێ كە دەرزیەكە زیادبكری یان كەم بكری.

ئەم پشكنینە دەكرێ ئەگەر ئەم نیشانانەی تێدابێت

١-لەرزین ٢-رشانەوە ٣-بورانەوە ٤-هێلنج ٥-سكچون

## Lithium Toxicity

- Narrow therapeutic range: therapeutic dose is close to a toxic dose.
- Mild to Moderate toxic reactions:
  - 1.5 to 2 mEq/L
    - Diarrhea
    - Vomiting
    - Drowsiness
    - Muscular weakness
    - Lack of coordination
    - Dry mouth



وە پشکنینی گورچیلەشی پێویستە لەبەر ئەوەی تابزانرێ تا چەند گورچیلەکانی ئیش دەکات ئەمەش بەهۆی ئەوەی کەلثیوم لەلایەن گورچیلەکانەوە دەردەدرێ ئەوانیش بریتین لە

1-GUE 2-estradiol 3-urea 4-creatine 5-ca 6-t4-tsh 7-ca-k-na

وە هەروەها نەخۆشەکە نابێت دووگیان بێت چونکە نابی لە کاتی دووگیانی لەش مانگی یەکەمی ئە چارەسەرە بخورێت.

لەکاتی خواردنی لثیوم دیسان چەند پشکنینێکی تری لێ داوادەکات

١- خوران ٢- کریاتین ٣- پشکنینی میز ٤- غودەی دەرەقی بۆ ئەوەی بزانینی کە گورچیلە و غودەی دەرەقی چۆن ئیش دەکات لەکاتی وەرگرتنی لثیوم ئەگەر ئاستی زۆر بەرز بوو ئەوا ژەهراوی دەبێت بە لثیوم وە دەبێت یەکسەر چارەسەر وەربگری زیادی لثیوم دەبێتە هۆی کوشتن .



## چ کاتێک ئەم پشکنینە ئەکرێت

١- ئەگەر چارەسەری وەرگرتبی نابێت هەتا دوانزە سەعات بکریت.

٢- هەندێک دەرمان

٣- دەرمانی هەوکردنی مفاسل

٤- ڤێ

تێبینی: ئەگەر ئەسپرین بخوات ئاساییە پشکنینەکە بکرێت.

-پێویستە رەچاوی چی بکەین ئەگەر ئەم پشکنینە بکەین .

هیچ پێویست ناکات تەنها بزانی کۆتایی جار کەی بوو کە دەرزی لثیوم لێدا وە چ دەرمانێک یان دەرمانی سروشتیت بەکاردێنی.

# Transferrin Test

لەلایەن جەرگەوە کاردەکات کاتێک ئاستی ئاسن کەم دەکات لە لەش جەرگ ترانسفرینی زیاد دروست دەکات بۆ بەدەست هێنانی برێکی زیاتر لە ئاسنی ناو خوێن کە ئاسن دەورێکی گرنگی هەیە لە لەش وەک یارمەتی دەری خرۆکە سورەکانە تاوەکو ئۆکسجین بگوازێتەوە بۆ خانەکان.

ئەم پشکنینە کاتێک دەکرێت کە گومان لە جۆرێکی کەم خوێنی دیاریکراو بکات واتە کەمخوێنی بەشێوەیەکی گشتی، جۆرێک لە کەمخوێنی بەهۆی کەمی ئاسنەوە دەبێت کە ئەم ئاسنە بەشی زیندە چالاکیەکانی لەش ناکات.

**نیشانەکانی کەمی ترانسفرین**

١-ماندوبون بێتاقەتی ٢-گۆرانی رەنگی پیست ٣-سەرسوران ٤-ژانەسەر
٥-هەناسە تەنگی خێرا لێدانی دڵ، ٦-شێواوی لە نینۆک

**کەمی ئاسن**

١- هەستکردن بە ماندوبون
٢- زیاد نەخۆشکەوتن
٣- هەست بە سەرمابوون
٤- نەستوربونی زمان
٥- نەمانی تەرکیز لە کاردا
٦- درەنگ کەوتنی گەشەی منداڵ

**ئاسن لەو سەرچاوانە دەستەکەوێ**

١-سپێناخ ٢-فاسولیا ٣-هێلکە ٤-ماسی ٥-گەنم

چ کار دەکاتە سەر نارێکی ئەم پشکنینە

- وەرگرتنی حەبی دووگیان نەبوون

**ترانسفرین:** پرۆتین پلازما کە ئاسن دەگوازێتەوە لە خوێن بۆ جەرگ و مۆخی ئێسک

کەمی ترانسفرین کە دەبێتە هۆی لاوازی هیمۆگلۆبین کە دەبێتە هۆی کەم خوێنی

کەمی لەوانەیە بەهۆی کەمی دەردانی ترانسفرین لە جەرگ یان زۆر رۆشتنی لەلایەن گورچیلە کە لە رێگەی میز دێتە خوارەوە

وە دکتۆر چەند پشکنینیکی تری لێ داوا دەکات

1-cbc 2-ferritine 3-stool



# Iron Test

ئەگەر ئەنجامی پشکنینی ئاسن زۆربوو ئەوا لەش توشی ژەهراوی بون دەبێ دەبێتە هۆی ژەهراوی بونی دڵ و جەرگ و پەنکریاس.

ئاسن یەکێکە لە کانزا گرنگەکان لە لەشدا، ئاسن یەکێکە لە پێکهێنەرەکانی هیمۆگلۆبینی خوێن کە هیمگۆلبین لە خرۆکە سورەکاندا هەیە و ئۆکسجین ئەگوازرێتەوە بۆ خانەکانی لەش.

کەمی ئاسن یان زۆری ئاسن کێشە دروست دەکات

کاتێک ئاسن کەم بێت ئەوا خرۆکە سورەکان کەم دەبێت و ئۆکسجینی پێویست ناگوازرێتەوە بۆ خانەکانی لەش .

**هۆکارەکانی کەمی ئاسن :-**

١- لەئافرەتاندا بەهۆی خوێن لێ رۆشتن لە سوری مانگانەدا

٢- بەهۆی وەرنەگرتنی رێژەی پێویستی مادەی ئاسن لە خۆراکەوە

٣- بەهۆی بونی خوێنبەربونی ناوەکی ،واتا لە ناوەوەی لەشدا ،ئەمەش بەهۆی برین و یان نەخۆشی وەک شێرپەنجە...هتد یان لەوانەیە رویدات لە کاتی خوێن بەربونی ناوەوە یەکێکە لە باوترین هۆکارەکانی لەدەستدانی ئاسن و روودانی کەمخوێنی.

٤-بەهۆی ئەوەی لەش توانای مژینی ئاسنی نەبێت

**نیشانەکانی کەمی ئاسن**

١-هیلاکی

٢-سەر ئێشە

٣-لاوازی ماسولکە

٤-گێژخواردن

٥-خواربوون و لاوازی نینۆک

**نیشانەکانی زۆری ئاسن**

١- ئازار لە سک و جومگەکان

٢- هیلاکی

٣- کێشەی دڵ

٤- کەمی وزە

٥- کەمی ئارەزوی جووت بوون

٦- کەمبونی کێش

٧- لاوازی ماسولکە

**تێبینی:** ئەگەر ئەو نیشانانەت تیابوو ئەبێ ئەو پشکنینە بەکەیت

ئەنجامی پشکنینەکە mcg/dl 60-170 ئاسایە

**ئەگەر لەو ئەنجام زیاتر بوو ئەوا:-**

١-hemolytic anemia واتە ڕێژەی تەواوی خڕۆکەی سوور تەندروست نیە

٢-کیشەی جگەری هەیە

٣-زۆر وەرگرتنی ئاسن

٤-لەشت ئاسنی زۆری دەهێڵێتەوە

**ئەگەر لە ئاسایی کەمتر بوو ئەوا:-**

١-anemia لەشت بە باشی ئاسن نامژێ

٢-کاتی سکپڕی

٣-خوێن بەربون لە ریخۆڵە و گەدە

٤-بەشی پێویست ناخۆیت لە خواردن

ئەو خواردنانەی دەوڵەمەندن بە ئاسن

١-گۆشتی سۆر

٢-سەوزە ٣-دانەوێلە

# TIBC Test
# Total iron binding capacity

ئەم پشکنینە پەیوەندی هەیە بە رێژەی ئاسن لە ناو خوێن. کە ٪٧٠ دەچێتە ناو خوێن ٪٣٠ دەچێتە ناو شانەکان خەزن دەکرێ، فەرمانی بۆ پێوانەکردنی توانای خوێن بۆ وەرگرتن و گواستنەوەی ئاسن واتە بەو شێوەیە دەتوانین کە لەش تا چەند توانای وەرگرتنی گواستنەوەی هەیە.
وە ئەو ئاسنە ئەو پرۆتینە هەڵی دەگرێت ناوی (Transferrin) پاشان دەگوازرێتەوە ناو خوێن کە جەرگ تێدا دروستی دەکات وە لەگەڵ (Ferritin-iron) ئەم دووپشکنینی دەکرێ.
ئەمەش بۆ زانینی کە لەش تا چەند توانای خەزن کردنی ئاسنی هەیە کەم دەبێ TIBC ئەگەر هاتوو جەرگ کێشەی هەبوو.
**تێبینی:** هەروەها پێوستە پشکنینی (Transferrin) لەگەڵ ئەمانە بکرێ چونکە پەیوەندیەکی راستەوخۆیان هەیە بە ئەنجامەکە بۆ ئەوەی بە تەواوی لە کێشەی کەمخوێنی خەزنکردن و گواستنەوەی ئاسن تێبگەین.
نابێ نەخۆش ١٢ سەعات نانی خواردبێ

## چ کاتێک ئە م پشکنینە دەکە ین

١- ئەگەر نەخۆشەکە توشی ئەنمیبا بوو
٢- ئەگەر نەخۆشەکە توشی Haemochromatosis بوو
٣-ئەگەر نەخۆشی درێژ خایەنی هە بوو

# Ferritin Test

بریتیە لە دەنکۆڵەی پرۆتین و لە لایەن جگەرەوە لە (reticuloEndothelial cells)ەکانەوە دەردەدرێنە ناو خوێن و ئەم پرۆتینە پەیوەندیەکی راستەوخۆیان بە رێژەی ئاسنەوە هەیە لە لەشدا لەبەر ئەوەی کاریان هەڵگرتن و خەزن کردنی ئاسنە لە لەشدا، واتا کۆگای هەڵگرتنی ئاسنن.

**فەرمانی خەزن کردنی ئاسنە لە ناو شانە**

بەشێوەی Ferritin هەڵدەگیرێ بەرێژەی ٧٠٪ - ٨٠٪ وە بەرێژەیەکی کەمیش بەشێوەی هیمۆسدلدرین هەڵدەگیرێ جگە لە جگەر لەلایەن سپڵ و ماسولکەکان و مۆخی ئێسک لە لایەن (erythroblast) ەوە دەردەدرێت.
Ferritin پێکهاتوە لە بەرگێکی پرۆتین (apoferritin) وە لە ناوەراست و کرۆکەکەی ئاسنی لە شێوەی (ferric) کە پێی دەوترێ (oxyhydroxide micells ferric) و لەگەڵ کەمێک فۆسفات.
ئەم پشکنینە گرنگە بۆ دیاری کردنی نەخۆشی کەم خوێنی بەهۆی کەمی ئاسن و جیاکردنەوەی کەم خوێنی بەهۆی ئاسن و لە جۆرەکانی تری کەم خوێنی زانینی کاریگەری بەکارهێنانی دەرمان بۆ کەم خوێنی کەمی ئاسن.... هتد لە هەرکاتێک نیشانەکانی کەمخوێن و کەمی ئاسن لە نەخۆشێک هەستی پێکرا وەک رەنگ هەڵبزرکان واتا رەنگ زەردبون یان تەنگە نەفەسی و قژ هەڵوەرین سپی بونەوەی پێڵوی چاو لەپی دەست و بی تاقەتی و لە دەست دانی ئارەزوی خواردن ....هتد
دکتۆر ئەم شیکاریە دەنوسێ لەوانەیە زیاتری پێویست بێ بۆ دەستنیشانکردنی جۆری کەم خوێنیەکە.

## نیشانەکانی:

ئەو کەسانەی ئاسنیان کەمە

١- توشی بێتاقەت بون دەبێ

٢- سەریان زوو زوو دێشی

٣- سەر گێژبون

**ئەو کەسانەی ئاسنیان زۆر بێت**

١- ماسولکەو جومگەکانی دێشی

٢- ماندوو و بێتاقەت بون

٣- ئازاری سک

٤- لە دەست دانی جووتبون

٥- نیشانەیە بۆ نەخۆشی جەرگ و شەکرە و دڵ



## Electrolyte Test

ئەو کۆمەڵە ئایۆنانەیە کە هەڵدەستێ بە هەڵگرتنی بارگەی سالب یان موجەب کە لە ناوخانەدا هەیە یان لەناو لەشدا یان لەناو پلازمادا هەیە، وە پێک دێت لە سۆدیۆم و پۆتاسیۆم و کالیسیۆم و مەگنسیۆم وکلۆرید بیکاربۆنات بۆ زانینی کاری گورچیلە و رژێنی غودە وە کاری ترش وە هەندێ ئەلکترۆنیاتی گرنگ هەیە.

کە بەشێوەیەکی ئاسایی پێوانە دەکرێ لە خوێن یان پلازما. کالیسیۆم و فسفۆر کە بەیەک پێوانە دەکرێ چونکە هەردووکیان کاردەکەنە سەر ئێسک و نەخۆشی دەرەقی وە مەگنسیۆم کۆتا بەشە لە کارەبای کە پێوانە دەکرێ بەشێوەیەکی ئاسایی.

## Potassium
## (k)

دەورێکی گرنگی هەیە لە پارێزگاری کردنی رێژەی تەزووی کارەبا لەسەر رووی خانەکان و لە پەیوەندی کردنی خانە جیاوازەکانی مێشک لە نێوان هەستەوەرو ماسولکەکان وە هەروەها گرنگە بۆ کاری گواستنەوەی زانیاری و خواردن لە دەرەوەی خانە بۆ ناوەوە.

لە هەندێ حاڵەت زیاد دەبێت ئەگەر خوێنەکە هیمۆلایسیس بێت ئەوا ئەنجامەکەی زۆر دەبێت وە لە هەندێ حاڵەت کەم دەبێت وەک:-

١- لە رێگەی دەردان لە ناو میز کە بەهۆی هەندێ دەرمان کە زیان بە میز دەگەیەنێت

٢- سک چوون

٣- رشانەوە

٤- زیاد بونی ڕێژەی الالدستیرۆن

٥- زۆر ئارەقە کردن

# CALCIUM
## Ca

بە یەکێک لە کارکەرە گرنگەکان دادەنرێ، دەورێکی گرنگی هەیە لە زۆربەی کارەکاندا بەشداری دەکات لە تەواوبونی پەیکەری ئێسک وە دەورێکی سەرەکی هەیە لە گواستنەوەی ئیشارەتەکان بۆ دەمارە راگەیاندن وە دەوری هەیە لە پەستانی خوێن و خوێن مەیین وە جموجۆلی هەندێک لە ئەنزیمەکان وە رێک خستنی هەندێک لە هۆرمۆنەکان.

٥٠٪ لەو کالسیومە بەسە بەخۆی لە خوێن دا هەیە کە بەرپرسە لە زۆربەی کارەکاندا

٤٥٪ پرۆتین هەلی گرتوە بە تایبەتی ئەلەبومین

٥٪بە شیوەی ستراتی کالسیوم هەیە

**لە حاڵەتانە بەرز دەبێتەوە**

١- نارێکی لە کاری غودەی دەرەقی

٢- هەندێ گرێی شێرپەنجەی

٣- هەندێ گرێ ی ئیسکی

٤- نەجولانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر

٥- زیاد خواردنی ڤیتامین د

**لەو حاڵەتانە کەم دەبێت**

١- کەمبوونی کاری غودەی دەرەقی

٢- کەمبوونی ڤیتامین د

٣- ئەو نەخۆشیانەی کە دەبێتە هۆی خراپی هەرس کردن

٤- هەوکردنی پەنکریاس

٥- لەکارکەوتنی گورچیلە

٦- سکچونی چەوری



# Sodium
# (Na)

ئەو کیمیایەیە کە شەحنەی موجەب پێکدێنێت لەو شلەیەی کە لە دەوری خانە هەیە

دەورێکی گرنگی هەیە لە رێکخستنی پەستانی خوێن وە گواستنەوەی سۆدیۆم بۆ ناو خانە وە کەمی لە لەشدا دەبێتە هۆی کەمبونەوەی شلەی دەوری خانە کە کاردەکاتە سەر دەورانی خوێن و کاری گورچیلە جیهازی هەستەوەر .

**لەم حاڵەتانە بەرز دەبێتەوە**

١- وشک بون وزیاد میزکردن کە بە شەکرە درۆزنە دەچێت

٢- لە کاتی وەرگرتنی برێکی زیاد لە سۆدیۆم

٣- دەردانی برێکی زۆر لە کۆرتزۆل

**لەم حاڵەتانە کەم دەبێت**

١- وەرگرتنی دەرمان کە دەبێتە هۆی کێشە لە میز

٢- ئەو ئارەقەی کە بە تەنها بە ئاو پردەبێتەوە

٣- نەخۆشی گورچیلەی توند

٤- رشانەوە سکچون

٥- لەناوچونی جەرگ

٦- نەخۆشی میزی شەکرە

٧- نەخۆشی ئەدیسۆن کە هۆرمۆنی الالدسترۆن دەری دەدات

٨- کەمی دەردانی هۆرمۆنی بەرگری میز کە دەبێتە هۆی نەخۆشی شەکرەی درۆزنە

# Chloride Test

ئەم پشکنینە بریتیە لە دیاری کردنی یان زانینی بڕی ئەم ئایۆنە لە خوێنی نەخۆشەکە، بۆ ئەم شیکاریە شوشەی سەر سور یان سەر زەرد بەکاردێنین.
کلۆر یەکیکە لە ئایۆنە گرنگەکانی لەش و وەکو ئایۆنی سۆدیۆم و پۆتاسیۆم و بیکاربۆنەیت و مەگنسیۆم و هتد.
ئەم ئایۆنە لە دەرەوەی خانەکان و لەناو شلەی شانەکان و خوێندا هەیەو هەڵگری بارگەی سالبە، زۆر پەیوەندی بە سۆدیۆم و ئایۆنی هایدرۆجینەوە هەیە، بەجۆرێک کە یارمەتی گواستنەوەی سۆدیۆم دەدات.
ئایۆنەکان بەگشتی و کلۆریش لەگەڵ ئەوان دەورێکی زۆر گرنگیان هەیە لە زیندە چالاکیەکانی لەش و هەرس و پاراستنی هاوسەنگی ترشی تفتێتی لەش و گورچیلەکان و هاوسەنگی دەلاندنە پەستان و ڕێک خستنی پەستانی خوێن و هتد، هۆکارەکانی وشک بونەوە و کەم خۆراکی و ڕشانەوە و سک چون کاریگەریان لەسەر ڕێژەی ئەم ئایۆنە و ئایۆنەکانی تر هەیە.
لەسودەکانی ئەم شیکاریە بریتیە لە زانینی ڕێژەی ئەم ئایۆنەو دیاری کردنی نەخۆشی و تێکچونی هاوسەنگی ئایۆنەکان و هەروەها زانینی کاریگەری دەرمان .

Chloride Test:-

Normal value :-

Adult :- 98-107 mmol/L

>90 years:- 98-111 mmol/L.

لەم حاڵەتانەدا بەرز دەبێتەوە

١- نەخۆشی Cushing›s syndron

٢- وشک بوونی پێست

Eccessive salt intake -٣
Starvation -٤
Salcylate intoxification -٥

**لەم حاڵەتانەدا نزم دەبێ :-**

١-سکچوون
Vomitting -٢
٣-خراپ مژین واتا پشێویەک لە خۆراک مژین بە شێوەیەکی سروشتی
٤-پەکەوتنی دڵ
٥-نەخۆشی ئەدیسۆن
٦-هەڵئاوسان
٧-کەمی سۆدیۆم
pyloric obstruction -٨
٩- زیان بەرکەوتنی گورچیلە

Chloride Test
Normal value
Adult :- 98-107 mmol/L
>90 years:- 98-111 mmol/L.



# Phosphorous Test

ئەم پشکنینە دەکرێ پێوانی ڕێژەی فۆسفۆرە لە خوێندا، ڕێژەی ئاسایی فۆسفۆر لە لەشدا 2.4 - 4.1 mg/dL، فۆسفۆر ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە تەندرووستی ئێسکەکان و ددانەکان هەروەها گرنگە بۆ گرژبوونی ماسولکە خانەکان و تەندروستی دەمارە خانەکان، هەروەها پەیوەندیدارە بە ڕێژەی کالسیۆم، زۆری لە ڕێژەی فۆسفۆر دەرخەری کێشەیە لە گورچیلەکان و ڕژێنی پاراسایرۆید، چونکە فۆسفۆری زیادە لە ڕێگەی گورچیلەکان دەپاڵێوریێ و دەکرێتە دەرەوە لە ڕێگەی میز.

**هۆکارەکانی بەرزی فۆسفۆر (Hypophosphatemia) بریتییە لە :-**

١- بەکارهێنانی دەرمانی دژە ترشەڵۆک بۆماوەیەکی درێژ

٢- زیاد لە پێویست وەرگرتنی دەرمانەکانی Diuretics میزپێکەرەکان و ڤیتامین D.

٣- ناتەواوی سیستمی خۆراک.

٤- نەخۆشی و ناتەواوی گورچیلە و جگەر.

**هۆکارەکانی کەمی فۆسفۆر (Hypophosphatemia) بریتییە لە :-**

١- بەرزی ڕێژەی کالیسیۆم.

٢- کەمی ڤیتامین D.

٣- ناتەواوی سیستمی خۆراکی.

٤- زیاد دەردانی هۆرمۆن لەلایەن ڕژێنی پاراسایرۆید.

# B2M Test

ئەو پرۆتینەیە کە دەکەوێتە بەشی سەرووی خانەکان. فەرمانی ئیش دەکات وەکو بەشێک کە بەشی یەکەم ئەم پرۆتینە لە زۆربەی بەشەکانی لەش هەیە لە گورچیلە MHC لە ئەندامی بەرگری مرۆڤ پێکهاتووە لە گورچیلەدا دەڕوات B2M لەکاتی خاوێنکردنی وە دوایی دەگەرێنرێتەوە بە هۆی بۆریەکانی کە نزیکن لە گورچیلە، وە عادەتەن بەشێکی کەمی لە میزدا هەیە، بۆریەکانی گورچیلە توشی زیان دەبێت لە میزدا بەهۆی ئەوەوە دەبی B2M برین یان هەوکردنێک بێت کە بۆریەکانی گورچیلە توانای ناردنەوەو هەڵمژینی ئەو پرۆتینەیان نییە. یان ئەگەر Glomerulis لە گورچیلە توشی نەخۆشی هات ئەوا ناتوانی گورچیلە خاوین بکەنەوە و لە خوێندا بەرز دەبێتەوە. ئەگەر نەخۆشەکە چاندنی (زرعی) گورچیلەی B2M بگەڕێنیتەوە ئەوا ئاستی ئەم پشکنینەی بۆ کرابوو ئەنجامی ئەم پشکنینە زۆر بێت لەم حاڵەتەدا ئەم پشکنینە مانای ئەوەیە کە لاشەی ئەم نەخۆشە ڕەفزی گورچیلەکە دەکات.

ئەگەر لە هەردوو شوێن زیاد بوو ئەوا دەلالەت لە بونی هەندێ نەخۆشی دەکات:-

١- شێرپەنجەی خوێن ٢- شیرپەنجەی غودەی دەرەقی

**لەم حاڵەتانە دەبێتە هۆی بەرز بوون:**

١- کەمی بەرگری بەردەوام ٢- ژەهراوی بون بالامینو غلیکوزیدات ٣-نەخۆشی کرون ٤- ئلتهاباتی جەرگ ٥- نەخۆشی خورکە سپیەکان ٦- هەندی نەخۆشی پیس ٧- بونی چەندان گری ٨- ئیلتهاباتی ئیسک بە شێوەی کیسی ٩-نەخۆشی گورچیلە ١٠-هەوکردنی ملولەی خوێن.

# Folate Test
# VITAMIN B9

ڤیتامین (B9) کە بە (Folate or Folic Acid) ناسراوە، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە کەمی ڕێژەی خوێن و گەورەبوونی خڕۆکە سوورەکانی خوێنەوە هەیە (Megaloblastic Anemia)، پێویستە ڕۆژانە ڤیتامینەکە وەربگیرێت لەڕێگەی خواردنی ڕۆژانە یان وەرگرتنی لە ڕێگەی حەبەوە، بەتایبەت بۆ ئافرەتانی دووگیان یان ئەو ئافرەتانەی دەیانەوێت دووگیان ببن پێویستە بڕێکی باش لە ڤیتامینەکە وەربگرن ڕۆژانە، لەبەرئەوەی ڤیتامینەکە توانای توانەوەی هەیە لە ئاودا لە لەشماندا خەزن ناکرێن و بەشێکی لەڕێگەی میزەوە فڕێدەدرێتە دەرەوەی لەش، بۆیە پێویستە بەردەوام خواردنی دەوڵەمەند بە ڤیتامینەکە بخورێت.

**سەرچاوەی خۆراکی دەوڵەمەند بەڤیتامین (B9):**

١- جگەر، زەردێنەی هێلکە، مریشک.

٢- فاسۆلیای وشک، پاقلەمەنیەکان، بادەم، گوێز، نیسک، ماش.

٣- بڕۆکلی، سپیناخ، کاهو، کەلەرم، پۆلکە، چەوەندەر، پەتاتە.

٤-لیمۆ، مۆز، شوتی

٥- کوڵاندنی زیاد لە پێویستی خواردن لە بەهای خۆراکیەکەی کەم دەکاتەوە.

**هۆکارەکانی کەمی ڤیتامین B9**

١- نەخواردنی سەوزە و میوە و خواردنی ئەو خۆراکانەی ڕێژەیەکی کەمی ڤیتامینەکەیان تێدایە هۆکاری سەرەکییە بۆ کەمی ڤیتامین (B9)، هەربۆیە پێویسە ژەمەکان هەمەچەشنەبن.

٢- خواردنی خۆراکی زیاد لە پێویست کوڵێنراو.

٣- بوونی کێشەی تەندروستی و وەرگرتنی هەندێک دەرمان کە دەکرێت زیانی لاوەکیان هەبێت.
٤- دووگیان بوون.

## نیشانەکانی کەمی ڤیتامین B9

کەمی ڤیتامینەکە دەکرێت ببێتە هۆی کۆمەڵێک کێشی تەندوستی:
١- ماندووی و بێهێزی.
٢- تێکچونی ڕەنگی قژ (سوتانی قژ)
٣- هەڵئاوسانی زمان.
٤- دروست بوونی برینی ناودەم.

**دەکرێت ببێتە هۆی کەم خوێنی و کۆمەڵێک نیشانەی تر هەست پێبکرێت:**
١- سەرگێژخواردن.
٢- هەستکردن بە سەرما.
٣- زوو توڕەبوون.
٤- سەرئێشە و دڵ پەلەپەل کردن و هەناسە بڕکێ (بەبێ هیچ هۆیەک)
٥- ڕەنگ پەڕین.
٦- سکچوون و دابەزینی کێش و نەمانی ئارەزوو خواردن.
٧- تێکچونی باری دەرونی و نەمانی تەرکیز.

دەستنیشانکردنی بڕی ڤیتامین (B9) لەڕێگەی شیکاری خوێنەوە دەکرێت، کە پێویستە ئەنجام بدرێت بۆ هەرکەسێک کە یەکێک یا زیاتر لە نیشانەکانت هەستپێکرد بۆ ماوەیەکی درێژ، یان بۆ ئافرەتانی دووگیان لەپێناو تەندروستی خۆی و کۆرپەکەیدا.

# Alkaline Phosphatase Test

ئەم پشکنینە پێوانی بڕی ALP یە لە خوێن دا، ALP یان Alkaline phosphatase بریتییە لە ئەنزیمێک کە لە لەشماندا هەیە، بەڵام بەزۆری هەیە لە جگەر و ئێسک و گورچیلەکان و سیستمی هەرسکردن، کاتێک جگەر زیانی بەربکەوێت یان بەباشی فەرمانەکانی ئەنجام نەدات ئەوا ئەم ئەنزیمە (ALP) دەچێتە ناو خوێنەوە، بۆیە بەرزی ڕێژەی (ALP) لە پشکنینی خوێن دا دەرخەری نەخۆشییەکانی جگەر یان ئێسکە. بۆیە لەکاتێک نیشانەکانی نەخۆشی جگەر و ئێسک دەرکەوت ئەوا وا پێویستە ئەم پشکنینە ئەنجام بدرێت.

نیشانەکانیش بەم شێوەیەن:-

**نیشانەکانی نەخۆشی جگەر بریتیین لەمانە:-**

١-زەردوویی، حاڵەتێکە نەخۆشەکە ڕەنگی پێست و چاوی بەرەو زەردبوون دەڕوات .

٢-لاوازی و کەم توانایی .

٣-کەمبوونی کێش.

٤- نەمانی ئارەزووی خواردن.

٥-تاریکبوونی ڕەنگی میز.

٦- زەردباوبوونی ڕەنگی پیسایی.

**نیشانەکانی نەخۆشییەکانی ئێسک ئەمانەن:-**

١-بوونی ئازار لە ئێسک یان جوومگەکان.

٢- گەورەبوون یان نائاسایی بوونی شێوەی ئێسکەکان.

٣- زیادبوون و دووبارەبوونەوەی شکانی ئێسک.

بۆیە بەرزی ڕێژەی ALP لەم پشکنینەدا دەرخەری یەکێک لەم حاڵەتانەیە لە جگەردا، وەک :-

١- نەخۆشی جگەر جۆری Cirrhosis.

٢- هەوکردنی جگەر.

٣- بلۆک بوون یان گیرانی ڕێڕەوی شلەی بایل (Bile duct blockage).
٤-حاڵەتی Mononucleosis کە هەندێ جار جگەر دەئاوسێت.

**تێبینی:** هەروەها لەگەڵ ئەم پشکنینەدا چەند جۆرێکی دیکەی پشکنین هەیە کە ئەنجام دەدرێت بۆ هەڵسەنگاندنی تەندروستی و فەرمانی جگەر، ئەو پشکنینانەش بریتین لە بیلیروبین (Bilirubin) و AST و ALT، ئەگەر ئەنجامی ئەم پشکنینانە ئاسایی بوون، بەڵام ڕێژەی (ALP) بەرز بوو ئەوا ئەگەری بوونی نەخۆشی لە جگەردا نی یە، بەڵکوو دەکرێت پەیوەندی بە تێکچوون و نەخۆشییەکانی ئێسکەوە هەبێت، وەک نەخۆشی Paget›s Disease of bone ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی لاوازبون یان گەورەبونی نائاسایی و زوو شکان.

**تێبینی:** کەمی لەڕێژەی ئەم پشکنینە (ALP) ئەوا نیشانەی کەمی فۆسفاتە، یان هەندێ نەخۆشی بۆماوەیی کە کاریکاتە سەر ئێسک و ددانەکان، هەروەها کەمی لە ڕێژەی (ALP) لەوانەیە هۆکاری کەمی ماددەی زینک بێت یان خراپی سیستمی خۆراکی و خراپ خۆری.

**ڕێژەی ئاسایی ئەم پشکنینە:- ( 44 - 147 IU/L ).**

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا لە هەندێ حاڵەتدا ڕێژەی ئەم پشکنینە (ALP) ئەگۆڕێت، بۆنموونە لە کاتی دووگیانیدا زۆرجار ڕێژەی ئەم پشکنینەبەرزە، یان لە منداڵاندا چوونکە ئێسکەکانیان لە گەشەدان، بەڵام بەکارهێنانی حەبی دووگیان نەبون لەوانەیە ببێتە هۆی کەمی لە ڕێژەی ئەم پشکنینە.



# TSB TEST
# DSB Test
# Total and direct bilirubin blood

**ئایا هۆکار و چارسەری نەخۆشی زەردووی چیە؟**

نەخۆشی زەردوی جۆریکە لەونەخۆشیانەی کە چینێکی کۆمەڵگای گرتۆتەوە بە گەورەو بچوکەوە، هۆکاری نەخۆشی زەردووی لە گەورەو منداڵدا، دەگەڕێتەوە بۆ زیاد بوونی مادەی (البیلیرۆبین) لە خوێندا، کە ئەم مادە بیلیرۆبینە پێکهاتەیەکی زەردی هەیە.

**مادەی بیلیرۆبین چیە؟؟ چۆن درووست ‌‌‌‌‌‌‌‌‌.. بێت؟**

مادەی بیلیرۆبین مادەیەکە کە پێکهاتەکەی ڕەنگێکی زەردی هەیە، لەژێر پێستدا دەنیشێت و ڕەنگی پێست لە ڕەنگی ئاسای خۆیەوە دەگۆڕێت بۆ ڕەنگی زەرد، ئەم مادەیە لەشی مرۆڤ بەشێوەیەکی ئاسایی دروستی دەکات،لە ئەنجامی تێکشکاندنی خڕۆکە سوورەکانی ناو خوێن (RBC)وە درووست دەبێت، جگەریش هەڵدەستێت بە وەرگرتنی ئەو مادەیەو لە ڕێگەی پیسایيە وە فڕێی دەداتە دەرەوە، لە ئەنجامی ئەمکارە ڕێژەی ئاسایی بیلیرۆبین دەمێنێتەوە لە سنوری ئاسایی لەشدا، واتە ڕێژەی زۆری بیلیرۆبین لە لەشدا کەم دەبێتەوەو جگەر لەش ڕزگار دەکات لە زۆربوونی مادەی بیلیرۆبین، کە دەبێتە هۆی زەردووی.

ئەم حاڵەتە لەمنداڵدا زۆر دەردەکەوێت، بە تایبەتی ئەو منداڵانەی کە تازە لەدایک دەبن، زۆربەی جار بەتەواوی هەست بە نیشانەکانیان دەکرێت و دەبینرێن کە ڕەنگی پێست و ڕەنگی ناو چاویان زەردیەکی تەواو دای دەپۆشێت، ئەم جۆرە نەخۆشیەش لە وڵاتی خۆمان ناو دەبرێت بە نەخۆشی (زەردووی)، لە چەند وڵاتێکی تریش ناو دەبرێت بە (الیرقان)، زۆربەی جار ئەم نەخۆشیە دوای یەک ڕۆژ لەمنداڵی تازە لە دایکبوو دەردەکەوێت، یان دوو ڕۆژ یان سێ یان چوار ڕۆژ ئینجا دەردەکەوێت، ئەگەر نەخۆشی زەردووی لەگەڵ لەدایکبوونی منداڵەکەدا دەرکەوت، ئەوا پێویستە

منداڵەکە لە نەخۆشخانە بهێڵرێتەوە بۆ وەرگرتنی چارسەر، وە هۆکاری توشبوونی بە زردوویەکە دیاری بکرێت و چارسەری هۆکاری توشبوونەکەش بکرێت بە تەواوی ئینجا لە نەخۆشخانە دەربچێت.

## هۆکاری توشبوون بە نەخۆشی زەردووی چیە؟

بێ گومان هۆکاری تووش بوون بە نەخۆشی زەردووی زۆرن، بەڵام گرینگترین هۆکارەکان بریتین لە زەردووی فیسۆلۆجی ئەم هۆیەش دەتوانرێت پێی بڵێین کە زۆرترین حاڵەت و دەگەڕێتەوە بۆ بوونی کێشە لە جگەری منداڵی تازە لە دایکبوودا، یان بە باشی جگەری منداڵەکە کار ناکات و وەکو پێویست نیە بۆ ئیشکردن یان وەکو پێویست جگەری منداڵەکە درووست نەبووە، بۆیە لەم کاتەدا جگەر ناتوانێت وەکو پێویست مادە زیادەی البیلیرۆبین وەربگرێت وفرێی بداتە دەرەوە لەلەش، ئەم حاڵەتەش لەو منداڵانەدا زیاتر بەدی دەکرێن کە نەبەکامن و پێش وەخت لە دایک دەبن.

هەروەها زیادبوون و دروست بونی مادەی البیلیرۆبین لەو قۆناغی ژیانی منداڵەکەدا، بەهۆی زیادبوونی مادەی (هیمۆگلۆبین)ەوەیە لەکاتی لەدایکبوون و زیادبوونی وەرگرتنی مادەی (البیلیرۆبین)ە لە ڕیخۆڵەکان لەکاتی زیاد بوونی ئەو مادەیەش، دەبێتە هۆی زەرد بوونی ڕەنگی پێست و ڕەنگی چاوی منداڵەکە، شیری دایکیش جاری وا هەیە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ئەو نەخۆشیە، لەبەر ئەوەی شیری دایک دەبێتە هۆکاری سەرەکی بۆ وەرگرتنی مادەی (البیلیرۆبین) لە ڕیخۆڵەکانەوە کە دووبارە دەگەڕێتەوە ناو خوێن.



**چارەسەری نەخۆشی زەردووی چیە ؟**
دکتۆرەکان بۆچارەسەرکردنی نەخۆشی زەردووی چەند تەریقەیەک و چەند جۆر چارەسەرێک بەکار دەهێنن ئەوانیش، بریتین لە:-

**١ . بەکارهێنانی فۆتۆ سێراپی:** واتە بەکارهێنانی لایتێکی شینە بۆ ئەو منداڵانەی کە توشی نەخۆشی زەردووی بوون ئەمە زیاتر لە خەستەخانەکاندا دەبینرێن، کە جاران لەجیاتی ئەم فۆتۆسێراپیە، دکتۆرەکان پشتیان بە تیشکی خۆر دەبەست.

**٢. قەترەی ڤیتامین دی سری:** هەندێک لە دکتۆرەکان قەترەی ڤیتامین دی سری دەنوسن بۆ ئەومنداڵانەی کەتوشی زەردووی بوون، عیلمیش سەلماندوویەتی کە ڕۆژانە مرۆڤ خۆی بەداتە بەر خۆر کۆرسترۆڵی جسم دەگۆڕێت بۆ ڤیتامین دی کەواتە ئەم تەریقەیە جۆرێکە لەو تەریقەیەی خاڵی یەکەم ،بەڵام ئەو بە ڕۆشنایی و خۆدانە بەر خۆر واتە ڕێگەیەکی سرووشتیە، ئەم بە دەرمان و بە قەترە.

**٣. گلوکۆز پاودەر:** هەندێک لە دکتۆرەکانیش گلوکۆز پاودەر بەکار دەهێنن بۆ ئەو کەسانەی کە نەخۆشی زەردوویان هەیە.



# Inflammation test
# پشکنینی هەوکردنەکان

## CRP Test
## C - Reactive Proten

پشکنینی خوێنە بەکاردێ بۆ دیاریکردنی هەوکردنی ناو لەش . CRP پرۆتینێکە لە لایەن جگەرەوە دروست دەکرێت، بەرزبونەوەی ڕێژەی ئەم پرۆتینە لە ناو لەشدا بۆ سەروی gm/dl 3 ئەوە دەردەخات کە ئەو کەسە توشی هەوکردن بووە لە شوێنێکی لەشیدا، بەڵام ناتوانینن لە ڕێگەی ئەم پشکنینەوە شوێن و هۆکاری توش بونەکە دیاری بکەین.

**هۆکارە سەرەکیەکانی بەرزبونەوەی C - Reactiv proten:**

١- سوتان.
٢- کۆستی دەرونی.
٣- هەوکردن
٤- سەکتەی دڵ.
٥- هەوکردنی ڕیخۆڵەکان.
٦- شێر پەنجە.
٧- هەوکردنی درێژ خایەن وەک ڕۆماتیزمە.

**شێوازی ئەنجامدانی پشکنینەکە:-**

١- سەرەتا خوێن لە کەسەکە وەردەگرین و دەیکەینە ناو jell Tube (تیوبی سەر زەرد) پاشان خوێنەکە centerfuge دەکەین بۆ دەست کەوتنی سیرەم (ئاوگ).
٢- پاشان یەک دڵۆپ لە سیرەمەکەو یەک دڵۆپ لە گیراوەی تایبەت بە پشکنینیەکە (CRP Reagent) دەکەینە سەر وەرەقەی تایبەت بە پشکنینەکە

(وەک ئەو وەرەقە ڕەشەی کە لە وێنە کەدایە).

٣- دواتر بە Stirerێک سیرەمەکەو گیراوەکە تێکەڵ دەکەین و بۆماوەی ٢ خولەک چاوەڕێ دەکەین، ئەگەر agglutination ڕویدا واتە کلۆت بوون ئەوا ئەو کەسە توشی ئیلتهابات بووە لە شوێنێکی لەشیدا.

بەڵام ئەگەر no agglutination بوو، واتە کلۆت نەبوون ئەوا ئەو کەسە هیچ ئیلتهاباتێک لە لەشیدا نییە.



# Brocellosis Test
## حەمەی مالتا

### شێوازی ئەنجامدانی پشکنینەکە Rose Bengal Test.

حەمەی مالتا نەخۆشیەکی ئاژەڵیە بە هۆی گروپێک لە بەکتریا لە چینی Brocella دروست دەبێ، وە توانی توشکردنی مرۆڤ و ئاژەڵیشی هەیە بە نەخۆشی. چەند جۆرێکی جیاواز لە ئاژەڵ وەک (مەڕ و بزن و بەراز و سەگ و مانگا) دەبنە هۆی دروست بوون و گواستنەوەی ئەم نە خۆشیە . کە مرۆڤ لە ڕێگەی نزیک بونەوە یان خواردنی شیر و گۆشت و بەرهەمەکانیان توشی ئەم نەخۆشیە دەبێت و بۆی دەگوازرێتەوە، بۆ خۆ پاراستن لە مەترسی توش بوون بەم نەخۆشیە پێویستە دەست لە ئاژەڵی مرداربوو نەدرێت و هەروەها شیر و گۆشتەکانیان بە باشی بکوڵێنرێت و خاوێن بکرێتەوە پێش خواردن و بەکارهێنانی.

### نیشانەکانی نەخۆشی حەمەی مالتا (Symptoms of Brocellosis)

١- تایەکی پچڕ پچڕ یان بەردەوام تا
٢- سەر ئێشە.
٣- بێهێزی.
٤ - ئارەقە کردنێکی زۆر.
٥- موو چرکە ساردی .
٦ - ئازاری جومگەکان.
٧- دابەزینی کێشی لەش.




### ئەم پشکنینە بە چەند ڕێگایەک ئەنجام دەدرێت

١- Rose Bengal Test by Rapid Slide agglutination (Screening) Test.
٢- Rose Bengal Test by Tube agglutination Test.
٣- Brocella ( IgG /¬ IgM ) by immunochromatographic assay.

٤- Mercaptomethanol Test (Me).

٥- Elisa ( IgG / IgM ).

٦- ECL ( IgG / IgM).

٧- PCR ( Polymerase Chain Reaction ).

## شێوازی خوێندنەوەی ئەنجامەکە:

١- Negative وەتە کلۆت بوون ڕوی نەداوە لە نێوان سیرەم و antigen کەداو واتە کەسەکە توش نەبووە بە نەخۆشیەکە.

٢- Positive واتە کلۆت بوون ڕوویداوە لە نێوان سیرەم و antigen کەدا واتە کەسەکە توش بووە بە نەخۆشیەکە. بەم شێوەیە ڕێژەی توش بوونەکەشی دیاریدەکەین.

- ئەگەر کلۆت بوونەکە لە ١٥ چرکەی سەرەتا بوو ئەوا بە ٦٤٠/١ دەنوسرێ.
- ئەگەر کلۆت بوونەکە لە ٣٠ چرکەی سەرەتا بوو ئەوا بە ٣٢٠/١ دەنوسرێ.
- ئەگەر کلۆت بوونەکە لە ماوەی خولەکێکدا بوو ئەوا بە ١٦٠/١ دەنوسرێ.
- ئەگەر کلۆت بوونەکە لە ١:٣٠ سەرەتا بوو ئەوا بە ٨٠/١ دەنوسرێ.

ئەم نەخۆشیە بە چەند ناوێکی تر دەناسرێتەوە :-

١-. Malta Fever.

٢- Undulant Fever.

٣- Mediterranea Fever.

٤- Rock Fever Of Gibraltar

٥- Gastric Fever.

# Typhoid Fever Test

## پشکنینی گرانەتا

ئەم پشکنینە بۆ گرانەتا دەکرێت بە هۆی بەکتریای Salmonela Typhi کەسەکە توش دەبێت، ئەم پشکنینەش بە Strip ئەنجام دەدرێت بەڵام جیاواز لە Strip کانی تر ئەم لە ٣ هێڵ پێک دێت (control , IgM , IgG).

بەم شێوەیەش ئەنجامەکەی دەخوێنینەوە:-

ئەگەر تەنها Control دەرکەوت ئەوە ئەنجامەکەی Negative واتە کەسەکە توش نەبوە بە گرانەتا.

ئەگەر control و IgM دەرکەوت ئەوا کەسەکە سەرەتای توش بوونیەتی بە گرانەتا.

ئەگەر control و IgG دەرکەوت ئەوە کەسەکە لە کۆتا قۆناغی توش بوندایە یاخود هەڵگرە. بەڵام ئەگەر contrl و IgM و IgG پێکەوە دەرکەوتن واتە کەسەکە چاک بوەتەوەو دووبارە توش بوەتەوە بە گرانەتا.

## نیشانەکانی نەخۆشی گرانەتا:

١- بەرز بونەوەی پلەی گەرمی لەش، هەندێک جار دەگاتە ٤٠,٥ پلەی سەدی.

٢- سەرئێشەو و بێ هێزی و ئازاری ماسولکەکان

٣- کۆکە و نەمانی ئیشتیهای خواردن و لەدەستدانی کێشی لەش.

٤- سک ئێشە و سکچوون



# ASO Test
# ANTI STREPTOLYSIS

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ دیاری کردنی ئەو نەخۆشەی توشبوە بە بەکتریای streptococcus بۆ دیاری کردنی نیشانەکانی وەک تای رۆمانتیزم و هەوکردنی سەر گورچیلە کە شێوەیەکە لە شێوەکانی نەخۆشی گورچیلە

ASO: دژە تەن کاردەکاتە سەر STREPTOLYSIS ئەنزیمێکی ژەهراویە دەردەدرێ لە لایەن کۆمەڵەی STREPTOLYSINO .

لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بەکتریاکە دیاری دەکرێ وە چارەسەر دەکرێ لە هەندێ حاڵەت کە نیشانەکان دیار نابن نیشانەکان زیاتر دەبن وە بەهۆی تای رۆمانتیزم و ئیلتهاباتی سەر گورچیلە بە تایبەت لە لایەن منداڵانەوە .

لەبەر ئەوە داوا لە کەسەکە دەکرێ کە دەناڵێنی بە دەست نیشانەکانی تای رۆمانتیزم بۆیە داوا دەکرێ ئەم پشکنینانەش بکات.

١- هەوکردنی تای قورمزی

٢- بەکتریای قورگ

بە هۆی بونی هەوکردنی لەوزەتین و هەوکردنی پێست

کەی ئەم پشکنینە دەکرێ (نیشانەکان)

١- تا

٢- ئازار لە سینگ

٣- تەنگە نەفەسی

٤- رەنگی میز لێل دەبێ کە بەستراوە بە هەوکردنی سەر گورچیلە.

**هەندێ نیشانەکان تای رومانتیزم:-**

١- تا

٢- ئازارو ئەستور بونی پێیەکان یان بەشەکانی تر

٣- دروست بونی گرێی بێ ئازار لەبن پێست
٤- قلیشانی پێست
٥- لە هەندێ حاڵەت لەوانەیە دڵ ئیلتهاب بکات:-
ا- تەنگە نەفەسی
ب- لیدانی دڵ بەخێرای ج-ئازاری سینگ

**هەندێ نیشانەی سەر گورچیلە :-**

١-بێ تاقەتی و ماندووی ٢-کەم کردنی میز ٣-میز کردنی خوێناوی ٤-قلیشانی پێست ٥-ئازاری مفاسل ٦-بەرزی پەستانی خوێن .

**تێبینی:** دوای کردنی پشکنینەکە و چارسەر کردنی دوای چارسەر کردنی ئەبێ پاش مانگێک بکرێتەوە ئەگەر هەر ئەرێنی بوو بۆیە پێویستە چەند پشکنینێکی تری بۆ بکرێت.



# VDRL Test
# Venered disease research laboratory

نەخۆشیەکی گواستراوەیە دەگوازرێتەوە لە رێگەی جووت بون کە بەهۆی بەکتریای (Trepnema palidum)

**رێگاکانی توشبون بەو نەخۆشیە ئەمانەن**

١- گواستنەوەی لە رێگای جووتبون

٢- لە رێگای دایک بۆ منداڵ

٣- لە رێگەی گوستنەوەی خوێن لە پیاوان

٤- بەهۆی کاری جووت بونەوە زیاتر توشی ئەسمەران دەبێ .




**بە سێ ئاست تێدەپەرێ ئەم نەخۆشیە**

**ئاستی یەکەم:** دیاردەی سەرەکی سەرهەڵدانی شەقبون وبەڵەی سورە لەسەر پێستو ئەندامی زاوزێی لەپیاوشیوەی بازنەی لە ئافرەت دا شێوەی گوڵە لە ئەندامی زاوزێ لە ناو رەحم دێت وە کەمێک لە نەخۆشەکان لە لێوەکان و قورگ و زمان سینگ دەبێت.

**ئاستی دووەم:** ئەو نیشانانەی کە لە ئاستی یەکەم باس کرا کار دەکاتە سەر چاو جەرگ ومێشک و ئیلتهاباتی مفاصل وە هەڵوەرینی قژ.

**ئاستی سێیەم:** ئەم ئاستە بە ئاستی رەنگەکان دەناسرێ کە کاردەکاتە سەر پێست و ئێسک وە لەو ئاستە کار دەکاتە جیهازی گرنگ یەکەم جهازی مێشک دەبێتە هۆی لە دەست دانی هەستەوەر و شەلەل بون وە جهازی سوری خوێن کە دەبێتە هۆی لەکارکەوتنی دڵ، ئەو نەخۆشیە دیاری دەکرێ ئەگەر ئەزێنی دەرچوو ئەوا بۆ دڵنیا بوون.



# ESR Test
# Erythrocyte Sedimentation Rate

بریتیە لە نیشتنی خڕۆکە سورەکانی خوێن لە ماوەی یەک کاتژمێردا بە mm/hr دەپێورێت. ئەم پشکنینە تایبەت نیە بە نەخۆشیەکی دیاریکراو، بەڵام یارمەتیمان دەدات لە دیاریکردنی چەند جۆرێکی نە خۆشی، لە کاتی بەرز بونەوە ڕێژەی ESR ئەوە دەر دەخات کە ئەو کەسە یەکێک لەم نە خۆشیانەی هەیە:-

١- ڕۆماتیزمە.
٢- بونی ئیلتیهابات (هەوکردن)
٣- نەخۆشی کەمخوێنی (Anemia).
٤- شێر پەنجە.
٥- نەخۆشی بەرگری دژە خۆی (autoimmune Disease).
٦- لە کاتی دووگیانیشدا ڕێژەی ESR بەرز دەبێتەوە.

ڕێژەی ئاسای .... Normal Range
بۆ پیاو .......... 0 – 10 mm/hr
بۆ ئافرەت ........ 0 - 20 mm/hr

**نیشانەکانی بەرز بوونەوەی ئەم پشکنینە:-**

١ ئازاری جومگە.
٢ تا.
٣ شەکەتی.
٤ ئیلتیهابات.
٥ هەڵەشە.
٦ سەر ئێشە.

**ئەو دەرمانانەی کە دەبنە هۆی دابەزین و کەمکردنەوەی ESR:-**

١- aspirin

٢- cortisone

٣- quinine



# PCT Test
# Procalcitonin

ئەو مادەیە دەردەدرێ لەلایەن لەش لە چەندین خانەی لەش بۆ وەڵام دانەوەی کاتی توشبونی بە بەکتریا وە لە ناوچونی شانە بە شێوەیەکی زۆرو بەربڵاو زیاد دەبێت کاتێک لەش توشی بەکتریا دەبێت و توشی پیس بونی دەبێت، ئەم پشکنینە بەکاردێ بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ جیاکردنەوە توش بون بەهۆی بەکتریا یان هەر هۆیەکی تر.

**ئەم پشکنینە بۆ چ دەکرێت:**

١- بۆ زانینی بونی جراثیم لە خوێن و ژەهراوی بونی خوێن لە هەرزەکار و منداڵدا
٢-بۆ زانینی نەخۆشی بەکتریای
٣-بۆ زانینی نەخۆشی بەرگری ناوەندی لە دوای نەشتەرگەری لە حاڵەتی سەدمە یان سوتان یان بونی لەکارکەوتنی لەش لە چەند لایەکەوە
٤-بۆ جیاکردنەوەی ئیلتهاباتی پەردەی مێشک لە جراثیم و ڤایروسی
٥-بۆ جیاکردنەوەی ئیلتهاباتی سییەکان لە رێگای ڤایرۆس و بەکتریای توش بوە الانتان: وەڵام دانەوەی ئیلتهابی ترسناکە لە لایەن لەش کە هەندێ جار هەڕەشە لە ژیان دەکات.

**نیشانەکانی بونی الالتتان:**

١- لەرزوو تا
٢- بونی بۆنی ئارەقەیەکی زۆر لە پێست
٣- بونی ئازارێکی زۆر و نارەحەتی
٤- خێرا هەناسەدان
٥- خێرا لێدانی دڵ
٦- کەم بونەوەی مێز کردن ٧-شێواوی

**تێبینی:** لەوانەیە ئەم پشکنینە داوابکرێ کاتێک کەسەکە توشی ئیلتهابی سییەکان و ئیلتهابی قورگ دەبێ وە نازانرێ کە بەهۆی بەکتریا یان جرثومی یان داوا دەکرێ کاتێک منداڵ توش بوە بە نەخۆشی ڕێڕەوی میز، بەرز بوونی ئەم پشکنینە واتا توشبوونە بە ژەهراوی بوون و هەروەها کاریگەری دەکات ئەوا بەرەوپێش چوون هەیە بۆ توش بوون بە الانتان بوونی بە شێوەیەکی بەرز کە ئەمەش دەلالەت لە توشبون بە نەخۆشی بەکتریای وەک التهابی پەردەی مێشک دەکات .



# Monospot (Heterophil Ab) Test

ڤایرۆسی البیشتاین بارە کە بە نەخۆشی ماچ ناسراوە، چونکە بە دەست دان بە هەر شتێک کە ئەو ڤایرۆسەی لەسەرە پێ دەگوازرێتەوە بە تایبەت لە یاری منداڵاندا ئەم ڤایرۆسە باوە زیاتر لە منداڵان دوای تەمەنی یەک ساڵی دەناسرێتەوە بە تای بەرز کە بە بەربڵاوترین ڤایرۆسی دادەنرێ لە ناو چینی هەرزەکار وە عادەتەن نەخۆشیەکە پتر لە مندال داناسرێ خۆی چاک دەبێتەوە لە ماوەی مانگێک یان دوو مانگ، ئەم نەخۆشیە دەناسرێتەوە بەوە کە نەخۆش:

١-تای بەرز بێت

٢- ئازاری قورگی هەبێت

٣- ئەسور بونی فاتە رەشە

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

١- تا

٢- هەوکردنی گەروو

٣- گەورەبونی غودەی لیمفاوی لە گەروو سک

٤- ئارەقەکردنی شەوانە

٥- هەروەها هەندێ جار ئلتهابی جەرگ گەورەبونی فاتە رەشە لەگەڵە.

**هۆکار:** بەهۆی توش بوون بە ڤایرۆسی البیشتاین بار کە لە خێزانی ڤایرۆسی هێرپیسە

ئەو کەسانەی کە ئەگەرێکی زۆرە ئەم نەخۆشیە بگرن :

١- ئەو هەرزەکارانەی کە لەتەمەنی سەروی١٥-٣٠ ساڵ بێت

٢-یاریدەدەری پزیشک

٣- ئەم مرۆڤانەی چارەسەر دەخۆن بۆ سفر بونی بەرگری.
بۆ دیاری کردنی ئەم پشکنینە پێویستمان بە کردنی پشکنینی cbc کە یەکێکە لە هەرە گرنگەکانی wbc کە گرنتی ئەم ڤایرۆسە بۆ زیاتر دلنیا بونەوەی پشکنینی دژە تەنەی بۆ دەکرێ دژی ئەم ڤایرۆسە .

**چارەسەر:** چارەسەرێکی تایبەت نییە کە چارەسەری ئەم ڤایرۆسە بکات لەگەڵ ئەوەش دکتۆر چارەسەری کورتیکوستیروید دادەنێ وە بۆ کەم بونەوەی ئیلتهابەکە:
١- غرغرەکردنی بە ئاو خوێ
٢- ئیسراحەتێکی زۆر
٣- هێشتنەوەی لەش بە تەری بەهۆی خواردنەوەی ئاو
ئەم نەخۆشیە زیاتر یان باوترە کە نابێتە هۆ ترس لە سەر ژیانی نەخۆش
دەبێتە هۆی ئیلتهابی لەوزەتێن یان جیوب یان ئیلتهابی گەروو، بەڵام هەندێ جار دەبێتە هۆی گەورەبونی فاتەرەش و ئلتهابی جەرگ کە ئەمەش لەوانەیە مەترسی لەسەر ژیانی نەخۆشەکە دروست بکات.
١- گەورەبونی فاتەرەشە پێویستە نەخۆشەکە بۆ ماوەی هەر تا مانگێک هەڵنەستێ وە شتی گران قورس هەڵنەگرێ ئەگەر نا دەبێتە هۆی درانی یان تەقینی فاتەرەشە، ئەگەر هەستی بە ئازارێکی زۆر ئەبێت یەکسەر بچێتە لای دکتۆر.
٢- ئیلتهابی جەرگ واتە توشبوە بە هەوکردنی جەرگ وە زەرتکی چاو پێست.

**کاریگەری خراپی ئەم نەخۆشیە**
١- کەم خوێنی
٢- کەمی پەرەی خوێن
٣-گ ەورەبونی لەوزەتێن
٤- هەوکردنی پەردەی مێشک

# PPD Test
# Tuberculin

پشکنینی تیوبەرکولین سەرەتا ئەم ناوەی لێنراوە لە مەجالی پزیشکیە واتا ئەستور بون و رەق بونەوەی سوربونەوەی شوێنێکی لەش بەهۆی بوونی هەوکردن. پشکنینی تیوبەرکولین بەکاردێ بۆ دیاری کردنی نەخۆشی سیل لە رێگەی لێدانی دەرزی توبروکلین لە ژێر پێست کە ٥ جار (٠.٥ مل) لێدەدرێ وە پاش ٤٨ تا ٧٢ سەعات دەخوێنرێتەوە لە رێگەی پێوانەکردنی تیوبەرکولین لە شوێنی دەرزیەکە بوونی تیوبەرکولین لە شوێنی پشکنینەکە واتە بونی ئەرێنی پشکنینەکە دەگەیەنێت.

سیل: نەخۆشیەکی ترسناکە توشی سیەکان دەبێت کە بەهۆی بەکتریای مفطرة ئەرێنیە بڵاو دەبێتەوە لە هەوا بەهۆی هەناسەدانەوە لەوانەیە بۆ چەند ساڵێک ئەم بەکتریایە بە ناچالاکی بمێنێتەوە لە لەش کاتێک لەش توشی کەمی بەرگری دەبێت بەکتریاکە چالاک دەبێت.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە:**

١-تا ٢- کەم بونی کێش ٣-ئارەقەکردنی شەوانە

دەرزیەکە پرۆتینێکی تێدایە کە هەیە لە بەکتریای سیل لە ژێر پێست دوای ٤٨-٧٢ سەعات کە وەڵام دانەوەی سوربون و ئەستور بونی جێگەکەی لێ دەردەکەوێ ئەگەر ئەم نەخۆشیەی هەبێت.

**ئەم پشکنینە لە کاتی دووگیانی دەبێت ؟**

و/ بەڵی زۆر ئاسایە چونکە هیچ بەکتریایەکی تیانیە دەرزیەکە تەنیا پرۆتینە .

ئەو دەرمانانەی کە وادەکەن پشکنینە نیگەتیڤی درۆینە دەرکەوێ:

١-کورتیکو ستیرویدات ٢- دەرمانی ژەهراوی بوون (cylotoic)

٣- هەندێ دەرمانی شێرپەنجەی

٤-ئەوانەی دەرزی کامیت -غوین لێدەدرێ دژی نەخۆشی سیل

پاشان دکتۆر داوای
١- ئەشیعە ٢-پشکنینی بەلغەم دەکات
وەڵام نەدانەوەی هەندێ جار هۆکارەکانی بەهۆی هەندی نەخۆشیەوە دەبێت
١-نەخۆشی ئایدز ٢-نەخۆشی شێرپەنجەی ٣-ئەوانەی دەناڵێنن بە دەست کەمی بەرگری ٤- چاندنی بەشی لەش
-وەڵام دانەوەی سەرەتای (٤-٥)مل واتە توش نەبوە بە سیل
-وەڵام دانەوەی ناوەندی (٥-٩)مل بە پۆزەتیف دادەنرێ شک دەکرێ کە توش بوویی بە سیل
لەو نەخۆشانەی کە کەمی بەرگریان هەیە وەک ئایدز وە ئەو نەخۆشانەی کە سترۆیدات وەردەگرن
- وەڵام دانەوەی بەرز (١٠ لە مل بەرزتر) بە پۆسێتیف دادەنرێ ئەگەری هەیە یەکێک لەم نەخۆشیانەی هەیە:
١-نەخۆشی شەکرە ٢-لەکارکەوتنی گورچیلە ٣-ئەوانەی لە مەجالی پزیشکی ئیش دەکەن ٤-ئەوانەی مخدەرات وەردەگری لە رێگەی دەمار ٥- ئەوانەی لە خوار چوار ساڵیدان ٦-ئەوانەی لە سجن یان شوێنە گشتیەکان دان.

**تێبینی:** نابێت شوێنی دەرزیەکە نابێ بشورێ یان پلاستێری لێ بدرێ نابێت بخورینری، چونکە دەبێتە هۆی سور بونەوەو ئەستور بون واباشترە بەفری لەسەر دابنرێ ئەگەر تا ٧٢ سەعات ئاسای نەبۆوە دەبێ پشکنینەکە دووبارە بکرێتەوە .

# Hematology
# زانستی خوێن

## Cbc Test
## Blood film Test
## Complete Blood Count

ئەم پشکنینە بۆ پێوانی پێکهاتە جیاوازەکانی خوێن، کە یارمەتیدەرە لە دیاری کردنی چەند جۆرێکی جیاوازی نەخۆشی وەک (هەوکردن، شێرپەنجە، نەخۆشیەکانی مۆخی ئێسک، کەم خوێنی، تالاسیمیا ... هتد).
پشکنینەکانیش بریتین لە:

**یەکەم: خرۆکە سپیەکان WBC**

پێوانی ڕێژەی خرۆکە سپیەکانە. ژمارەی هەموو خرۆکە سپیەکانی خوێن دیاری دەکات گرنگە بۆ دیاری کردنی چەند جۆرێکی جیاوازی نەخۆشی وەک هەوکردن، شێرپەنجە، نەخۆشیەکانی مۆخی ئێسک، کەم خوێنی، تالاسیمیا ... هتد

**MID (Monocyte)**

پێوانی ڕێژەی مۆنۆسایتەکانە. ڕێژەی مۆنۆسایتەکان بەرز ئەبێتەوە لە کاتی هەوکردنی ڤایرۆسی، زیاد بونی ١-توشبون بە مەلاریا ٢-ئلتهاباتی قۆلۆن ٣-هەندی وەرەم .
کەم بونی ١- شێرپەنجەی خوێن و درکە پەتک

**LYM (Lymphocytes)**

پێوانی ڕێژەی لیمفۆسایتەکانە. هەلدەستێ بە دروست کردنی خانەی بەرگری دژی ئەو ڤایرۆسانەی کە دێنە ناو لەش لەناویان دەبات. زیاد بونی دەبێتە هۆی ١- زیاد بونی Anti tpo، سیل، گرانەتا، شێرپەنجە، کەم بونی دەبێتە هۆی ژەهراوی بون.

**GRA (Granulocyte)**

پێوانی ڕێژەی گرانۆلۆسایتەکانە لە سێ جۆر خانە پێك دێت

**Neutrophil -أ**

گەرهاتوو ئەم ڕێژەیە بەرز بوو نیشانەی شێرپەنجەی خوێنە جۆری

**Granulocytic leukemia**

دەورێکی سەرەکی هەیە لە سیستەمی بەرگری لەش دژی هەموو بەکتریایەک کە دێنە لەش یاخود هەوکردنی بەکتریایە. ڕێژەی نزمیش نیشانەی گرانەتا، حەمەمالطە یان تووش بوونە بە جۆرێکی ڤایرۆس.

**ب- Eosinophil**

ڕێژەی ئییۆسینۆفیل زیادی کرد وەک کاردانەوەیەک بۆ هەستیاری (حەساسیە) یان لە کاتی تووش Eosinophilic بوون بە جۆرێک لە مشەخۆرەکان، یاخود نیشانەی شێرپەنجەی خوێنە جۆری leukemia، ئەگەر زیاد بوو ئەوە ئەگەری هەیە توشی شێرپەنجەی لیمفاوی ببێت

کەم دەبێت ١-حاڵەتی شۆکی دا ٢-پاش نەشتەرگەری

basophils. ◄ بە زیاد بونی هەردووکیان واتە حساسیەی لەشی هەیە.
eosinophils

**ج-Basophil**

ڕێژەی بەیسۆفیل زیاد ئەکات وەک کاردانەوەیەک بۆ هەستیاری (حەساسیە)).



**دووەم: خرۆکە سورەکان RBC**

زیادبونی لە رێژەیی دەلالەت لە زیادبونی خروکە سورەکان دەکات لە خوین دا وە ئەو زیادبونەش دەلالەت لە بونی دوو هۆکار دەکات.هۆکاری راستەقینە:

١- بەهۆی کەمی ئاستی ئۆکسجین کە بەهۆی نەخۆشی دڵ و سیەکان.

٢- بەهۆی زیاد دەردانی هۆرمۆنی الارثرۆبوینین ئەوەش بەهۆی نەخۆشی گورچیلە و جەرگ زیاد دەردەدرێت

٣-بۆ ماوەی هەندێ خێزان هەیە.

٤-بەهۆی نارێکی لە دروستبونی هیمۆگلۆبین

**هۆکاری رێژەیی:** هیچ کارناکاتە سەر پێکهاتەکانی خوێن تەنها پلازما کەم دەکات لە خوێن وە رێژەی هیماتۆکرایت زیاد دەکات ،کەمی لەوانەیە نەخۆشی کەم خوێنی ئەنیمیا بێت وە زۆر جۆر کەم خوێنی هەیە.

**هۆکاری کەمی خروکە سورەکان**

١- خوێنبەربوونێکی زۆر. ٢- کەمی ئاسن . ٣- کەمی ترشی فۆلیک و V.B12.

٤- شێرپەنجەی خوێن ٥- کەموکوری درکە پەتک

**HGB**

پێوانی رێژەی هیمۆگلۆبینە لە خرۆکە سورەکاندا. بۆ دەرکەوتنی نەخۆشیەکان خوێن وەك کەم خوێنی، هەوکردن، کەمی ئاسن لە خوێندا، سك پری..

**HCT**

هێماتۆکریت. پێوانی رێژەی خوێنە. کەمی ئەم رێژەیە دەگەرێتەوە هۆی کەم بەرهەم هێنانی خرۆکە سورەکانی خوێن، شێرپەنجەی کۆلۆن، خوێن بەربوون، کۆستی دەرونی، هەوکردنی جومگەی رۆماتیزمی، تێکشکانی خرۆکە سورەکان

**MCV**

پێوانی تێکرای قەبارەی خرۆکە سورەکانە

قەبارەی بچووك: نیشانەی کەمی ئاسن لە لەش، کەمخوێنی، تالاسیمیا

قەبارەی ناوەند: نەخۆشی درێژ خایەن، نەخۆشی موخی ئێسك، کەم خوێنی..

قەبارەی گەورە: نەخۆشی جگەر، نەخۆشی موخی ئێسك، کەم خوێنی..

**MCH**

تێکڕای بڕی هیمۆگلۆبینە لە خڕۆکەیەکی سوردا. نیشانەی کەمی ئاسن لە لەش، کەمخوێنی، خوێن بەربوون، ناجێگیری شێوەی هیمۆگلۆبین.

**MCHC**

تێکڕای خەستی هیمۆگلۆبینە لە ١٠٠مل خڕۆکەی سوردا. نیشانەی کەمی ئاسن لە لەش، کەمخوێنی، خوێن بەربوون، شێرپەنجە، تووشبوونە بە جۆرێک لە مشەخۆرەکان.

**RDW**

بڕی گۆڕانی قەبارەی خڕۆکە سورەکانە. نیشانەی کەمخوێنی و تالاسیمیا یە

سێیەم: پەرەکانی خوێن Plate late

**PLT**

فەرمانی بەرگری کردنی لەشە لەخوێن بەربون

گەر هاتوو ڕێژەی پەرەکانی خوێن زۆر بوو Thrombocytosis پێوانی ڕێژەی پەرەکانی خوێنە ئەبێتە هۆی مەینی خوێن لە ناو لەشدا کە دەبێتە هۆی جەڵتەی دڵ و مێشك.

گەر هاتوو ڕێژەی پەرەکانی خوێن کەم بوو ئەبێتە هۆی خوین بەربوون Thrombocytopenia لە پووك و لوت و ڕێرەوی میز

**MPV**

پێوانی قەبارەی پەرەکانی خوێنە. قەبارەی پەرەکانی خوین کەم بوو واتە مۆخی خوێن ناتوانی بری تەواوی پەرەکانی خوێن درووست بکات

**PDW**

فراوانی دابەشبونی پەرەکانی خوێنە. بەرزی ئەم ڕێژەیە نیشانەی هەوکردنە، شێرپەنجەیە یاخود کەم خوێنی بەڵام گەر نزم بێت نیشانەی نەخۆشیەکانی موخی خوێنە یان توشبوە بە جۆرێك لە ڤایرۆس.




**تێبینی: ئەو زانیاریانەی کە پێویست هەموو کارمەندێکی تاقیگە بیزانێت !!**

**جۆرێتی لێکدانەوەی ئەنجامەکانی CBC Test (Complete Blood Count)**

١- ئەگەر WBC زیاد بێت و RBC و PLT کەم بێت ئەوە ( Leukemia) واتا شێرپەنجەیە.

٢- ئەگەر WBC زیاد بێت و RBC و PLT ئاسایی بون ئەوا هەوکردنە(التهاب) ە و بەپێی ئەو جۆرەی (WBC) ەکان جۆری هەوکردنەکەی دیاری ئەکرێت، ئەگەر Neutrophils زیاد بێت ئەوا جۆری هەوکردنەکەی (بەکتریا)یە.

Lymphocytes زیاد بێت ئەوا جۆری هەوکردنەکەی (ڤایرۆسی)یە.

Eosinophil زیاد بێت ئەوا جۆری هەوکردنەکەی (هەستیاریە(allergic) یان (parasite)یە.

Monocytes زیاد بێت ئەوا جۆری هەوکردنەکەی glandular fever

Basophils زیاد بێت ئەوا جۆری هەوکردنەکەی Immune disease

٣- ئەگەر RBC زیاد بوو بەڵام WBC و Plat ئاسایی بوون ئەوا (Secondary polycythemia).

٤- ئەگەر Plat و RBC و WBC زیاد بێت ئەوا مانای وایە (Polycythemia Vera)یە.

٥- ئەگەر Plat و RBC و WBC کەم بێت ئەوا مانای وایە (Pancytopenia )یە.

٦- ئەگەر RBC کەم بێت ئەوە(Anemia) یە.

بۆزانینی جۆری کەم خوینی

ئەگەر RBC کەم بێت و هەروەها MCV و MCH و MCHC کەم بێت ئەوا (Microcytic hypochromic anemia)یە کە هەمان نیشانەی ئەم جۆرە کەم خوینیانەیان هەیە

(THALASSEMIA ,,iron deficiency,, chronic disease).

ئە گەر RBC کەم بێت وهەوەها MCV و MCH و MCHC زیاد بێت ئەوا(Macrocytic anemia) یان (megablastic anemia)یە یاخود (Hemolytic anemia)یە کە بەهۆی کەمی ڤیتامین B12 یان B9 .

ئەگەر RBCکـەم بێت وهەوەها MCV و MCH و MCHC ئاسایي بو ئەوا(normocytic)یە.

٧- ئەگەر Platelets کەم بێت ئەوا (Thrombocytopenia)یە.

# G6PD Test
# (Phosphate Dehydrogenase Deficiency-6-Glucose)

پشکنینی ئەنزیمی کە بە نەخۆشی پاقلە ناسراوە
باوترین ئەنزیمە کە لاشە دوچاری کەمبوونەوەی دەبێت، نزیکەی ٤٠٠ ملیۆن کەس بەدەست کەمی ئەم ئەنزیمەوە دەناڵێنن لە جیهاندا، هۆکاری نەخۆشی یەکە بۆماوەییە کە بڕی پێویست لە ئەنزیمەکە بەرهەم ناهێنرێت لە خوێندا. ئەنزیمێکی گرنگە و ڕۆڵی هەیە لە ڕێکخستنی کۆمەڵێک چالاکی کیمیای ناو لەش. هەروەها بەرپرسە لە پاراستنی خرۆکە سوورەکانی خوێن، و هێشتنەوەیان بە چالاکی تا تەمەنی خرۆکەکە تەواو دەبیت (کە تەمەنی خرۆکەی سووری ئاسایی نزیکەی ١٢٠ ڕۆژە) .ئەو نەخۆشانەی کە ئەنزیمەکەیان لە بڕی ئاسایی زۆر کەمترە لەکاتی ئیلتهابات و خواردنی پاقلەمەنیەکان و چەند دەرمانێک دەبێتە هۆی تێکشکانی خرۆکە سوورەکانی خوێن و کەم خوێنی توند . (Hemolytic Anemia).
کەم بوونەوەی خرۆکە سوورەکان دەبێتە هۆی ئەوەی بڕێکی کەم ئۆکسجین لە سییەکانەوە بگاتە شانە و ئەندامەکانی لەش. بەهۆی کەمی ئەم ئەنزیمەوەیە کە منداڵانی تازە لە دایک بوو دووچاری زەردوویەکی توند یان مامناوەند دەبنەوە.

## هۆکاری کەمی ئەنزیمەکە:

کەمی (G6PD) هۆکارێکی بۆماوەیی هەیە. کە جینە توشبووەکە دەکەوێتە سەر کرۆمۆسۆمی (X Chromosome) وە لە یەکێک یان هەردوو باوانەوە دەگوازرێتەوە بۆ نەوەکانیان، پیاوان تەنها یەک (X Chromosome) یان هەیە ئەگەر جینە توشبووەکەی هەڵگرتبێت ئەوا کەسەکە توشبوو دەبێت بە کەمی (G6PD)، بەڵام ئافرەتان دوو (X Chromosome) یان هەیە ئەبێت هەردوو (X Chromosome) کە هەڵگری جینی توشبووبن ئەوساکە کەسەکە توشبوو دەبێت بە کەمی (G6PD) بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە تەنها یەک (X Chromosome) ی هەڵگری جینی توشبوو

بوو، ئەوا خۆی کەسێکی ئاسای دەبێت بەڵام دەکرێت بیگوازێتەوە بۆ منداڵەکانی.
ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە مەترسی توشبوون بە کەمی (G6PD) لە پیاواندا زیاترە. هەروەها لەو کەسانەدا زیاترە کە لە خێزانەکەیاندا کەسانی توشبوو بە کەمی ئەنزیمی (G6PD) بوونی هەیە. هەروەها تووشبوون لە ئافرەتاندا ڕوودەدات لە ئەنجامی لایۆنایزمیشن (Lyonization: X-inactivation).

**نیشانەکانی کەمی (G6PD):**

لە زۆر کەسدا دەکرێت هیچ نیشانەیەکی نەبێت ،تائەوکاتەی دووچار دەبێت بەهەوکردن و بەرکەوتن بەو خۆراک و دەرمانانەی کە بۆ ئەم جۆرە کەسانە دەبێتە مایەی مەترسی، نیشانەکانی دەکرێت دوای چەند هەفتەیەک نەمێنن بەڵام هەندێک جار مەترسی گەورە دروست دەکات و بە دوبارە بوونەوەی هۆکارەکان نیشانەکان سەرهەڵدەدەنەوە.

**نیشانەکانیش بریتین لە :**

١- کەمخوێنی.
٢- دڵ پەلە پەل کردن.
٣- هەناسە بڕکێ یان هەناسە توند بوون.
٤- تێربوونی ڕەنگی میز (زەردێکی تۆخی پرتەقاڵی باو)
٥ - ماندوێتی.
٦- سەرگێژ خواردن.
٧- ڕەنگ پەڕین و زەردهەڵگەڕان.
٨- زەردووی (زەرد بوونی پێست و سپێنەی چاو).

**هۆکارەکانی تووشبوون بەم نیشانانە:**

لەو کەسانەی کێشەی کەمی (G6PD) یان هەیە، تێکشکانی خرۆکە سوورەکانی خوێن(Hemolysis) ڕوودەدات دوای توشبوون بە ئیلتهابات و بەرکەوتن و خواردنی پاقلەمەنیەکان لەوانە(پاقلە، فاسۆلیا، لۆبیا، ماش)، یان خواردنی هەندێک جۆری دەرمان وەک دەرمانی چارەسەری مەلاریان .

دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکە لە ڕێگەی شیکاری خوێن دەبێت بۆ:
١- پشکنینی ئەنزیمی (G6PD).
٢- بینین و دەستنیشانکردنی جۆری کەمخوێنیەکە لە ڕێگەی (Blood Film Examination)، ئایا چ جۆرە تێکشکاندنێکە، دیاریکردنی ژمارە و جۆر و شکڵی خرۆکە سورەکان، وە دەستنیشانکردنی ژمارە و جۆری خرۆکە سپییەکان و خەپلەی خوێن، چونکە هۆکاری دووەم وەک ئیلتهابات نەخۆشی تر دەبێتە هۆی تێکشکانی خرۆکەکانی خوێن.
٣- شیکاری (Reticulocytes Count) زۆر دەبێت.
٤- شیکاری (Direct Coombs Test) لەوانەیە پێویست بێت نەوەک هۆکاری بەرگری لەش بێت و ببێتە هۆی تێکشکاندنەکە.
٥-شیکاری فەرمانی جگەر (Liver Function Test)

**خۆپاراستن :**

چارەسەر و خۆپاراستن لە ڕێگەی دوورکەوتنەوە لە و خۆراک و دەرمانانەوە دەبێت کە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی نیشانەکان و مەترسین بۆ ئەو کەسانەی کە کەمی (G6PD) هەیە. و دیاریکردنی لیستی ئەو خۆراک و دەرمانانە لەلایەن دکتۆری تایبەتمەندەوە..



## Indirect Coombs Test

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ شیبونەوەی خوێن (کەم خوێنی) لە حاڵەتی کەم بونی خڕۆکە سورەکان کە بەهۆی بەرگری خودی شی دەبنەوە یان بەهۆی شکانی بەرگی خڕۆکە سورەکان کە دەبێتە هۆی لەناوبردنی خانەی خڕۆکە سورەکان،وە هەروەها دەکرێ بۆ زانینی ئایا دژە تەن هەیە لەسەر رووی خڕۆکە سورەکان پاش ئەوەی کە خانەکان لەگەڵ پاشماوە یان تەنی بێگانە یەک دەگرن ئەو دژە تەنانە یان ئەو پرۆتینانە لە سەرروی خڕۆکە سورەکانی بەستراون.

ئەو پشکنینە راستەوخۆ دەکرێ کە شک دەکرێ کەم خوێنی واتا شکانی خڕۆکە سورەکان لەلایەن دژە تەنەکان. دژە تەنەکان پرۆتینن کە کۆئەندامی بەرگری بەرهەمی دەهێنن کاتێک هەست دەکات شتێکی خراپ کار دەکاتە سەر تەندروستی لەش ئەگەر کۆئەندامی بەرگری هەڵە بکات هەندێ خانەی هەڵە دروست دەکات دەبێتە هۆی دروستبونی چەندان کێشە.

دکتۆر کاتێک داوا دەکات کە خڕۆکە سورەکان کەم بێت وە خوێن کەم بێت بۆ ئەوەی بزانی بەهۆی بەرگری خودی بوە کە دەبێتە هۆی کەم خوێنی ئەم پشکنینە بۆ ئەوە دەکرێ بۆ ئەوەی بزانی ئەو دژە تەنانە لەسەر خڕۆکە سورەکان هەیە.

بەزۆری بۆ منداڵان دەکرێ ئەو منداڵانەی کە دژە تەنیان هەیە وە دایکیان جۆری خوێنەکەی لەگەڵ منداڵەکە یەک نییە.

### ناناسای ئەنجامی پشکنینەکە

چری خانەکانی خوێن ئەنجامەکە ناناسای دەدات کە دەلالەت لە بونی دژە تەنەکان دەکات لەسەر خڕۆکە سورەکان وە حاڵەتیکی تریش هەیە وادەکات خانە خڕۆکە سورەکان لەلایەن دژە تەنەکان لەناو ببرێت.

**نیشانەکانی ئەم پشکنینە چیە:-**

١- بێ هێزی ٢-تەنگە نەفەسی ٣-دەست و پێی سارد ٤-رەنگێکی پێستی نائاسای ٥-کەمی خانەی خرۆکە سورەکان.

**ئەو حاڵەتانەی کە وادەکات دژە تەن ممی لەسەر خانەی خرۆکە سورەکان**

١- کەم خوێنی پوکانەوەی خودی کاتێک یاسای بەرگری لەگەڵ خانەی خرۆکە سورەکان تێکەل (تفاعل) دەکەن

٢- کاردانەوە دژی گواستنەوەی خوێن کاتیک یاسای بەرگری خودی هێرش بەر پەچ دانەوەی دەکات سەر خوێنی بەخشەر

٣- شێرپەنجەی خوێنی لیمفاوی وە هەندێ لکویمیا

٤- ذئبە حامیە جهازی(نەخۆشیەکە لە نەخۆشیەکانی خودی کە بەر بلاوترە لە نەخۆشی ذئبە

٥- ژمارەی خۆرکە سپیەکان

٦- نەخۆشی گولی (VDRL)

٧- نەخۆشی میکۆبلازما(جۆریکی بەکتریا کە ناتوانی زۆربەی دژە تەنەکان بگۆرێ )هەندێ دەرمانیش وادەکەن دژە تەن دروست بن لەسەر خرۆکە سورەکان (دژە بەکتریا – دژە ئلتهاب ......هتد).



## Direct coombs Test

یەکێکە لەم پشکنینانەی کە دەکرێ بۆ زانینی پشکنینی بەرگری (مناعە) وە هەروەها دژە تەنی گلۆبولین بەکاردی بۆ زانینی کەم خوێنی کە پەیوەندی بە بەرگری هەیە حاڵەتێکە لە کەمبونەوەی ژمارەی خرۆکە سورەکان کە رزگاری بووە لە شی بونەوە و تێکشکانی پەردەی خرۆکە سورەکان لە لایەن کۆئەندامی بەرگری کە دەبێتە هۆی لە ناوچونی خانەی خرۆکە سورەکان ، لە هەندێ نەخۆشی یان هەندێ حاڵەتدا خوێن دژەتەنی IgGی هەیە کە دەبەسترێ بە پەردەی خرۆکە سورەکان کە لەوانەیە داخراوبێ بەهۆی IgG پرۆتینە پێگەیشوەکان دەبەسترێ بە دژە تەنەکان دەبێتە هۆی لەناوچونی خرۆکە سورەکان.

ئەم پشکنینە بەکاردێ بۆ دیاری کردنی ئایا ئەو دژە تەنانە یان ئەو پرۆتینە پێگەشتوانە هەیە لە سەروی خانەی خرۆکە سورەکان.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

١-ماندوبونی زۆر ٢-تەنگە نەفەسی ٣-دەست و پێ سارد دەبێت ٤-کەمی خرۆکە سورەکان

وە پشکنینێکی تریشمان هەیە ئەویش پێی دەڵێن in direct coombs پێش منداڵ بوونی لە کاتی گواستنەوەی خوێن بۆ زانینی دژە تەن لە دژی خرۆکە سورەکان کە لەناو دەمارەکانی نەخۆش دەبێت پێی بەسترانەتەوە لەکاتی بوونی تۆپەڵ ئەوا ئەم پشکنینە پۆزەتیڤ دەبێت.

# Hb electrophoresis Test

ئەو پشکنینە دەکرێ پێش هاوسەرگری کە بە یەکێک لەو پشکنینە گرنگانە دادەنرێ کە سەلامەتی منداڵ دەپارێزرێ. وە بۆ دیاری کردنی تا چەند ئەو نەخۆشەیان هەڵگرتوە. بۆ دیاری کردنی تلاسیمیا وە نەخۆشی ئەنیمیایە.

ئەم پشکنینە بۆ دڵنیابوون و زانینی جۆرەکانی هیمۆگلۆبین بەکاردێ کە ئاسای یان نائاسایی هەیە. لەکەسی ئاسای دا هیمۆگلۆبین (HbA) وە ئەم جۆرە زۆرترین ژمارەی هیمۆگلۆبین پێک دێنێت کە نزیکەی ٩٨٪ هیمۆگلۆبینەکانە وە جۆرەکانی تری (HbF) (HbA2) کە زۆر کەمن لە خوێندا (HbF) نەبوونی لە گەوران شتێکی ئاسایە.

لە کەسی دووگیان ئەو ئەنجامە دەگۆڕێ بەهۆی بونی جۆرێکی ترهیمۆگلۆبین ئەویش (HbS) ئەویش بە هۆی توشبون بە ئەنیمیا (Sickle cell anemia).

بەڵام نەخۆشی تلاسیمیا کە چەند جۆری تری هەیە کە دیاری کردنی گرانە کە دەبێ کاری خوێندنەوەی چینیەکانی بۆ بکەی بۆ ئەوەی تا بزانین کە نەخۆشەکە چ جۆرە ثلاسیمیایەکە کە بەناو بانگترینیان (الفا-بێتا)

کە بۆ چەندین جۆر بەش دەکرێ جگە لەو پشکنینانەی سەرە دەبێ CBC بکات بە پشکنینی سەرەکی دادەنرێ بۆ نەخۆشەکە خوێن کە رێژەی خرۆکە سور و سپیەکان و پەرکانی خوێن و قەبارەی خرۆکە سورەکان و رەنگی خرۆکە سورەکان دیاری دەکات.

**جیاوازی نێوان ثلاسیمیا و ئەنیمیا**

١- ئەگەر یەکێکیان توشبوو ئەوەی تریان ئاسای بو ئەوا دەتوانن زەواج بکەن

٢- ئەگەر یەکیکیان هەلگری ئەنیمیا بوو ئەوەی تریان تلاسیمیا بو ئەوا ناتوانن زەواج بکەن

٣- ئەگەر یەکێکیان هەلگری ئەنیمیا بوو ئەوەی تریان تلاسیمیای الفا بێت کێشەیان نابێت بۆ زەواج.

**ئەو هۆکارانە چین کاردەکاتە سەر ئەنجامی پشکنینەکە:-**

١- گواستنەوەی خوێن کەمتر بێت لە چوار مانگ

٢- بەرز بونەوەی چەوری لە خوێن

٣- بەرزبونەوەی خرۆکە سپیەکان خوێن بۆ ٥٠،٠٠٠

٤- لەوانەیە ئاستی HbA2HbC-HbS کەم بکات لەکاتی کەم خوێنی بەهۆی ئاسن.

٥- لەوانەیە جۆری HbS بە جۆرێکی درۆینە لەگەڵ کەسەکە بێ ئەگەر نەخۆشەکە نە خۆشیەکی سێ مانگی بێت.



# Protein electrophoresis Test

شیکاری (SPEP) لەگەڵ ئەوەی شیکاریەکی خوێنی ئاسان و هەرزانە! بەڵام ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە دەستنیشانکردنی چەندین جۆری نەخۆشی پەیوەندیدار بە پرۆتین، بەجۆرێک پرۆتینەکان جیادەکاتەوە و بڕی هەریەکەیان دیاریدەکات لەسەر بنەمای بارگەی کارەبایی و قەبارەی پرۆتینەکە، وە پرۆتینی نائاسایی دیاریدەکات کە لە ئەنجامی تووشبوون بە شێرپەنجەی خوێن دروست دەبێت و زیاد دەکات..

پرۆتین بە یەکێک لە پێکهاتە بنەڕەتیەکانی خانە و شانەکان دادەنرێت، دەکرێت بە دوو جۆری سەرەکیەوە ئەلبۆمین (Albumin) و گلۆبیولینەکان (Globulins).

ئەلبۆمین گەورەترین بڕی پرۆتین پێکدەهێنێت نزیکەی (٦٠٪)، هەرچی گلۆبیولینەکانە بڕەکەی کەمترە بەڵام گرنگی زۆرتری هەیە لە شیکاری (SPEP) لە دەستنیشانکردنی بڕی جۆرەکانی، ئەم پرۆتینە کە دەکرێت بە پێنج جۆرەوە:

(Alpha 1, Alpha 2, Beta 1, Beta 2, Gamma).

زیادکردن یان کەم کردنی ئەم پرۆتینانە چەندین هۆکاری نەخۆشی درووستیان دەکات بۆ نموونە: دروست بوونی پرۆتینی نائاسایی (Monoclonal (M) Protein) نیشانەیەکی زۆر گرنگ و بنەڕەتیە بۆ دەستنیشانکردنی یەکێک لە شێرپەنجە کوشندەکانی خوێن کە ناو دەبرێت بە (Multiple Myeloma) وە ڕۆڵی هەیە لە دەستنیشانکردنی نەخۆشی تری وەک (WM , MGUS , Primary Myelofibrosis).

**پشکنینی (SPEP) ڕۆڵی هەیە لە دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکانی:-**

١- جگەر .

٢- غودەی دەرەقی و ڕژێنەکان.

٣- شەکرە.

٤- نەخۆشییەکانی سیستمی بەرگری لەش.
٥- حاڵەتی پەیوەندیدار بە بەدخۆراکی و نەمانی توانای مژینی پێکهاتەکانی خۆراک.

**کەی پێویستە شیکاری (SPEP) ئەنجام بدرێت:-**

کاتێک کە نەخۆشەکە نیشانەکانی پەیوەندیدار بە زیادبوونی پلازما خانە Plasma cell هەبوو وەک

١- دابەزینی کێشی لەش (Unexplained Weight Loss).
٢-ئازاری ئێسک.
٣- پشت ئێشە.
٤-شەکەتی و لاوازی لەش.
٥- شکانی بە ئاسان و لەناکاوی ئێسک.
٦-زوو زوو میزکردن و قەبزی و بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش.

**کاتێک ئەنجامی ئەم پشکنینەی خوارەوە نائاسایی بن:-**

١- (CBP & Blood Film)- کەم خوێنی و کەمبوونی خرۆکە سور و سپی و خەپلەکانی خوێن، بوونی خانەی نائاسایی و شێرپەنجەیی وەک پلازما خانە و هاوشێوەکانی لە خوێندا، زیادبوونی (Rouleaux Formation).
٢- زۆربوونی پێوانەی (ESR).
٣- زیادبوونی ڕێژەی کالیسیۆم (Calcium Level).
٤- مۆخی ئێسک (زیادبوونی پلازما خانەکان).
٥- ناتەواوی فەرمانی گورچیلە و جگەر (RFT, LFT).
٦- نائاسایی شیکاریەکانی (Albumin )(Total Protein).
٧- زیادبوونی پرۆتین لە میزدا.
٨- نەخۆشیەکانی بەرگری لەش (Autoimmune Disease).
٩- هەوکردنی کاتی و درێژخایەن (Acute or Chronic Infection).

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

١-سەرگێژبوون

٢- لەخۆچون

٣- hematoma ئاوسانی خوین لە ژێرپێستدا

٤- رشانەوە

٥-گەروو وشک بونی بەردەوام

٦-بەردوام نەخۆش کەوتن تا هاتن

**چ جۆرە پشکنینێکی تر پێویستە لەگەڵی بکرێت:-**

١- urine protine electophorsis

٢-serum immunofiration

٣- cbc

٤-bone marrow biopsy

٥- serum calcium and electrolyte test

٦- kidny and liver blood test

٧- x.ray



# UPEP Test
# Urine Protein Electrophoresis

پشکنینی (UPEP) ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە دەستنیشانکردنی چەندین جۆری نەخۆشی پەیوەندیدار بە پرۆتین، پرۆتینەکان جیادەکاتەوە و بڕی هەریەکەیان لە میزدا دیاریدەکات لەسەر بنەمای بارگەی کارەبایی و قەبارەی پرۆتینەکە، پرۆتینی ئاسایی و نائاسایی دیاریدەکات، بڕی ئەم پرۆتینانەن لە لەشدا دیاریکراوە و بڕی زیادە لە ڕێگەی میزەوە فڕێ دەدرێتە دەرەوە.
لە کەسێکی ئاساییدا بڕێکی زۆرکەم پرۆتین لە ڕێگەی میزەوە فڕێ دەدرێتە دەرەوە، کە بە شێوەیەکی گشتی دوو جۆر پرۆتین لەخۆدەگرێت (Al-bumin)(Globulines)، (Glomeruli) ڕێگا بە چوونی پرۆتین بۆ ناو میز نادات لەکاتی بوونی گرفت لە فەرمانی (Glomeruli) دا ئەلبۆمین (Albumin) و پرۆتینەکانی تر بە بڕێکی زۆر دەردەچن بۆ ناو میز، هەربۆیە زیادبوونی بڕی فڕێدانە دەرەوەی پرۆتین لە ڕێگەی میزەوە نیشانەیە بۆ چەندین نەخۆشی. وەک نەخۆشیەکانی گورچیلە.
هەندێک جار (Glomeruli) بەشێوەیەکی ئاسایی کاری خۆی دەکات، بەڵام لە ڕێگەی (Tubules) پرۆتین فڕێ دەدرێتە دەرەوە بۆ ناو میز.
پشکنینی (UPEP) بڕی و جۆری پرۆتینە بەفیڕۆچووەکە دیاری دەکات، لەم ڕێگەیەشەوە هۆکار و سەرچاوەی زیادبوونی پرۆتینەکە لە میزدا دەستنیشاندەکرێت (دیاریکرنی (Monoclonal) پرۆتینەکان لە میزدا .

**پشکنینی (UPEP) ڕۆڵی هەیە لە دەستنیشانکردنی:-**

١-تێکچوونی فەرمانی گورچیلە بۆ کۆنتڕۆڵ نەکردنی پاڵاوتنی پرۆتینەکان.
٢- هەوکردنی درێژ خایەن و کتوپڕ.
٣-شەکرە و کاریگەریەکانی لەسەر گورچیلە (لاوازبوونی و لەکار کەوتنی گورچیلە).
٤- نەخۆشییەکانی سیستمی بەرگری لەش.

٥- شێرپەنجەی جۆری (Multiple Myeloma).
٦- دەستنیشانکردنی پرۆتینی ناتاسایی بەرهەم هاتوو لەلایەن خانە و شانەکانەوە (Amyloidosis)
٧- هەوکردنی کۆئەندامی میز.
٨- کۆنیشانەی نیفرۆتیک سیندرۆم (Nephrotic Syndrome)دەرکەوتنی بڕێکی زۆر پرۆتین لە میزدا و کەمی پرۆتین لە خوێندا و ئاوسانی لەش (دەستنیشان کردنی هۆکاری ئاوسانەکە) .

## کەی پێویستە شیکاری (UPEP) ئەنجام بدرێت:-

کاتێک کە نەخۆشەکە نیشانەکانی پەیوەندیدار بە زیادبوونی پلازما خانە (Plasma Cells)هەبوو وەک:
١- دابەزینی کێشی لەش (Unexplained Weight Loss).
٢- ئازاری ئێسک.
٣-پشت ئێشە.
٤- شەکەتی و لاوازی لەش.
٥- شکانی بە ئاسان و لەناکاوی ئێسک.
٦- زوو زوو میزکردن و قەبزی و بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش.
٧- ئاوسان و ئەستوور بوونی لاقەکان و دەموچاو.

## کاتێک ئەنجامی ئەم شیکاریانە ناتاسایی بن:

١- (CBP & Blood Film) کەم خوێنی و کەمبوونی خڕۆکە سور و سپی و خەپلەکانی خوێن، بوونی خانەی ناتاسایی و شێرپەنجەیی وەک پلازما خانە و هاوشێوەکانی لە خوێندا، زیادبوونی (Rouleaux Formation).
٢- زۆربوونی پێوانەی (ESR).
٣- زیادبوونی زیادبوونی ڕێژەی کالیسیۆم (Calcium Levels)
٤- مۆخی ئێسک (زیادبوونی پلازما خانەکان)

٥- ناتەواوی فەرمانی گورچیلە و جگەر(RFT , LFT)
٦- نائاسایی شیکاریەکانی (Albumin )(Total Protein).هەوڵدانی لەش بۆ ڕێکخستنی بڕی پرۆتینەکان و زیاد یان کەم بەرهەم هێنانی پرۆتینەکان، هەربۆیە شیکاری (UPEP) ئەنجام دەدرێت، دەکرێت بڕی پرۆتینەکان لە خوێندا ئاسایی بێت و بڕی لەدەستدانی پرۆتینی لە ڕێگەی میزەوە ئاسایی نەبێت.
٧- دەرچوونی ئەنجامی ((Urine Bence-Jones Protein)Positive).
ئەو دەرمانانەی کە کاریگەری لە ئەنجامی شیکاری (UPEP) دەکەن:-
(Chlorpromazine , Corticosteroids , Isoniazid , Neomycin , Salicylates , Sulfonamides , Tolutamide , Penicillamine)

نابێت بەبێ ڕێنمایی پزیشک دەرمانەکان بوەستێنرێت.
بۆ شیکاری (UPEP) باشتر وایە (Hours Urine Collection 24) میز لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا کۆبکرێتەوە، کە کاتەکەی دەستپێدەکات لە پاش میزکردنی یەکەم بۆ ماوەی ٢٤ کاتژمێر، پێویستە میزەکە لەناو دەبەیەکی زۆر پاک لەناو سەلاجە دابنرێت لە ماوەی ٢٤ کاتژمێرەکەدا.



# Vitamin B12 Test

ڤیتامین (B12) ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە ئاسانکردنی زیندەچالاکیەکانی لەشدا. گرنگترین فەرمانی ڤیتامین (B12) یارمەتیدەرە لە دروستکردن و چاککردنەوەی (DNA)، دروستکردنی خڕۆکەی سوری خوێن، بۆیە پزیشکەکان ڕێنمای دەدەن کە ڕۆژانە بڕی پێویست لە ڤیتامینەکە وەربگیرێت لەڕێگەی خواردنی ڕۆژانە یان وەرگرتنی لە ڕێگەی حەبەوە (Supplement).

لە سەروو هەموانەوە ئافرەتانی دووگیان پێویستە بڕێکی باش لە ڤیتامین (B12) وەربگرن بۆ پاراستنی تەندروستی کۆرپەکەیان، لەبەرئەوەی ڤیتامینەکە لە لەشدا خەزن ناکرێن و بڕی زیادەی (ڤیتامینی تواوە لە ئاودا) لەڕێگەی میزەوە فڕێدەدرێتە دەرەوەی لەش، بۆیە پێویستە بەردەوام خواردنی دەوڵەمەند بە ڤیتامینەکە بخورێت.

**سەرچاوە خۆراکیە دەوڵەمەندەکان بەڤیتامین B12**




١-گۆشت

٢- جگەری مانگا

٣-ماسی

٤-هێلکە

٥-گۆشتی پەلەوەر

٦- شیر و پەنیر و بەروبوومە ئاژەڵیەکان

**هۆکارەکانی کەمی ڤیتامین B12**

هۆکار زۆرن بۆ کەمی ئەم ڤیتامینە:

**خۆراک:** نەخواردنی بەروبوومە ئاژەڵیەکان دەبێتە هۆی کەمی ڤیتامین (B12). وە کوڵاندنی زیاد لە پێویستی خواردەمەنیەکان دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی بەها خوراکییەکەی.

**نەخۆشی:** هەندێک نەخۆشی هەن کاریگەری دەکەنە سەر ڕێژەی ڤیتامین

لەناو لەش و زندە چالاکیەکان تێک دەدەن وەک (نەخۆشی گەنم Crohn's Disease ، Celiac Disease).

هەڵنەمژینی ڤیتامینی وەرگیراو لەلایەن ڕیخۆڵەوە (کە دەکرێت بۆماوەییت یان بەهۆی نەخۆشیەکی میکرۆبیەوە بێت .

**نیشانەکانی کەمی ڤیتامین B12**

کەمی ڤیتامین (B12) دەکرێت ببێتە هۆی کۆمەڵێک کێشەی تەندوستی، لەوانە کەم خوێنی، ئەگەر کەمیتیەکەی مامناوەند بێت دەکرێت هیچ نیشانەیەکە نەبێت، بەڵام ئەگەر چارەسەر نەکرێت و حاڵەتەکە تەشەنە بسێنێت ڕەنگە کۆمەڵێک نیشانەی هەست پێبکرێت:

١- ماندووی و بێهێزی.

٢- دڵ پەلەپەل کردن و هەناسە بڕکێ (بەبێ هیچ هۆیەک).

٣- ڕەنگ پەڕین.

٤- قەبزی یان سکچوون یان نەمانی ئارەزووی خواردن و با کردنی سک.

٥- کێشەی کۆئەندامی دەمار و بێهێزی ماسولکە و تێکچونی ڕۆشتن.

٦-کزبوونی بینایی.

٧-تێکچونی باری دەرونی ( خەمۆکی و بیرچوونەوە و گۆڕانی ڕەفتار).

٨- کێشەی گەشەکردن.

دەستنیشانکردنی بڕی ڤیتامین (B12) لەڕێگەی شیکاری خوێنەوە دەکرێت، کە پێویستە ئەنجام بدرێت بۆ هەرکەسێک کە یەکێک یا زیاتر لە نیشانەکانی هەستپێکرد بۆ ماوەیەکی درێژ، یان بۆ ئافرەتانی دووگیان لەپێناو تەندروستی خۆی و کۆرپەکەیدا.

# Vitamin D3 Test

ئەم چەند ساڵەی پێشوودا ژمارەی ئەو کەسانەی کە توشی کەمی ڤیتامین دی بوون بە ڕێژەی ترسناک بەرز بۆتەوە لە کوردستان و جیهان دا .بەکورتی چەند زانیاری یەک دەربارەی ڕۆڵ و گرنگی ڤیتامین دی و هۆکار و زیانەکانی ئەم ڤیتامینە ئەخینە ڕوو:

ڤیتامین دی یەکێکە لە ئەو ڤیتامینەنانەی لە ناو چەوری دا ئەتوێتەوە و زۆر جار وەک هۆرمۆنێک کار دەکات و لەش دەتوانێت لەڕێگەی تیشکی خۆرەوە لەڕێگەی پێستەوە دروستی بکات .

١- ڤیتامین D بۆچی پێویستە؟

٢- لە چەند ڕێگا ڤیتامین D دەستدەکەوێت؟

٣- ڕێژەی ئاسایی و نا ئاسایی ڤیتامین D چەندە لەم پشکنینەدا؟

٤- ئێمە بڕی چەند پێویستمان بە ڤیتامین D هەیە ڕۆژانە؟

٥- هۆکارەکانی کەمی ڤیتامین D چییە؟

٦- کێن ئەو کەسانەی مەترسییان زیاترە بۆ کەمبوونی ڤیتامین D لە لەشیاندا ؟

٧- ئەو کێشە و حاڵەتانە چییە کە بەهۆی کەمی ڤیتامین D ڕوودەدات ؟

٨- ئەو سەرچاوانەی ڤیتامین D تێدایە کامانەن ؟

٩- نیشانەکانی کەمی ڤیتامین D چین؟

١٠- ئایا زۆری ڤیتامین D مەترسیدارە ؟

**Vitamin (D) Deficiency**

کەمی ڤیتامین D

ڤیتامین D بۆچی پێویستە؟

ڤیتامین D یارمەتی لەش دەدات بۆ مژینی کالسیۆم، کالسیۆمیش پێویستە بۆ تەندرووستی ئێسکە خانەکان، هەروەها ڤیتامین D ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە تەندرووستی دەمارەخانە و ماسوولکەکان و سیستمی بەرگری لەش..

## چەند ڕێگا ڤیتامین D دەستدەکەوێت؟

بەشێوەیەکی سەرەکی لە سێ ڕێگاوە دەتوانین ڤیتامین D بەدەست بهێنین، کە ئەمانەن:

لە ڕێگەی تیشکی خۆر، لە ڕێگەی خۆراک، یان لە ڕێگەی دەرمانی Supplements، ئێمە دەتوانین ئەم ڤیتامینەمان دەستبکەوێت لەڕێگەی تیشکی خۆر، بەڵام ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر تیشکی خۆر لێمان بدات ئەوا زیانی بۆ پێستمان دەبێت و لەوانەیە ببێتە هۆی شێرپەنجەی پێست.

ڕێژەی ئاسایی و نا ئاسایی ڤیتامین D چەندە لە پشکنیندا؟ ئەم ژمارانە لەوانەیە کەمێک گۆڕانکاری بەسەردا بێت لە تاقیگەیەکەوە بۆ تاقیگەیەکی دیکە. یان بەپێی سەرچاوەی جیاواز.

١- ئەگەر ڕێژەکەی 25 - 80 ng/ml بوو، ئەوا باشترین ڕێژەیە، یان هەندێ سەرچاوەی تازە دەڵێن ٥٠-٧٠

٢-ئەگەر ڕێژەکە 10 - 24 ng/ml بوو، ئەوا کەمی ڤیتامین D هەیە بەڵام بەشێوەیەکی کەم یان ئاسایی.بەپێی ڕێژەکەی.

٣- ئەگەر ڕێژەکەی لە 10 ng/ml کەمتر بوو، ئەوا زۆر کەمە ڕێژەکەی.

٤- وە ئەگەر لە 80 ng/ml زیاتر بێت، ئەوا قۆناغی ژەهراویبوونە بە ڤیتامین D، کە ئەمەش مەترسیدارە.

## ئێمە بڕی چەند پێویستمان بە ڤیتامین D هەیە ڕۆژانە؟

بڕی ئەو ڤیتامینەی ڕۆژانە پێویستمانە لەسەر تەمەنی کەسەکە بەندە ،بە ڕەچاوکردنی یەکەی نێودەوڵەتی (IU) international units بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- منداڵی تازە لەدایکبوو هەتا دوانزە مانگی، پێویستی بە 400 IU

٢- یەک ساڵ هەتا هەژدە ساڵ 600 IU

٣- نۆزدە ساڵ هەتا حەفتا ساڵی بە هەمان شێوە 600 IU

٤- حەفتا و یەک ساڵی و زیاتر پێویستی بە 800 IU

٥- ئافرەتی دووگیان یان شیردەر IU 600
بەڵام بۆ کەسێک ڤیتامین D زۆر کەم بێت، ئەوا پێویستی بە بڕێکی زیاتر دەبێت، ئەمەش بەپێی ڕێنمای دکتۆر..

**هۆکارەکانی کەمی ڤیتامین D چییە؟**

١- بەهۆی نەخواردنی ئەو خۆراکانەی کە سەرچاوەن بۆ ئەم ڤیتامینە.
٢- کەم بەرکەوتەیی تیشکی خۆر.
٣- جگەر و گورچیلە نەتوانن ڤیتامین D بگۆڕن بۆ شێوەیەکی چالاک، کە لەش بتوانێت بەکاری بهێنێت.
٤- بەکارهێنانی هەندێک دەرمان کە کاریگاتە سەر مژینی ئەم ڤیتامینە.

**کێن ئەو کەسانەی مەترسییان زیاترە بۆ کەمبوونی ڤیتامین D لە لەشیاندا ؟**

١- منداڵی شیرە خۆرە، چوونکە منداڵ بەکەمی دەکەوێتە بەر تیشکی خۆر، هەروەها شیری دایک سەرچاوەیەکی لاوازە بۆ ڤیتامین D، بۆیە ئاکادیمیایی ئەمریکی بۆ مندالان ڕێنمایی دەدات لە پێدانی IU 400 ڕۆژانە بە مندالان .
٢- ئەو کەسانەی کە بەتەمەنن، چوونکە پێستیان بەباشی توانای وەرگرتنی ڤیتامین D نییە لەتیشکی خۆرەوە، وە گورچیلەشیان بە باشی ناتوانێت ڤیتامین D بگۆڕێت بۆ شێوەیەکی چالاک.
٣- ئەو کەسانەی کە ڕەش پێستن، توانای دەستکەوتنی ئەم ڤیتامینەیان کەمە لە تیشکی خۆرەوە.
٤- ئەو کەسانەی کە قەڵەون، چونکە چەوریە خانەکانیان پێکەوە دەنوسێن لەگەڵ ڤیتامین D بەمەش ڕێگری لێدەکەن کە بچێتە سوڕی خوێن، بەلام مژینی ڤیتامین D پێویستی بە چەوری هەیە، بەڵام کە زیاد لە پێویست بوو ئەو حاڵەتەی سەرەوە درووست دەکات.
٥- نەخۆشی درێژخایەنی جگەر و گوورچیلەکان، هەندێ نەخۆشی دیکە وەک شێرپەنجە...
٦- ئەو کەسانەی هەندێ دەرمان بەکاردێنن وەک
Cholestyramine , anti seizure drugs antifungal drugs , HIV/Aids medicince)).

**ئەو کێشە و حاڵەتانە چییە کە بەهۆی کەمی ڤیتامین D ڕوودەدات ؟**

کەمی ڤیتامین D دەبێتە هۆی ئەوەی چڕی و پتەوی ئێسکەکان کەم بێتەوە، بەمەش مەترسی زیاددەکات بۆ سەر ئێسکەکان بۆ نموونە لەکاتی بەرکەوتن دەبێتە هۆی زوو شکانی..

هەروەها ئەگەر بەشێوەیەکی زۆر کەم بێت، ئەوا دەبێتە هۆی ڕوودانی هەندێک نەخۆشی، وەک ئێسکە نەرمە لە منداڵاندا (Rickets)، منداڵانی ئەفریقی و ڕەش پێست بەگشتی زۆرترین مەترسیان هەیە بۆ ڕوودانی ئەم نەخۆشییە، هەروەها لە کەسی گەورەدا ئەگەر ئەم ڤیتامینە زۆر کەم بێت ئەوا دەبێتە هۆی (Osteomalacia) کە ئەمە حاڵەتێکە دەبێتە هۆی لاوازی و ئازاری ئێسکە خانەکان و لاوازی ماسوولکەکان .

توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە ئەو کەسانەی ڕێژەی ڤیتامین D لە لەشیاندا لە ٪۳۰ کەمتر بێت، مەترسیان زیاترە بۆ ڕوودانی ڕوماتیزمە، بەڵام ئەو کەسانەی لە ٪۳۰ زیاتر بێت، ئەوا مەترسیان کەمترە.،. بە تایبەت لە ئافرەتاندا. وە هەندێ توێژینەوەش ئەوەیان دەرخستووە کە کەمی ڤیتامین D پەیوەندی هەیە بە نەخۆشیەکانی شەکرە و پەستانی خوێن و شێرپەنجە...

ئەو سەرچاوانەی ڤیتامین D تێدایە کامانەن ؟

**سەرچاوە سرووشتییەکان لە خواردندا ئەمانەن:**

١- ماسی، بەتایبەت سەلەمون

٢- پەنیر و شیر وبەرهەمە شیرەمەنییەکان بە گشتی

٣- قارچک

٤- جگەری حەیوان

٥- زەردێنەی هێلکە

٦-شەربەتی پرتەقاڵ ....

هەروەها بەشێوەی دەرمان، وەک Supplement، بەشێوەی حەب یان شرووب بۆ منداڵ.. بەڵام ئەمانە لەژێر ڕێنمایی پزیشک دەبێت بەکاربهێنرێت..

**نیشانەکانی کەمی ڤیتامین D چین؟**

١- هەستکردن بە نەخۆشی

٢- لاوازی و بێتاقەتی

٣- ئازاری ماسوولکە و ئێسک

٤- ئازاری پشت

٥- وەرینی قژ

٦- هەستکردن بە بوونی پەستان ...هتد

**ئایا زۆری ڤیتامین D مەترسیدارە ؟**

ئەگەر ڤیتامین D زیاد لە پێویست بێت، ئەوا ناودەبرێت بە ژەهراویبوون بە ڤیتامین D ،کە ئەمەش مەترسیدارە، وە نیشانەکانی بریتین لەمانە:

١- دڵ تێکەڵهاتن و ڕشانەوە

٢- کەمبوونی ئارەزووی خواردن

٣- قەبزی

٤- دابەزینی کێش و لاوازی



# Pt -INR Test
# Prothrombin time

ئەو پرۆتینەیە کە جەرگ دروستی دەکات ،دەورێکی گرنگی هەیە لە خوێن مەین،کە پێکهاتەی خۆی پەیوەندی بە ڤیتامین k هەیە. کاتیک بەرشتێک دەکەوێ خوێن بەربونێک پەیدا دەبیت بە یارمەتی ڤیتامین k ئەو پرۆتینە دەبێتە ثرۆمبین .ئەو پشکنینە بە کارلێکە دەرەکیەکان دەناسرێ.
پشکنینی (PT) بریتییە لە پێوانەکردنی تێکڕای کاتی خایەندراوا بۆ مەیینی خوێن ، بڕی (PT) بە چرکە پێوانەدەکرێت و ئەنجامی شیکاریەکە بڕی چرکەی خایەندراو بۆ کرداری خوێن مەیین ڕوونەکاتەوە، بەگشتی شیکاری (PTT) هاوپێچ لەگەڵ شیکاریی (PT) ئەنجام دەدرێت کە پێکەوە چالاکی هۆکارەکانی مەیاندن (Coagulation Factor) و کرداری مەیاندن ڕوونەکەنەوە. (Prothrombin) بریتیە لە (Factor II) کە یەکێکە لەو پرۆتینانەی کە بەشداری دەکات لە کرداری مەیاندنی خوێندا، لەشی مرۆڤ چەند جۆرێکی جیاواز لە هۆکارەکانی مەیاندن (Coagulation Factor) دروست دەکات بوونی گرفت لە هەریەک لەو هۆکارانەدا سیستمی مەیاندنی خوێن پەکدەخات و گرفتی تەندروستی بەدوادادێت، کاتی خایاندراو بۆ مەیاندن گۆڕانی بەسەردا دێت.

**چیمان بۆ ڕووندەکاتەوە؟**

بڕی (INR) هەژمارکردنێکی تاقیگەییە پشت بە بڕی (PT) دەبەستێت، سوودی لێ وەردەگیرێت بۆ دەرخستنی کاریگەری ئەو دژەمەیاندنانەی (Anticoagulant) کە لەلایەن کەسەکەوە بەکاردەهێندرێت وەک (Warfarin)، تا هاوسەنگی لە بڕی وەرگرتنی دەرمانەکەدا ڕابگیرێت، چونکە زیاد بەکارهێنانی دژەمەیاندنەکان (Anticoagulant) دەبێتە هۆی خوێنبەربوون (Excessive Bleeding) کاتێک بڕی (INR) لە بڕی ئاسایی زیاتربێت)، وەرگرتنی بڕێکی کەمتر لە بڕی پێویست لە دژەمەیاندنەکان دەبێتە هۆی تۆپەڵبوونی نائاسایی خوێن

(Thrombosis) کاتێک بڕی (INR) لە بڕی ئاسایی کەمتربێت). ئەگەر بڕەکەی زیاد لە بڕی پێویست دابەزێت دەکرێت مەترسی دروست بکات و ببێتە هۆی (جەڵدەی دڵ و گیرانی بۆریەکانی خوێن).

**کەی پشکنینی (PT) پێویستە ئەنجامبدرێت؟**

١- لەکاتی بەکارهێنانی دژەمەیاندنەکان وەک (Warfarin) بۆ چاودێری کاریگەری و بڕی وەرگیراوی دەرمانەکە، پێویستە مانگانە (هەفتانە) شیکاریی (PT) ئەنجامبدرێت.

٢- بۆ ئاگادار بوون لە مەترسیەکانی خوێن بەربوون و خوێن مەیاندنی ناوەکی.

٣- کاتێک درەنگ گیرسانەوەی خوێن لەکاتی برینداربووندا.

٤- بەر لە ئەنجامدانی نەشتەرگەری ئەنجام دەدرێت بۆ دڵنیایی لە توانایی خوێن گیرسانەوە دوای برینداربوون.

٥- هەندێک جار لەکاتی بوونی گرفت لە مۆخی ئێسک و شێرپەنجەی خوێن ئەم شیکاریە ئەنجام دەدرێت.

٦- لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی بوونی گرفت لە سیستمی خوێن مەیندا (خوێن بەربوون یان خوێن مەیینی نائاسایی).

٧- خوێن بەربوونی بێ هۆکار و ئاسان شینبوونەوە.

٨- تۆپەڵبوونی خوێن و خوێن مەیین لە ناو بۆریەکانی خوێندا (کاتێک کە پێویست نییە ڕوویدات)

٩- بوونی خوێن لە میز و پیساییدا.

١٠- ئاسان برینداربوون و خوێن بەربوونی پووک.

١١- توندی سووری مانگانە (بوونی خوێنی زۆر).

١٢- خوێن بەربوونی لووت (بێ هۆکار و دووبارە بوونەوەی).

١٣ ئاوسان و ئازاریی جومگەکان.

١٤ لەکاتی بوونی نەخۆشیکانی جگەر کە کاریگەری لەسەر سیستمی خوێن مەیین بکات.

**مانایی پشکنینەکە چی دەگەیەنێت؟**

١- کاتێک بڕی (PT)(INR) لە بڕی ئاسایی زیاترێت مانایی وایە کردادی خوێن مەیین کاتێکی زیاتر دەخایەنێت، ئەمەش دەکرێت بەهۆی یەکێک لە هۆکارەکانی وەک (کەمی ڤیتامین کەی (vitamin K)، بوونی گرفت لە یەکێک لە هۆکارەکانی مەیاندن دا (Coagulation Factor)، بوونی نەخۆشیی جگەر، زیاد بەکارهێنانی دژەمەیاندنەکان وەک (Warfarin)...

٢- ئەگەر بڕی (PT)(INR) لە بڕی ئاسایی کەمتریێت مانایی وایە کرداری خوێن مەیاندن خێراتر لە باری ئاسایی خۆی ڕوودەدات.

**تێبینی:** هەندێک لە دەرمان و خواردن و خواردنەوەکان کاریگەری لاوەکیان دەبێت لەسەر بڕی (PT)(INR):

١- خواردنەوە کحولیەکان.

٢- بەشێک لە ئەنتی بایۆتیکەکان (Antibiotics) دەبنە هۆی زیادبوونی بڕی (PT)(INR).

٣-ئازارشکێن و دەرمانی دژەسکپڕی و وەرگرتنی ڤیتامین کەی (vitamin K) و بەشێک لە چارەسەرە هۆرمۆنیەکان دەکرێت ببنە هۆی کەمکردنەوەی بڕی (PT)(INR).

(گۆشت، جگەری ئاژەڵ، چای سەوز، بڕۆکلی، شێلم) کار لە بڕی (PT)(INR) دەکەن.

**شیکاریە پەیوەندارەکان بە:**

١- PTT test
٢- Platelet Count
٣- Von Willebrand Factor test (VWF)
٤- Fibrinogen testing
Coagulation Factor (V, VII and X

# PTT Test
# (Partial thromboplastin time)

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی ڕێژەی خوین مەینی ناوەکی دەکرێ کە هیپاریین وادەکات کاتی مەین PTT زیاد دەکات

دەبێت نەخۆش ٦ سەعات بێت نانی نەخواردبێت وە کاتی کە هیپارین تازە لەو قۆلەی دا بیت نابیت لەو قۆلە وەربگیری.ئەو پشکنینە وەرناگیری کاتی کە گورچیلەی دەشورێ.

شیکاریی (PTT) توانایی و کاتی خایەندراو بۆ خوێن مەیینی ڕووندەکاتەوە، لەکاتی برینداری یان خوێن بەربوون دا سیستمی خوێن مەیاندن چالاک دەبێت بە چالاک بوونی چەندن هۆکاری مەیاندن (Coagulation Factors) و کاتێکی دیاریکراو دەخایەنێت. شیکاریی (PTT) بڕی کاتی خایەندراو بۆ پرۆسەی خوێن مەیاندنەکە پیشان دەدات، کەم بوون یان باش کارنەکردنی هەریەکێک لە هۆکارەکانی مەیاندن کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر ئەنجامی شیکاریی (PTT) دەبێت و کاتی خوێن مەیین زیاد دەکات و مەترسی خوێن بەربوون دروست دەبێت، بڕی (PTT) دەکرێت هەندێک جار بەهۆی دژەتەنەکانەوە گۆڕانی بەسەردابێت کە لەش دژی چەند پێکهاتەیەکی لەش درووستی دەکات وەک (Antiphospholipid).

**بۆچی پشکنینی (PTT) ئەنجام دەدرێت؟**

شیکاریی (PTT) بۆ نەخۆشیەکی دیاریکراو ئەنجام نادرێت، بەگشتی شیکاریی (PTT) لەگەڵ شیکاریی (PT) پێکەوە ئەنجام دەدرێن، هەرناائاسایی بوونێک لە بڕی (PTT) دەکرێت بەهۆی یەکێک لەم هۆکارانەوە بێت:

١- نارێکی لە بڕ و فەرمانی یەکێک لە هۆکارەکانی مەیاندن (Factors (XII, XI, IX, VIII, X, V, II (Prothrombin), and I (Fibrinogen)).

٢- بەهۆی کاریگەری یەکێک لە دژەتەنەکانی لەشەوە وەک (Antiphospholipid) (Lupus Anticoagulant).

٣- بەهۆی کاریگەیی دژەمەیاندنەکانەوە (Anticoagulant) وەک هیپارین (Heparin).

٤- بەهۆی چەند جۆرە نەخۆشیەک.

## کەی پشکنینی (PTT) پێویستە ئەنجام بدرێت؟

١- لەکاتی ئاسان خوێن بەربوون و شین بوونەوە.

٢- لەکاتی مەینی خوێن لە یەکێک لە بەشەکانی لەشدا.

٣- لەکاتی نەخۆشی جگەری درێژخایەن.

٤- لەکاتی بوونی گرفت لە سیستمی مەیاندنی خوێندا.

٥- لەکاتی لەبارچوونی منداڵ و چەندبارە بوونەوەی لەبەرچوونەکە.

٦- لەکاتی وەرگرتنی چارەسەری (Heparin) بۆ چاودێری کردنی بڕی چارەسەری وەرگیراو (کە بەگشتی بۆ بەرگری کردن لە مەینی خوێن و هەندێ بارووەدۆخی وەک جەڵتەی دڵ و نەخۆشیەکانی دڵ بەکاردێت).

٧- پێش ئەنجامدانی نەشتەرگەری.

٨- لەکاتی بوونی گرفت لە سیستمی بەرگری لەشدا(Immune System Disorder).

٩- لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی خوێن بەربوون.

## مانای ئەم پشکنینە چی دەگەیەنێت؟

١- ئاسایی بوونی بڕی (PTT) مانایی ئاسایی بوونی سیستمی مەیاندن دەگەیەنێت.

٢- بەرزی بڕی (PTT) مانایی وایە کاتی خایەندراو بۆ خوێن مەیین زیاترە لە بڕی ئاسایی کە ئەمەش چەندین هۆکار کاری تێ دەکەن لەوانە:

٣- نەخۆشی کەمی هۆکاری (Von Willebrand Factor)، گرفتی خەپلەکانی خوێن.

٤- کەمی هۆکارەکانی مەیاندن(Coagulation Factors).

٥- بڕی ڤایتامین کەی (Vitamin K).

٦- لەکاتی ( Hemophilia A orB ).

٧- بوونی نەخۆشیەکانی جگەر.

٨- وەرگرتنی بڕی زیاد لە پێویست لە دژەمەیاندنەکانی وەک (Heparin).
٩-دەکرێت بەهۆی بوونی نەخۆشی شێرپەنجەی خوێنەوە بڕی (PTT) زیادبکات.
١٠- بەهۆی بوونی گرفت لە سیستمی بەرگری لەش.

**کەمی بڕی (PTT) مانایی وایە کاتی خایەندراو بۆ مەیینی خوێن کەمترە لە بڕی ئاسایی:**

١- دەکرێت لەباری (Disseminated Intravascular Coagulation (DIC)).
٢- لەکاتی شێرپەنجەکانی پەنکریاس وکۆڵۆن و هێلکەدان.
٣- لەکاتی بوونی هەندێک بارودۆخی هەوکردن یان لـوو دا کـە ببێتـە هـۆی زیادبوونی (Factor VIII) کە کاتییە و پاش نەمانی بارودۆخەکە بڕی (PTT) ئاسایی دەبێتـەوە.
٤- چەندین هۆکار کار لە ئەنجامی شیکاریی (PTT) دەکەن لە گرنگترینیان:
زیاد بەکارهێنانی هیپارین (Heparin).
دەرمان لەوانە (Chlorpromazine)(Aspirin)(Vitamin C)(Antihistamines)).

**پشکنینە پەیوەندارەکان :-**

١-Prothrombin Time Test (PT)
٢- Clotting Time
٣- Platelet Count
٤- Fibrinogen Testing
٥- Coagulation Factor Tests (X, V, VIII)
٦- Lupus Anticoagulant Testing
٧- Antiphospholipid Ab
٨- Von Willebrand Factor

# D.Dimer Test

ئەو پشكنینە دەكرێ كاتێك هەست دەكرێت كە دەمارە ناوەكیەكان گیراون یان قەپات بونی سینگ ئەو دروست كەرەیە كە دروست دەكرێن لە تێكشكانی فایبرین لە مەینی خوێن، بوونی لە خوێن دەلالەت لە بونی مەینی خوێن دەكات بەڵام شوێنی مەینی و هۆیەكەیت پێ نالێت.

**لە هەندێ حاڵەت ئەرێنی دەبێ:**

١- كاتی دوای نەشتەرگەری

٢- لە ئافرەتی دووگیان دا

٣- لە پیراندا

٤- لە هەندێك شێرپەنجە دا

٥- نەخۆشی جەرگ و گورچیلە

**زیاد دەبێت لەم حاڵەتانەدا**

١-ئەگەر شێرپەنجە هێلكەی هەبێ (CA125)

٢-سەدمەی كارەبای دڵ

٣- چارەسەری بە دەرمانی (letrozole) لە شێرپەنجە سینگ

٤-پاش نەشتەرگەری جراحی

**دیاری كردنی شوێنی مەینی خوێن**

**١-گیرانی دەمارەكان:** هەندێ جار بەشیك لە دەمارەكان مەین تێدا دروست دەبێ بەهۆی رۆشتنی خوێن دەروات تا دەگاتە سیەكان و دەبێتە هۆی گیرانی دەماری سیەكان كە وادەكات نەخۆشەكە ئازارێكی زۆری هەبێت وای لێ دەكات هەناسە بەگرانی بدات دڵ لە خۆ بونەوە هەندێ جار دەبێتە هۆی مردن .

٢- دیاری دەمارە ناوەكیەكان (قوڵەكان)

# D.Dimer Test

ئەو پشکنینە دەکریَ کاتێک هەست دەکرێت کە دەمارە ناوەکیەکان گیراون یان قەپات بونی سینگ ئەو دروست کەرەیە کە دروست دەکرێن لە تێکشکانی فایبرین لە مەینی خوێن، بوونی لە خوێن دەلالەت لە بونی مەینی خوێن دەکات بەڵام شوێنی مەینی و هۆیەکەیت پێ نالێت.

**لە هەندێ حاڵەت ئەرێنی دەبێ:**

١- کاتی دوای نەشتەرگەری

٢- لە ئافرەتی دووگیان دا

٣- لە پیراندا

٤- لە هەندێک شێرپەنجە دا

٥- نەخۆشی جەرگ و گورچیلە

**زیاد دەبێت لەم حاڵەتانەدا**

١-ئەگەر شێرپەنجە هێلکەی هەبێ (CA125)

٢-سەدمەی کارەبای دڵ

٣- چارەسەری بە دەرمانی (letrozole) لە شێرپەنجە سیینگ

٤-پاش نەشتەرگەری جراحی

**دیاری کردنی شوێنی مەینی خوێن**

١-**گیرانی دەمارەکان:** هەندێ جار بەشێک لە دەمارەکان مەین تێدا دروست دەبێ بەهۆی رۆشتنی خوێن دەروات تا دەگاتە سیەکان و دەبێتە هۆی گیرانی دەماری سیەکان کە وادەکات نەخۆشەکە ئازارێکی زۆری هەبێت وای لێ دەکات هەناسە بەگرانی بدات دڵ لە خۆ بونەوە هەندێ جار دەبێتە هۆی مردن .

٢- دیاری دەمارە ناوەکیەکان (قوڵەکان)

١- بە هۆی راداری سەروی دەنگ
٢- بەهۆی بینین بە ئەشیعە
٣- سەیرکردنی بە رەنین
٣- جەڵتەی دەماری سطعی
٤- گیرانی دەماری سیەکان




**تێبینی:** زیادبونی d.dimer دەلالەت لەبونی فایبرین دەکات، فایبرینیش دەلالەت لە بونی جەڵتە (خوێن مەین) دەکات، چونکە فایبرینەکان بەیەکەوە کە چەند ئیشکەریکن کاردەکەن بۆ لەناوبردنی مەین لە خویندا .



# Anti thrombin Test

دژە ثرۆمبیـن: پرۆتینێکـە دەردەدرێت لەلایـەن جـەرگ کـە یارمەتیـدەرە بـۆ رێـک خستنی نەهێشتنی روودانی جەڵتە، ئـەم پشـکنینە دەکرێ بـۆ زانینـی ئایـا خوێـن مەیین رویـداوە بـۆ دیـاری کردنـی کەمـی دژە ثرۆمبیـن.

## کەی ئەم پشکنینە دەکرێ:

پـاش دوومانـگ لـە روودانـی جەڵتـەی خوێـن یـان کاتێـک چارەسـەری هیپاریـن وەڵام ناداتـەوە، ئـەم پشـکنینە داوا دەکری لەگـەڵ پشـکنینی خویـن مەیانـدن (تخثر دم) بـۆ زانینـی چـەن بارەبونـەوەی تۆپەلـە بوونـی خویـن.
یەکەم جار پشکنینی thrombin دەکرێ بۆ ئـەوەی بزانرێ کـە ئاستی ئاسایە ئەگـەر ئاسـتی ئاسـایی بـوو ئـەوا anti thrombin بـۆ دەکـرێ لەوانەیـە ئـەو دوو پشـکنینە بکـرێ بـۆ زانینـی جـۆری یـەکـەم یـان دووەم.
تێبینی:-
جۆری یەکەم پشکنینی thrombin
جۆری دووەم پشکنینی anti thrombin

## ئەگەر پشکنینەکە نزمبونی یەکێک لەم نەخۆشیانەی هەیە

١- نەخۆشـی جـەرگ ٢- رەقبونـی دەمـارەکان ٣- سـوتان ٤- نەخۆشـی دەمـاری دڵـی ٥- شێرپەنجە ٦- بـە مـۆم بونـی جـەرگ ٧- ئلتهابـی دەمـاری کـە دەبێتـە هـۆی تۆپـەڵ بـون .

## ئەگەر پشکنینەکە بەرزبوو یەکێک لەم نەخۆشیانەی هەیە:-

١-کەمـی کارتێکـەری(v– vll) ٢-زەردوی ٣-هیمۆفیلیـا لـە جـۆری A-B
٤-چاندنـی گورچیلـە ٥-کەمـی ڤیتامیـن K

ئەو دەرمانانەی کە وادەکات بەرز بێت:-

١-سترۆیدات بانیە ٢-الاندرۆجینات ٣- هدرۆکس کومارین ٤-جیم فیبروزیل

٥-حەبی دژە مەین دووگیانی ٦-بروجیسترون ٧-وارفارین

**ئەم دەرمانانەی وادەکات ئەنجامی پشکنینەکە نزم بێت:-**

١- استرۆجینات ٢- دەرمـان بـۆ حاڵەتـی فیبریـن ٣- جسـتودین ٤- هیپاریـن

٥-اسـیار جینـاز ٦-میثیلبردنیودلـون .



# Hormones Disease
# نەخۆشی هۆرمۆنات

## TFT Test
## (TSH-T3-T4)
## Thyroid Function Test

**ڕژێنی پەریزاد (غودە)**

ڕژێنی پەریزاد ڕژێنێکی بچووکی شێوە پەپولەییە دەکەوێتە بەشی خوارەوەو پێشەوەی مل، قەبارەکەی نزیکەی پێنج سەنتیمەتر دەبێت، ڕژێنی پەریزاد سوود لەو یۆدە (Iodine)، وەردەگرێت کە لە ڕێگەی خواردنەوە دەیخۆین، ثایرۆید هەڵدەستێ بە ڕژاندنی هەموو ثایرۆکسین( Thyroxine T4) وە بڕێکی بچوک (کەم) لە ترای ثایۆدۆ ثایرۆکسین Triiodothyronine T3. (لە ٨٥٪ی T3 لە خوێندا لە T4 وە دروست دەبێت ). (T4) تەمەنی یەک هەفتەیە، (T3) تەنها ١٨ کاتژمێر.

**فەرمانی ئەم هۆرمۆنە :-**

١-ڕێکخستنی تێکشکانی خۆراك و بەکارهێنانی ڕاستەوخۆی وزە یان خەزن کردنی یان پرۆسەی وەرگرتن و سوتاندنی خۆراك ڕێك ئەخات.

٢-کارکرکردنی ئەندامەکان خێراتر یان خاو ئەکاتەوە.

٣-ڕێکخستنی وەرگرتنی ئۆکسجین و بەرهەم هێنانی گەرمی.

**زۆری هۆرمۆنەکە (Hyperthyroidism):-**

پرۆسەی کارکردنی لەش خێرا ئەکات.

ئەبێتە هۆی نەخۆشییەکی باو ئەویش نەخۆشی (grave)ـە.

نەخۆشییەکی دژە خۆییە(autoimmune disease).

**نیشانەکانی بەرزی هۆرمۆنەکە:-**

١- دابەزینی کێشی لەش

٢- خێرابوونی لێدانی دڵ

٣- سکچوون

٤- گەورەبوونی ڕژێنەکە

٥- زوو تووڕە بوون

٦- لەش گەرمی (بەرگەی گەرما ناگرن

٧- ماندوێتی.

٨- دەست لەرزین.

٩- قەلەقی و ڕاڕای.

١٠- نەمانی ئارەزووی سێکس کردن و نەزۆکی.

**کەمی هۆرمۆنەکە (Hypothyroidism) :-**

پرۆسەی کارکردنی لەش و ڕێکخستنی خۆراك خاو نەبێتەوە.

وەرگرتنی ئۆکسجینی پێویست و گەرم کردنی لەش کەمتر نەبێتەوە.

**نیشانەکانی کەمی هۆرمۆنەکە:-**



١- هیلاك بوون

٢- کەمی وزە

٣- زیادبوونی کێشی لەش

٤- خاوبوونی لێدانی دڵ

٥- وشك بوونی پێست و قژ

٦- کەم خوێنی.

٧- کەم خەوی (بێ خەوی )

٨- قەبزی.

٩- خەمۆکی.

**دەستنیشانکردنی:-**

لەڕێگەی پشکنینی خوێن بۆ هۆرمۆنە پەیوەندیدارەکان بەم ڕژێنەوە (T3) (FreeT3) (T4) (FreeT4) (TSH) (TG)(Anti-TG).

سۆنار (Ultra Sound) بۆ دڵنیابوون لە شێوە و قەبارە و لەپەکانی ڕژێنەکە.

وێنەی تیشکی (Thyroid Scan) بۆ دڵنیابوون لە شیوە و شوێن و بارودۆخی ڕژێنەکە.

پشکنینی (Biopsy) لەکاتی بوونی هەر برین و ناڕێکیەک لە شێوەی ڕژێنەکەدا کە گومانی شێرپەنجەی لێبکرێت بەشێک لە خانەکانی بەشە توشبووەکە دەنێردرێت بو تاقیگەی تایبەتمەند بۆ دەستنیشانکردنی جۆری لوەکە.

**مانایی ئەنجامی پشکنینەکان:-**

**هۆرمۆنی (TSH):**

بەرزی ڕێژەی (TSH) بەگشتی مانای کەمی هۆرمۆنەکانی ڕژێنی پەریزادە (Thyroid Gland) کە ناسراوە بە (Hypothyroidism) واتە ڕژێنەکە بڕی پێویست لە هۆرمۆنەکان دروست ناکات و بەردەوام ژێرمێشکە ڕژێن هۆرمۆنی (TSH) دەردەدات.

کەمی ڕێژەی (TSH) بەگشتی نیشانەی دەردانی زیاد لەپێویستی هۆرمۆنەکانی ڕژێنی پەریزادە (Thyroid Gland) کە ناسراوە بە (Hyperthyroidism) واتە ڕژێنەکە بڕێکی زۆر هۆرمۆنەکان دەردەدات، وایکردوە کە ژێرمێشکە ڕژێن بووەستێت لە دەردانی (TSH) بۆ هاندانی .

**هۆرمۆنی (T4):**

بەرزی ڕێژەی (T4) نیشانەیە بۆ (Hyperthyroidism): واتە ڕژێنەکە زیاد لە پێویست کاردەکات.

نزمی ڕێژەی (T4) نیشانەیە بۆ (Hypothyroidism): واتە ڕژێنەکە بڕی پێویست لە هۆرمۆنەکە دەرنادات (تەمەڵە) .

**هۆرمۆنی (T3):**

هەندێک کات ڕێژەی (TSH) و (T4) ئاسایین بەڵام کەسەکە نیشانەکانی نەخۆشی ڕژێنی پەریزاد (غودە)ی پێوەدیارە لەم کاتەدا پەنا دەبرێتە بەر (T3) بۆ دیاریکردن و دەستنیشانکردنی بارودۆخی ڕژێنەکە .

**ڕێژەی ئاسای ئەو پشکنینانەی کە تایبەتن بە غودە :-**

* T3 ..... 0.92__ 2.33 nmol/l
* T4 ........ 60 __120 nmol/l

TSH ..... <0.15 hyperthyroid .... >7 hypothyroid

**چارەسەر:-**

چارەسەری ئەم نەخۆشیە بەپێی تەمەن و بوونی دووگیانی و قۆناغی نەخۆشییەکە یان سەرهەڵدانەوەی نەخۆشییەکە جۆری چارەسەرەکە دیاری دەکرێت.

**١- بەکارهێنانی دەرمان:** دەرمان بەشێوەی حەب بۆ ئەو کەسانە بەکاردێت کە تەمەنیان لە (٤٠) ساڵ کەمترە، یان بۆ یەکەمجار نەخۆشییەکەیان دیاریکراوە. و پێویستە بەردەوام لەژێر چاودێری پزیشکدابێت بۆ ماوەی (١٢ – ١٨) مانگ.

**٢- نەشتەرگەری:** بۆ ئەو کەسانە ئەنجام دەدرێت کە ڕژێنەکە زۆر گەورە بووە کاریگەری لەسەر هەناسە هەیە یان لەبەر جوانکاری، یان بە دەرمان چارەسەر نابێت، یاخود هەڵدانەوەی نەخۆشییەکە پاش چاکبوونی بە دەرمان.

**٣- یۆدی تیشکدەر:** بۆ ئەو نەخۆشانە ئەنجام دەدرێت کە تەمەنیان لە (٤٠) ساڵ زیاترە، سەرهەڵدانەوەی نەخۆشییەکە پاش نەشتەرگەری لەهەر تەمەنێکدا بێت، یان ئەگەر نەخۆشییەکی تری قورسی لەگەڵدا هەبێت.

# Anti Thyroglobulin Test

ئـەم پشـكنینەیە دەكـرێ بـۆ زانینـی غـودەی دەرەقـی لەلایـەن دژە تەنەكانـەوە وە جیاكردنـەوەی لـە ناتـەواوی لـە غـودەی دەرەقـی وە كاتێـك زیـادەكات كـە دژە تەنـەكان بـە هەڵـە كاردەكەنـە سـەری كـە وادەكات ئیلتهاباتـی زۆر لـە غـودەی دەرەقی دروست ببێت كە پێی دەوترێ ئیلتهاباتی غودەی دەرەقی و لەناوچونی شانە یـان لـە كاركەوتنـی غـودەی دەرەقی لـە كارەكانـی.

دژە تەنەكانـی ثایرۆگلۆبیـن ئـەو دژە تەنانـەن هێـرش دەكەنـە سـەر ثایرۆگلۆبیـن واتـا غـودەی دەرەقـی.

ئـەم پشـكنینە دەكـرێ بـۆ زانینـی بونـی هـۆكاری غـودەی دەرەقی گـەورەبونـی غودەكـە یـان نیشـانەكانی تـری كـە پەیوەندی بـە بـەرزی ونزمـی ئاستـی غـودەی دەرەقـی هەیە،ئـەو نەخۆشـەی كـە چارەسـەری شـیرپەنجەی وەردەگـرێ، ثایرۆسـین ئەنتـی ثایرۆگلۆبولیـن لـە بۆ دەكـرێ بـۆ ئـەوەی بزانـرێ دژەتەنـەكان بونیـان هەیـە لـە خوێن.

## چ كاتێك ئەم پشكنینە دەكرێت:-

ئەگەر ئەنجامی T4-TSH نائاسای بووكاتێك كە بەرزیەكی نارێك وگەورەبونی غودەی دەرەقی لەگەڵ دابوو،كاتێك شك لەوە بكات كە بەهۆی نەخۆشی بەرگریەوە توشی بوبێت.

ثایرۆگلۆبولین لە مل دا هەیە كۆمەڵە جۆرە هۆرمۆناتیك دەردەدات كە دەوریان هەیە لە كاری خۆراكی وە چەندان جۆر پرۆتین دەردەدات یەكێك لەوانە ثایرۆگلۆبین بەكاردێت بۆ چالاكبونی غودەی دەرەقی ئەگەر كێشەی بەرگری هەبێ ئەوا بەرهەم هێنانی ثایرۆگلۆبین تێكدەچێت كاتێك كۆئەندامی بەرگری تێك دەچیت دژە تەن دروست دەكات هێرش دەكاتە سەر لەش وە كاردەكاتە سەر غودەی دەرەقی زۆربەی كات وەكار دەكاتە سەر ثایرۆ گلۆبین ئەوەش وا دەكات ثیرۆگلۆبین دەردراو دروست بكات بە ناوێ ئەنتی ثایرۆگلۆبین كە زۆربەی دەبێتە هۆی تێكچونی

بەرگری لەش، ئەمەش دەبێتە هۆی کەم خوێنی نزم بونەوەی خانەکانی خوێن خرۆکە سورەکانی کە وادەکات VT.B12 کەم بکات. نەخۆشیی دەمارە خوێنیەکان و کۆلاجین وەک ئیلتهاباتی مفاصل قلیشانی پێست و شێرپەنجەی غودەی دەرەقی.

**ئەگەر ئەنجامی پشکنینەکە بەرز بوو ئەوا:-**

١-دەبێتە هۆی نەخۆشی بەرگری ترسناک نەخۆشی دڵ یان غودەی دەرەقی هاشیماتۆ، پشکنینی ثایرۆگلۆبیـن بەکاردی بۆ زانینـی کاری دەرمانەکان بۆ شێرپەنجەی غـودەی دەرەقـی و هەمـوو شێرپەنجەیەکی غـودەی دەرقـی ئەنتـی ثایرۆگلۆبیـن دەرناکات و ئەو پشکنینە ببینیـن چارەسەری شێرپەنجەیە تا بزانیـن ثرۆگلۆبیـن دەردەدات شێرپەنجەکەیە یـان هەونیـە.

بـە رێژەیەکـی کـەم لـە هەمـوو مرۆڤێـک داهەیـە بـەس بوونـی بـە رێژەیەکـی زۆر لـە شێرپەنجەی بەکاردی بۆ زانینـی وەرم دەبێت دوای نەشتەرگەری لابردن نەمێنی یان کـەم بێت یـان دوای چارەسـەر بـەڵام دوای چارەسـەریش هـەر هەبـوو ئـەوا دەلالـەت لـە بونـی شـانە و خانـەی ناتاسـایی دەکات بۆیـە دەبێت لەسـەر چارەسـەر بـەردەوام بێت.



**چ پێویستە بیزانین لەم پشکنینە:-**

زیادی ئایرۆگلۆبین تشخیس نیە بۆ شێرپەنجە بە تەنیا بەلکو دەبێ پارچەیەک وەربگیرێ لە نەخۆش زەرع بکرێت بۆ تکید بون لە بوونی شێرپەنجەی غودەی دەرەقی .

**نزمی ئاستی هۆرمۆنی غودەی دەرەقی نیشانەکانی:**

١- قەڵەوی ٢- وشک بونی پێست ٣-پرچ هەڵوەرین ٤-تووڕەبونی زۆر ٥-هێڵنج هاتنەوە

**بەرزی ئاستی هۆرمۆنی غودەی دەرەقی نیشانەکانی:**

١- ئارەقەکردنی زۆر ٢- خێرالیدانی دڵ ٣- لەرزینی دەست وپەنجە ٤- لاوازبوون و درەنگ خەوتن.



# FTI Test
# Free thyroxine index

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی رێژەی چەندی غودەی دەرەقی سەربەست گرنگی هەیە لە دیاریکردنی thyroxine (t4) وە هەروەها دەکرێ بۆ جیاکرنەوەی غودەی دەرەقی وە زیادەی غودەی دەرەقی وە حاڵەتەکانی و کەمی غودەی دەرەقی

**تێبینی:** بۆ دڵنیابوون بە غودەی دەرەقی دەکرێ و ئەگەر t4 لە ١٢٠ بەسەرەوە بۆ ئەوا غودەی سامەیە.



# Anti TPO test
# Anti- thyroid peroxidase

ئەم پشکنینە بەکاردی بۆ زانینی بەکاردێ بۆ زانینی ئیلتهاباتی (Hashimato thyroiditis) غودەی دەرەقی دژی ئەنزیمی دەرەقی کار دەکات، بەشداری دەکات لە دروست بونی هۆرمۆنی دەرەقی کە لە T4 T3 بەرهەم دێت. ئەو ئەنزیمە بەرگریە بەرزدەبێت لەو نەخۆشانەی کە غودەی دەرەقیان تەواونیە (Autoimmum Hypothyroid)، لەو نەخۆشانەی کە دەناڵێنن بە دەست نەخۆشی (Graves disease) ئەو خانە بەرگریە نزیکەی ٥٪ هەیە لەو نەخۆشانەی کە غودەیان بە تەواوی ئیش دەکات، ٩٥٪ دەبێت لەو نەخۆشانەی کە دەناڵێنن بە دەست غودەی دەرەقی کە پێی دەڵێن (Hashimato thyroiditis).




# TSH Receptor Test

زیادبونی چالاکی رژێنی غوده نەخۆشیەکی بەرگری خودیە ئەو تەنانە کاری دەکەنە سەر کە لە خانەی tshدا هەیە، دیاری کردنی رێژەی نەخۆشیەکە پشت دەبەستێت بە نیشانەکانی وە کردنی پشکنین کە دڵنیادەکاتەوە کە ژەهراوی بونی غودەی دەرەقی هەیە یان نیەتی وەک:



١- گەورەبونی غودەی دەرەقی

٢- زەق بونی چاو

٣- زیادبونی غودەی دەرەقی

Receptor کە دروست دەبێ دژی tsh دەچێتە ناوکی thyroid follicular cells کە وادەکات ثایرۆید بە رێژەیەکی زۆر زیاد بکات و هەروەها بەهۆی ئەو دژە تەنانە کە لە خوێن دا هەیە دەبێتە هۆی دیاری کردنی نەخۆشی گرافس ئەو نەخۆشیە بەشێوەیەکی بەرچاو کار دەکاتە سەر زەقی چاو .

### کاریگەری زۆر دەردانی ثایرۆید:-

١- بەرز بونەوەی پلەی گەرمی ٢-کەمبونەوەی کێش زیادبونی حەزکردن بە خۆراک ٣- بەرز بونەوەی پەستانی خوێن ٤- سک چون و زیاد بونی جولەی کۆئەندامی هەرس ٥-کاردەکاتە سەر گەشە ٦-گۆڕانکاری لە هەلسوکەوت ٧- بێتاقەتی ٨- کەم بونی دروست بونی هێلکە لە ئافرەت ٩- کەمبونی پرچ و زوو شکانی نینۆک و بریندار بونی پێست .

# AMH Test
# Anti mullerian hormone

ئەو هۆرمۆنەیە کە دەردەدرێ لە لایەن شانەی تناسلی
هۆرمۆنێکە لەلایەن کۆئەندامی زاوزێ (هێلکەدان و گوونەکان)ەوە دەردەدرێت ڕۆڵی هۆرمۆنەکە پشت بە ڕەگەز و تەمەنی کەسەکە دەبەستێت، لە منداڵی کچ دا بڕێکی کەم لەم هۆرمۆنە بەرهەم دێت و ڕێگە بە دروست بوون و گەشەکردنی کۆئەندامی زاوزێی مێینە دەدات، لە کچانی تازە پێگەیشتوو بڕەکەی بە کەمی دەمێنێتەوە تا تەمەنی هەرزەکاری تا ئەوکاتەی لە هێلکەداندا هێلکەکان دەست بە گەشەکردن دەکەن لەگەڵ گەشەکردنی هێلکەکاندا بڕی هۆرمۆنەکە وردە وردە بەرەو زیاد بوون دەچێت، هۆرمۆنەکە لە ساڵەکانی چالاکی وەچەخستنەوەدا بە بەرزی دەمێنێتەوە تا نزیکی تەمەنی نائومێدی پاشان زۆرکەم دەبێتەوە تا وای لێدێت لە دوای تەمەنی نائەمیدی بەتەواوی لاواز دەبێت.
ژمارەی هێلکەکان لە کەسێکی ئاسایدا دیاریکراوە و هەر هێلکەیەک بە پرۆسەیەکی بایۆلۆجی (Follicle Maturation) دا دەڕوات تا ئامادەی پیتاندن دەبیت و مانگانە یەک هێلکە بەم پرۆسەیە گەشەدەکات پاشان ئامادەی پیتاندن دەبێت، ئەم پرۆسەیەش لەلایەن کۆمەڵێک هۆرمۆنەوە پاڵپشتی دەکرێت وەک (AMH)(FSH)(LH).
بڕی (AMH) نیشانەری گەشەکردنی هێلکۆکەیە واتە تا بڕی (AMH) جێگیر و تەواو بێت نیشانەی تەواوی و تەندروستی و پێگەیشتنی هێلکەکانە. (AMH) باشترین هۆرمۆنە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە دابەزینی توانای هێلکەدانەوە هەیە بۆ دروستکردنی هێلکە و دیاریکردنی بارودۆخی تەندروستی هێلکەدان.

**فەرمانی لە ئافرەت پێگەیشتودا**

١- کاری ئاگاداری و توندی هێلکەیە
٢- بۆ زانینی ئەنجامی شێرپەنجەی هێلکەیە
٣-ب ۆ زانینی کیسە لەسەر هێلکەدان

٤- بۆ زانینی جۆری رەگەزی منداڵەکە کوڕ بێ یان کچ
٥- رۆڵێکی گرنگی هەیە لە سوری مانگانەدا

**پشکنینی (AMH) دەکرێت بۆ یەکێک لەم مەبەستانە ئەنجامبدرێت:-**

١- لە ئافرەتاندا بۆ دیاریکردنی چالاکی هێلکەدان و پیتاندن . ڕەنگە یارمەتیدەربێت بۆ دیاریکردنی بڕی هێلکەی شاراوەی ئامادە بۆ بوون بە هێلکەی پێگەیشتوو، یان پێشبینیکردنی دەستپێکی تەمەنی (نائومێدی) (Menopause) چونکە ژمارەی هێلکەکان دیاریکراوە.

٢- بۆ دەستنیشان کردن و پێشبینی توشبوون بە.
کیسی هێلکەدان (Polycystic Ovarian Syndrome)(PCOS).

٣- بۆ دیاریکردنی هەندێک جۆری شیرپەنجەی هێلکەدان (کە ئەم جۆرە شیرپەنجانە هۆرمۆنەکە دەردەدەن)، لەم بارەشدا وەک چاودێرێک بۆ چاودێری بارودۆخی شێرپەنجەکە یان کاریگەری دەرمان سودی لە ڕێژەی (AMH) وەردەگیرێت.

٤- بۆ دیاریکردنی ڕەگەزی ئەو منداڵانەی کە ئەندامی زاوزێیان بەتەواوی ڕەگەزیان دەستنیشان ناکات(Ambiguous Genitalia).

٥- دیاریکردنی چالاکی و تەندروستی گونەکان لەو منداڵانەی کە گونەکانیان دیارنییە کەلەدایک دەبن لەنێو سکیاندایە.

٦- بۆ دیاریکردنی چالاکی هێلکەدان و توانای سکپڕبوونی ئەو کەسانەی کە چاودێری دەکرێن بۆ پرۆسەی دانانی منداڵی بلووری (IVF).

**ئەنجامی شیکاریەکە چی دەگەیەنێت؟**

١- لە تەمەنی ترۆپکی منداڵبووندا کەمی ڕێژەی (AMH) کەمی ژمارەی هێلکە و ناتەندروستیان لە ڕووی گەشەکردنی هێلکەکانەوە نیشان دەدات. کە ئەگەری پتاندنیان کەمدەکاتەوە، دابەزینی ڕێژەی (AMH) دوای تەمەنی نائومێدی ئاساییە.

٢- زۆر زیاد بەرزبوونەوەی ڕێژەی هۆرمۆنەکە دەکرێت نیشانەبێت بۆ بوونی کیس لە هێلکەداندا (Polycystic Ovarian Syndrome) (PCOS) یان نیشانەیەکی باش بێت بۆ ئەوکەسانەی لەژێر چاودێری و چارەسەریدان لە پرۆسەی دانانی منداڵی بلودیدا (IVF).

٣- کاتێک وەک نیشانەیاکی شێرپەنجە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت دابەزینی بڕی هۆرمۆنەکە کاریگەری دەرمانەکانمان بۆ دەردەخات.
٤- لە منداڵی کوڕدا کەمی بڕی (AMH) ڕەنگە پەیوەندی بە جینی (AMH gene) وە هەبێت کە دەکەوێتە سەر کرۆمۆسۆمی (١٩). کە دەبێتە پوکانەوە یان لەکارکەوتنی گوونەکان و تێکچوونی پێکهاتەی ناوەوەی ئەندامەکە.

**تێبینی:** ئاستی AMH لە کچی بچوک کەم دەبێ هەتا کاتی باڵغ بوون وە کاتێک هێلکە دروست دەبێ لە رحمی ئافرەتدا ئاستی AMH بەرزدەبێ پاشان دەگەڕێتەوە باری ئاسای خۆی وە لە ئافرەتی بەساڵاچوو ئەوا AMH نامێنێ واتا ناتوانرێ دیاری بکرێ .

**لە ئافرەتدا نزم دەبێتەوە لەم حاڵاتانەدا**

١-منداڵ پێش کاتی ئاسای خۆی ببێت(لەبارچون)

٢-لە ژێر فشاردابێت

٣-لەکاتی سوری مانگانە چونە وە



**لە ئافرەتدا بەرزدەبێتەوە لەم حاڵاتانەدا**

١-بونی کیسە لەسەر هێلکەدان

٢-شێرپەنجەی هێلکە

لە پیاو نزم دەبێتەوە لەم حاڵاتانەدا

١-ئارێکی لە دروسبونی ئەندامی زاوزێ

٢-ئارێکی لەکاری دروستبونی هێلکە



# ACTH Test
# Adrenocorticotropic hormone

ئەو هۆرمۆنەیە لە سەرچەوری گورچیلە دا هەیە وە پێی دەڵێن غودەی کظری لە راستیدا دوو غودەی صماوینە کە دەکەوێتە لای تەنیشتی عامودی فقری کە سەروی گورچیلە دادەپۆشی کە دەچەسپێت بەسەر دیواری پشتەوەی زگ لەبەر ئەوە ناتوانی بجولێ لەکاتی جولانی گورچیلەدا.

**کێشی ٥-٧ گرامە پرە لە مولولەی خوێن**

غودەی کظری پیکدێت لە دوو بەشی سەرەکی ئەوانیش قشرە (بەشێکی سورە پرە لە ملولەی خوێن) و دڵ کە قشرە نزیکەی ٪٨٠ غودەیە وە دڵ ٪٢٠. کە هەر یەکەیان کارێکی جیاوازی هەیە کە قشرە هۆرمۆنی کۆرتیزۆل و اندسترۆن دەردەدات بەلام دڵ (الدوپامین – النورابنیفرین – الابینیفرین )دەردەدات کە تێدا غودەی نخامی لە دەماغ دا کاری رێکخستنی ئاستی کۆرتیزۆلە بەرزبونەوەی ئاستی هۆرمۆنی غودەی کظری ئاستی کۆرتیزۆل بەرزدەبێ ئەواکێشە هەیە لەغودەی نخامی دا بەڵام نزم بونەوەی ئاستی هۆرمۆنی کظری وە بەرزبونەوەی ئاستی کۆرتیزۆل ئەوا کێشە لە غودەی کظری هەیە.

**هۆرمۆنێکی کارایە زیاد دەکات لە هەندێ نەخۆشی**

١- نەخۆشی ئەدیسۆن

٢- گەورەبونی غودەی کظری

٣- نەخۆشی کوشنج

٤- بوونی گرێ لە دەرەوەی رحم

**کەمی دەبێتە هۆی**

١-گرێی گودەی کظری

٢-کەمی غودەی نخامی

**بۆچی پێویستە ئەو پشکنینە بکرێ**

١-بۆ زانینی نەخۆشی کظری و نەخۆشی غودەی نخامی

٢-نەخۆشی کوشنج

٣-نەخۆشی ئەدیسۆن

٤-بونی گرێ ی غودەی کظری

٥-گرێ غودەی نخامی

**کەی پێویستە ئەم پشکنینە بکری**

١-لە کاتی زانینی بەرزی و نزمی کۆرتیزۆل

**تێبینی:** دەبیت نەخۆش بەرۆژو بێت باشترینە وە بەتایبەتی ٨ بەیانی خوێنی لی وەربگیرێت



# Pt in blood Test
# (Pregnancy Test)

بریتیه له پێوانی هۆرمۆنێک بەناوی Human Chorionic Gonadotropin له دوای یەکگرتنی تۆ و هێلکه له لایەن وێلاشەوە ئەم هۆرمۆنه دەردەدرێت و دوای ۷ بۆ ۱۲ ڕۆژ له دەردانیشی له ڕێگەی پشکنینەوە دەردەکەوێت هەندێک جار پێش ۷ ڕۆژیش له پشکنین دەردەکەوێ، پشکنینی دووگیانی دەتوانین له ڕێگەی خوێن و میزیشەوە ئەنجامی بدەین . بەڵام له ڕێگەی خوێنەوە زووتر دەردەکەوێت وەک له ڕێگەی میزەوە.

## نیشانەکانی دوو گیانی:-

١- دواکەوتنی سوڕی مانگانە.
٢- هەڵئاوسان و گەورەبونی سک.
٣- سەر سوڕان و ڕشانەوە.
٤- زۆر میز کردن.
٥- شەکەتی و هەست به مانوبەتی کردن.



# BHCG Test
# (Beta-the human chorionic gonadotropin)

رێژەی غودەی تناسلی بۆ ناوکە پەتک دەکرێ تاکو بزانرێ ئاستی ئەم هۆرمۆنەی چەندە کە لە خانەی دووگیانی دەردەدرێت لەکاتی دووگیانیدا خانەکانی ناوکەپەتک دەست دەکەن بە تەواوکردنی (مشمیە).

**ولاش:** کیسێکە کە خۆراک دەدات بە هێلکە لە خوێن دوای ١١ رۆژ دەتوانرێ دووگیان بون بزانری لە رێگای ئەم پشکنینە کە ئاستی ٤٨-٧٢ دەگۆرێ بەرز دەبێ تا دەگاتە ٨-١١ هەفتە دوای دووگیانی پاشان کەم دەبێتەوە دەگەرێتەوە رێژەی ئاسایی خۆی.

**بۆچی ئەم پشکنینە دەکرێ:**

١- بۆ دلنیابونی دووگیانی

٢- بۆ دیاری کردنی دووگیانی نائاسای وەک دووگیانی دەرەوەی رەحم

٣- بۆ دیاری کردنی لەباربردن ئایا تەواو لەبار چوە یان پارچەی ماوەتەوە لە ناو رەحمی دایک .

هەندێک جار دەکرێ لەکاتی دووگیان کە دەرمان دەدرێ بە دایک یان لە کاتی گرتنی چەند جارێک ئەشیعە بۆ ئەوەی بزانرێ کە منداڵەکە پارێزراوە هیچ زیانێکی بەرناکەوێت بەهۆی ئەو دەرمانە .

**هیچ هۆکارێکی تر هەیە بۆ کردنی ئەم پشکنینە:-**

١- بوونی گرێ (ئەم هۆرمۆنە دەردەدرێ لە کاتی بوونی هەندێ گرێ)

٢- بۆ زانینی جۆری شێرپەنجەیە وەک (شێرپەنجەی رەحم –شێرپەنجەی سی- شێرپەنجەی سینگ - شێرپەنجەی هێلکەدان)

**بەرز دەبێ لە هەندێ حاڵەتی نا شێرپەنجەی:-**

١- لە ناوچونی جەرگ ٢- ئیلتهاباتی ریخۆڵە

**تێبینی:** لەپیاو دا بەرزبونی لە لەوانەیە بەهۆی بونی شێرپەنجە لە گون ئەگەر هەستی کرد کە گرێ لە گون هەیە دکتۆر داوای ئەم پشکنینە دەکات بۆ ئەوەی بزانرێ کەوا شێرەپەنجەیە یان نا ئەگەر بەرزبوو چەند پشکنینێکی تری بۆ دەکرێ بۆ تەکید کردنەوەلە بونی شێرپەنجە.

**نزمی لە کاتی دووگیانی واتای چیە:**

١- هەڵە لە ژماردنی هەفتەی دووگیانی

٢- لەوانەیە لە باریچێ یان هێلکەکە بێ هێز بێت

٣- دووگیان بون لە دەرەوەی رەحم

**بەرزی لە حاڵەتی دووگیانی دا:-**

١- هەڵە لە ژماردنی مێژوی دووگیانی

٢- حمل عنقودی (واتە لە دەرەوەی رەحم)

٣- بوونی دووانە یان سێ منداڵ لە سکی دایک

**تێبینی:** هەموو جارێک لەوانەیە پشکنینەکە لە سەدا سەد راست بێت هەندێک جاریش لەوانەیە درۆینە بێت.

ئەم پشکنینە هەندێ جار ئەرێنی دەبێ بەهۆی هەندێک دەرمان (Profasi-pergonal pregngi) کە هەندێکیان ئەم هۆرمۆنەی لە پێکهاتەیان دا هەیە،

**ئەم پشکنینە بۆچی دەکرێ :**

١-بونی گرێ لە گون

٢-گرێ خانەی جرثومی هێلکەدان

٣-گرێی غودەی تناسلی ولاش

٤-بۆ چاودێری کردنی دەرمان لەو نەخۆشانەی کە گرێیان هەیە.

هۆرمۆنێکە دەردەدرێن لە لایەن غودەی تناسلی لە وڵاش لە کاتی دووگیانیدا، پشکنینی بێتا ئەو پشکنینەیە کە بۆ دووگیانی دەکرێ کە ئاستی دروونەوەندەی زیاد دەکات هەردوو رۆژجارێک لە چواری یەکەم عادەتەن منداڵ لە سۆنەر دەرناچێت کاتێک لە سەروی ١٥٠٠یە کاتێک ئاستی زیاتر لە ٤٠٠٠ یەکە زیاتر بێت ئەوکات لە سۆنەر دەردەچێت بۆیە پشت دەبەسترێ پێی لە سەرەتای دووگیانی کە بزانرێ هەیە یان نییە.



# Cortisol(AM-PM) Test

ACTH هانی بەرهەم هێنانی کۆرتیزۆل دەدات کە لە پتوتەری گلاند بەرهەم دەدرێ وە کۆرتیزۆڵ لە ئەدرینەل گلاند دروست دەبێ، فەرمانی یارمەتی رێکخستنی کۆئەندامی بەرگری دەدات، ئەم پشکنینە دەبێ بەیانیان سەعات ٨ بکرێ وە ئیوارانیش درەنگ بکرێ، چونکە ئاستی کۆرتیزۆل بەیانیان زۆر زۆرە ئیوارانیش زۆر کەمە . وە دەبێتە هۆکاری گەشەی ناتەواو بۆ نمونە ئەوانەی دەستیان کورتە ...هتد.

**ئەم پشکنینە بە چەند رێگایەک دەکرێ**

١- ٢٤ سەعات لە یورینی دەکرێ

٢- لە رێگای لیک دەکرێ

٣- لە رێگای خوێن دەکرێ

**ئەم پشکنینە ئەو نەخۆشیە دیاری دەکات ئەگەر زیاد بوو:-**

١- Cushings syndrome

٢- Addisons disease

**نیشانەکانی زۆری کۆرتیزۆل :-**

١-ماندی بون

٢-گەرماو سارما بون

٣-سەدمە

٤-بەرز بونەوەی پەستانی خوین

٥-قەلەوی

**نیشانەکانی کەمی کۆرتیزۆل**

١- لە دەست دانی کێش

٢- لاواز بونی ماسولکە

٣- هیلاک بون

٤- نزم بونەوەی پەستانی خوێن

٥- ژانە سک

لە وانەیە هۆکاری کەمبونەوەی دەبێتە هۆی ئەوەی

١-بتوتەری گلاند کێشەی هەیە لەوانەیە ببێتە هۆی شێرپەنجە

٢-یان ئەدرینەل گلاند کێشەی هەیە دەبێتە هۆی نە خۆشی



# DHEA Test
# (Dehydroepiandrostcron sulphate)

ئەم هۆرمۆنە دروست دەبێ لە ئەدرینال گلاند. کە لەش زیاتر لە سەد ئەوەندەی تێستێستیرۆن وە هەزار ئەوەندەی ئستروجین دەری دەدات بە دایکی هۆرمۆنەکان ناو دەبرێت چونکە لەش دەتوانێ بە ئاسای بیگۆری بۆ ئەو هۆرمۆنەی کە پێویستە لەکاتە دا کە دەیگۆرێ بۆ ئستروجین پروجیسترۆن یان تێستێستیرۆن .لەش رێژەیەکی زۆر بەرز لەم هۆرمۆنە دەردەدات لە کاتی لە دایک بون پاشان لەناکاو کەم دەبێتەوە دوای بەرزدەبێتەوە لە تەمەنی ٧ سالی دا وە دەردانی دەگاتە ئاستی ئاسای خۆی لە تەمەنی ٢٥ سالی دا.

**فەرمانی ئەم هۆرمۆنە چیە:-**

١- کە م بونەوەی چەوری کەلاکە بوو

٢- کاری هۆرمۆنی ئەنسولین رێک دەخات بەتایبەتی لە بەتەمەناکاندا کەمی دەکاتەوە

**کەم دەبێتەوە لەو حالتانە دا**

١- نارێکی لە خواردن

٢-جگەرە کێشان

٣-توشبون بە ڤایرۆس یان بەکتریا

٤-خواردنەوەی کحول

٥-مخدرات

٦-تەمرینی گران

**تێبینی:**

هۆرمۆنی غودەی دەرەقی و تیستێستیرۆن کاردەکانە سەر ئەو هۆرمۆنە بۆیە دەبێ زوو چارە بکرێ.

**زیاد دەکات لەم حاڵەتانەدا**

١- بونی زیبکەی زۆر

٢- پرچ چەوردەکات

٣- موی لەش زیاد دەکات بەڵام نامێنێت بە بە بەکارهێنانی چارسەر

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

١- هەست بە ناخۆشی کردن

٢- قەلەقیەکی دیار

٣- لاوازی زاکیرە

٤- تورە بونوو دەنگە دەنگ

٥- کەم بونی ئارەزو جوتبوون

٦- زیادبونی چەوری لە سکدا

٧- هەلوەرینی پرچ

**چارسەر کردنی**

٢- ماسی ٣- هێلکە ١- زەیتی زەیتون



# AFP Test
# (ALPHA FETOPROTEIN)

پرۆتینێکی شەکرمیە لە مندالّی ناو سکی دایکدا هەیە لە کاتی دووگیانیدا بەکاردێ بۆ زانینی چەندان نەخۆشی و دروستبونی ناریکی کۆرپەلەوە هەروەها بەکاردێ بۆ زانینی دروستبونی گرێ ی شێرپەنجە وەک شیرپەنجەی خانەی جەرگ وە چەندان پشکنینی تر .
شوێنەکەی لە کۆرپەلەی ناو مندالّدان لە رێگەی کیسی پاریزراو دەردەدرێ.
وە دروست دەبێ بەهۆی چینی بۆماوەی، کە لە تەنیشت کرۆمۆسۆمی ٤ دا هەیە کە ئسترۆجین دروست دەکات وە لە کۆرپەلەی ناو سکی دایکی کە زۆرترین الفا پرۆتینی هەیە کە لە دوای مندالّ بون بە شێوەیەکی خێرا کەم دەبێتەوە .




ئەم پشکنینە بۆ ئەو کۆرپەلەیە دەکرێ لە رێگەی خوێنی دایکی یان ئەو شلەیەی کە دەوری کۆرپەلەی داوە .وە لە پیاوان ئەم پشکنینە دەکرێ بە نیشانەیەکی بایلۆجی دادەنرێ بۆ زانینی گرێ لە ٥٠٠ جرام مللتر زیاتر نەبێت تەنها لە ٣ حالەت نابێت

شێرپەنجەی جەرگ و بوونی گرێ وە بونی گرێ لە خانەی جنس
ئەگەر نەخۆش دەرزی بیوتین لێ درابوو دەبێت پشکنینەکە دوای ٨ سەعات بکرێت.

**لەم حاڵەتانە کەم دەبێت**

١-لە کاتی بونی منغولی
٢-زیادبونیکی زۆری کۆرپەلە زیاد لە رادەی خۆی

**لەم حاڵەتە زیاد دەبێت**

١- شەمع بونی جەرگ
٢- بونی گرێ غودەی تەناسلی
٣- بونی گرێی گەدە کە گوازراوەتەوە لە جەرگ
٥- گرێی خانەیی
٦- ئیلتهاباتی جەرگ زۆر دەبێت
٧- مردنی کۆرپەلە لە ناو رەحم
٨- لە باربردنی لە هە فتەی ٢٤-٢٨
٩- زیادی تێستێستیرۆن لە خوێن دا
١٠- ئیلتهاباتی قۆلۆن



# Growth hormone test

ئەو هۆرمۆنەیە لە چەند بێتایەک پێکدێت بەرهەم دێت لە خانەکانی بەشی پێشەوەی نخامی پارێزگاری لە گەشەکردنیان و لە ناوچونی خانەکان دەکات لە مرۆڤ دا پێک دێت لە ١٩١ ترشی ئەمینی .

هۆرمۆنی گەشەی مرۆڤ کە دەبێتە هۆی گەشەی منداڵ بەڵام هۆرمۆنی گەشە تەنها بۆ دیاریکردنی گەشە نیە بەڵکو دەوری هەیە لە رێکخستنی دیاردەکانی ئەندامەکانی لەش بە شێوەیەکی سەرەکی لە پیاودا وەک لە ئافرەتدا .

کاریگەری هەیە لەسەر ئەنسوولین بە هۆی ئەوەی وادەکات ئاستی گولکۆز لە خوێن زۆردەبێت هەروەها وا دەکات کە خوێی سۆدیوم و ۆتاسیوم مەگنیسوم زیاد بکات لە خوێن.

strrs کار دەکاتە سەر هۆرمۆنی گەشە بەهۆی وەرزشکردن هۆرمۆنی گەشە زیاد دەکات.

**چۆنیەتی خوێن وەرگرتن لە نەخۆشەکە لە لایەن کارمەندی تاقیگە بەچەند رێگایەک دەکرێ:-**

١- ئەگەر دکتۆر بەس نوسیبوی(Growth hormone) ئەوا بەشێوەیەکی ئاسای خوینی لێ وەردەگری

٢- بەڵام ئەگەر دکتۆر نوسیبوی (befor-after) ئەمەش سەرەتا نەخۆشەکە خوینی لێ وەردەگری نابێ ماندی بێت ئەمە پاش کردنی پشکنینەکە دەنوسرێ (befor).

٣- نەخۆشەکە جاری دووەم دەبێ خۆی ماندوو بکات بە رۆیشتن یان بەسەر پەیژە بکەوێ تا تەواو ماندوو دەبێت ئینجا خوێنەکەی لێ وەردەگری لە ئەنجامەکەش دەنوسرێ (after).

## هۆکارەکانی بەرزبونەوەی ئاستی هۆرمۆنی گەشە

١-فشاری دەرونی

٢-کەمی شەکرە

٣- GIGANTISM

٤-هەندی دەرمانی وەک (ئەنسولین)

## هۆکاری نزم بونەوەی ئەنجامی پشکنینەکە:-

١- پاش نەشتەرگەری لە غودەی نەخامی

٢- تەمبەلی لە غودەی نە خامی

٣- هەندێک لە دەرمانەکان (Gluco corticoids)



# GH stimulation Test

ئەم پشکنینە یارمەتی دەرە بۆ گەشەی ئێسک و ماسولکە دەردەدرێت لە غودەی نخامی بە شێوەیەکی ئاسای بەرزو نزم دەبێت لەگەڵ پرۆتینەکان بەڵام بەشێوەیەکی بەردەوام ئەگەر بەرزو نزم بێت دەبێتە هۆی دروست بونی چەندان کێشە کە دەبێتە هۆی درەنگ کەوتنی گەشە و کەم بونی ئاستی شەکرەوخوێن

چۆنیەتی خوێن وەرگرتن لە لایەن کارمەندی تاقیگە بە چوار جار وەرگرتنی خوێن دەکرێ:-

بە چوار جار خوێن لە نەخۆشەکە وەردەگیرێ بەڵام نەخۆشەکە لەماوەی ١٢ سەعات نانی نەخواردبێ، جا نەخۆشەکە دادەنیشی ئەبێ ماندوو نەبێ ئەوکات خوێنی لێ وەردەگیری پاشان بە گوێرەی کێش و تەمەنی حەبێکی تایبەت بە پشکنینە دەدەرێ بە نەخۆش پاشان پاش نیو سەعات خوین لە نەخۆشەکە وەردەگری بۆ جاری دووەم ئینجا دەنوسی 30min یا نەو سەعاتی تر بۆ جاری سێەم خوێن لە نەخۆشەکە دەنوسرێ 60min پاشان بۆ جاری چوارەم خوێن وەردەگیری دەنوسرێ 90min بەڵام هەتا هەموو خوێنەکە لێ وەردەگیری نابێ نەخۆشەکە هیچ بخوات.

### نیشانەکانی کەمی ئەم هۆرمۆنە لە منداڵدا

١- بچوکترە لە ئاستی ناوەند
٢- گەشەیان زۆر کەمترە لە ئاستی پێویست
٣- دروستبونی ماسولکەیەکی بێهێز
٤-کەمی ئاستی گلوکۆز لە خوێن
٥- درەنگ کەوتنی تەمەنی سەرەتای گەشە

**لە پێکگەشتندا کە ئەم هۆرمۆنی گەشە بە تەواوی راوەستاوە**

کەم بونی ئەم پشکنینە لەم ئاستەدا دەبێتە هۆی:

١- کەمبونی چری لە ئێسک ٢- کەم بونی هێزی ماسولکە ٣-ب مرزبونی ئاستی چەوری بە تایبەت لە کەسەکەدا ٤- کەم خەوی واتا کێشەی خەو.

**ئەم دەرمانانە نابێت بخورێت لە کاتی کردنی ئەم پشکنینە**

١-الامیفتامینات

٢-هۆرمۆنی الاسترۆجین

٣-دوپامین

٤-هیستامین

٥-سترۆیدات

پێویستە ١٠-١٢ سەعات نان نەخوات





# GH suppresion Test

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی تا بزانین دەردانی ئەم هۆرمۆنە بە هۆی بەرزبونی شەکرە کەم دەبێت، ئەم پشکنینە لە تاقیگەدا لانی کەم سێ جار خوینی لێ وەردەگیری .
وەرگرتنی خوێن لە سەعات ٦-٨ پێش ئەوەی هیچ شتێک بخوات بخواتەوە پاشان مەحلولێکی دەدرێتی تا بخواتەوە کە گلوکۆز (شەکری) تیایە پێشی دەوتری کە لە سەرخۆ بخواتەوە بۆ دورکەوتنەوە لە سەر سوران و لە هۆشخۆچون بەڵام پێویستە لە ماوەی ■ خولەک تەواوی بکات بۆ گرنگی پشکنینەکە .
پاشان خوێنەکە پاش سەعاتیک یان دوو سەعات دەتوانی لێی وەربگیرێ یان دوای خواردنی گلوکۆزەکە هەندێك جار لە ٣٠ خولەک جاریک وەردەگیرێ.
غودەی نخامی بنیەیەکی بچوکە دەکەوێتە سەروی دەماغ چەند هۆرمۆنیک دەردەدات یەکێک لەو هۆرمۆنانە هۆرمۆنی گەشەیە لە منداڵ پێش تەمەنی هەرزەکاری وە توندبونی ئێسک ئەگەر ئاستی ئەم هۆرمۆنە زۆر بەرز یان زۆر نزم بوو دەبێتە هۆی بەرزی کۆلیسترۆڵ لە خوێن یان گەورەبونی دڵ گەورەبونی کۆتاییەکان نارێکیەکی هۆرمۆنییە کە غودەی نخامی رێژەیەکی زۆر گەشە دەردەدات لە ئەنجامی پێگەشتندا کە دەبێتە هۆی acromegaly .

**نیشانەکانی ئەم پشکنینە**

١-دەست و پێ گەورەبون
٢-لێوی وەک ماسی لێ دێت
٣-ناریک و پیکیاکی دیار لە ددان .

**لەوانەیە ببێتە هۆی**

١- نەنوستنیەکی بەردەوام بۆ ماوەیەکی درێژ

٢- سڕبونی لایەکی لە لایەکانی لەش

٣- بەرزبونی ئاستی شەکرو ئاستی پەستانی خوێن

٤- دروسبونی کێشە لە دڵ و گەورەبونی.



# LH Test
# (Luteinising hormone)

سەرەتا لە پتویتەری گلاند دروست دەبێ و دەوری هەیە لە کۆئەندامی زاوزێ، ئەمە هۆرمۆنێکە تایبەتە بە ئافرەتان لە ١٤ ڕۆژی یەکەمی سوڕی مانگانەدا بەرزە و هانی هێلکەدان ئەدات بۆ بەڕەڵاکردنی هێلکە و یارمەتی ئامادەکردنی هێلکە ئەدات بۆ پیتاندن.

**فەرمانی چیە لە ئافرەتدا**

١- هانی دروست بونی estradio دەدات

٢- فەرمانی بەرەلاکردنی هێلکەیە لە ناو هێلکەدان بۆ ناو جۆگەی فالوب

**فەرمانی چیە لە پیاواندا:**

هانی خانەکانی leydig cells کە لە ناو testisدا هەیە کە هانی دەدات تێستتستیرۆن بەرهەم بهێنێت .

**لە کاتێ ئەپشکنینە دەکرێ:-**

١- نارێکی سوری مانگانە

٢- ئەو کەسە ی تازە بالغ بونە کێشەی دواکەوتنی سوریان هەیە

٣- منداڵ نە بون واتا نەزۆکی

٤- بۆ ئەوەی بزانین کە پتویتەری گلاند ئیشی خۆی دەکات

# FSH Test
# (follicle-stinulating-hormone)

سەرەتا لە پتویتەری گلاند دروست دەبێ و دەوری هەیە لە کۆئەندامی زاوزێ .
فەرمانی کۆنترۆلی سپێرم دەکات لە پیاو.
وە هانی دروستبونی Estrogen- progesterone دەدات
وە ئەمانەش یارمەتی رێکخستنی fsh دەدات و کۆنترۆڵیان دەکات

**تێبینی:** قۆناغی گە شە کردنی هێلکە (چیکڵدانە): لە ناو یەکێک لە هێلکەدانە کاندا هێلکەیەک گەشە دەکات تاوە کو ئامادە بێت بۆ دەربەڕاندن (دابەزین)ی بۆ ناوجۆگەی فالوب یەکگرتنی لەگەڵ تۆو(سپێرم) ئەم گەشە کردنی هێلکەیە بە هۆی یارمەتی هۆرمۆنی ئیسترۆجین و FSHوەیە کە رێژەکەی زۆر بەرزە لەم قۆناغەدا ...... ئەمەش رۆژەکانی کەوتنە سەر خوێن دەگرێتەوە تا وەکو رۆژی ١٤

**لە چ کاتێ ئەو پشکنینە دەکرێ:-**
١- نارێکی سوری مانگانە
٢- ئەو کەسەی تازە بالغ بونە کێشەی دواکەوتنی سوریان هەیە
٣- منداڵ نەبوون واتا نەزۆکی
٤- بۆ ئەوەی بزانین کە پتویتەری گلاند ئیشی خۆی دەکات

•

# Prolactin Test

بەرهەم دێت لە لایەن ئەنتێریۆن پیتوتەری گلاند قەبارەی هەندی ترێیەکە دەکەوێتە بنچینەی مێشک. رۆڵی سەرەکی بەرهەمهێنانی شیرە لەلایەن برێست، بە درێژای سک پری رێژەی پرۆلاکتین زۆرە، بە درێژای سک پری ئیسترۆجین و پرۆجیسترۆن هانی بەرهەم هێنانی شیر دەدەن.
ئەگەر بێتو شیری هەبوو منداڵیشی نەبوو ئەوا ئەگەری زۆرە توشی نەخۆشی تومەر (وەرەم) هاتبێ.

هۆرمۆنی شیر و بەرزی ڕێژەکەی و کاریگەری لەسەر دووگیانی

ئەپرسین هۆرمۆنی شیر چیە؟ چۆن پشکنینەکە ئەکرێت؟ ئەی ئەنجامەکەی مانای چی ئەگەیەنێ؟
هۆرمۆنی شیر لەلایەن ڕژێنی نخامیەوە دەر ئەکرێت و ئەڕژێتە خوێنەوە و هۆرمۆنی دۆپامین ڕاستەوخۆ کاری ڕێکخستنی ئەکات لە کاتی دووگیانیدا ڕێژەکەی بەرز ئەبێتەوە کە ڕەنگە دەبەرامبەر بە کاتی تری ئاسایی بەرزبێتەوە. بە درێژایی کاتی دووگیانی ڕێژەکەی بە بەرزی ئەمێنێتەوە. دوای لە دایک بوونی منالیش وردە وردە کەم ئەکات تا دوای چەند مانگێک ئەگەڕێتەوە ڕێژەی ئاسایی خۆی.. لەگەڵ هەر شیردانێکیش هەشت بەرامبەر بەرز ئەبێتەوە. بۆیە ئافرەتێ شیر بدات درەنگتر دائەبەزێتەوە ڕێژەی ئاسایی و شیری وشک ئەکات...وە بە شەویش ڕێژەکەی بەرزترە لە ڕۆژ و هەندێ دەرمان و باری دەرونی و گرێ ی ڕژێنەی ناخامیش کاریگەریان لەسەر بەرزی و نزمی ڕێژەکەی هەیە.

**بۆچی ئەم پشکنینە دەکرێ:-**

١- بۆ ئەوەی بزانین پتوتەری گلاند ئیشی خۆی دەکات

٢- بۆ دیاری کردنی کە بزانین کەسەکە توشی Prolactinuma هاتوە

٣- بۆ زانینی کاتی دەرمانی دەدەنی بزانین دەرمانەکە ئیشی خۆی کردیە
٤- لەکاتی لاوازی جووتبوون و کێشەی جووتبوونی پیاوان.
٥- لەکاتی بوونی اود گومانی بونی وەرەم لە ڕژێنی ناخامی.. لەکاتی بوونی دڵۆپی شیر لە گۆی مەمک سەرەڕای ئەوەی کەسەکە شیر نەدات.

**نیشانەکانی Prolactinuma چیە**

١- تێکچونی بینین
٢- ژانە سەری نارون
٣- سوری مانگانەی نارێک و پێکی هەبێ

**لە چ حاڵەتێک prolactin ئەنجامەکەی بەرزە:-**

١- Prolactinuma
٢-کێشەی پتوتەری گلاندی هەبێ
٣-هەندێ دەرمانی بەکارهێنابێ وەک ۆیسترۆگیس.....هتد
٤- hypothyroidism
٥- hypothalamic diseases
٦-کێشە لە جەرگی هەبی
٧-ئەگەر کییسی هەبوو



# PTH Test
# (Parathyroid Hormone)

بۆ زانینی ئاستی کالسیوم بۆ کردنی کاری غودەی دەرەقی بۆ دیاریکرن و جیاکردنەوەی نارێکی سەرەتای و ناوەندی بۆ زانینی نارێکی دەرەقی، کەی ئەو پشکنینە دەکرێ کاتیک کە ئاستی کالسیوم زیاتر یان نزمتر لە ئاستی ئاسای وە بۆ زانینی ئاستی ئیشکردنی غودەی دەرەقی،
-هۆرمۆنی غودەی دەرەقی پاراثایرۆید یارمەتیدەرە بۆ جیاکردنەوەی ئاستی کالیسیوم لە خوێن و بەشێکە لە زنجیرەی ڤیتامین د.

**کاتێک دەکرێت**

١- کاتێک ئاستی کالیسیوم نائاسای دەبیت

**نیشانەکانی**

١- بێ خەوی
٢- هێلنج هاتنەوە
٣- ئازاری سک
٤- تێنویەتی

غودەی دەرقی لە چوار بەش پێک دێت لە قورگ کە بەرپرسە لە ئاستی کالیسیوم و ڤتامین د و فۆسفۆر لە خوێن و ئێسک. غودەی دەرەقی پاراثایرۆید دەردەدات کە یارمەتی دەرە لە ئاستی کالیسیوم، نارێکی کالیسیوم نیشانەکە بۆ بونی غودەی دەرەقی کاتێک ئاستی کالیسیوم نزم دەبێت غودەی دەرەقی پاراثایرۆید زیاد بەرهەم دەهەێنیت، وە کاتێک ئاستی کالیسیوم بەرزدەبێت غودە کەمتر پاراثایرۆیدی بەرهەم دەهێنیت.
زیادی کالیسیوم لە خوێن دەبێتە هۆی بەردی گورچیلە وە نارێکی لە لێدانی دڵ و نارێکی لە دەماغ، کەمی کالیسیوم دەبێتە هۆی نارێکی لە غودەی دەرەقی کە برێکی تەواوی پاراثایرۆید بەرهەم نایەت یان زیاد بەرهەم دێت.

**لە خوێندا دەبێتە هۆی**
١- بێهێزی لە ئێسک
٢- نارێکی لە دڵ
٣- تەشەنوجات ماسولکەکان

وە بەکاردێت کاتێک کە هشاشە عظام دروست بوە لە نەخۆش چاک نابێت بە دەرمان ئەمەش واتا کێشەی لە پاراثایرۆید هەیە.
ئەگەر پاراثایرۆید بەرز بوو لەوانەیە بەهۆی نارێکی بێت لە غودەی دەرەقی، عادەتەن بەهۆی گرێی خاوێن دەبیت واتا شیرپەنجە نیە، ئەگەر ئاسای بوو وە ئاستی کالیسیوم نزم یان بەرز بوو ئەکات کێشەی غودەی دەرەقی نیە بەرزبونی ئاستی پاراثایرۆید بەهۆی:

١- زرووف کە وادەکات ئاستی فسفۆر زیادبێت وەک نەخۆشی گورچیلەی بەردەوام.
٢- لەش وەڵامی پاراثایرۆید نادەنەوە (غودەی دەرەقی درۆینە)
٣- گەورەبوون و بونی گرێ لە غودە
٤- دووگیان و شیرپێدان

لەوانەیە بەرزی بەهۆی ئەوە بێت کە لەش ئەوەی پێویستی پێیەتی بۆ زیندە چالاکیەکان وەری نەگرێت یان لەوانەیە لەش هەلی نەمژێت وەری نەگرێت (ڤیتامین د،کلیسیوم )یانیش بەهۆی بەفیرۆچونی لەلایەن میز بەرزی ئەم پشکنینە لەوانەیە بەهۆی نارێکی لە ڤیتامین د بێت لەوانەیە بری پێویست خۆر وەرنگرێت یان لەش بەگرانی وەربگرێت یان نەتوانێت تیکی بشکینیت و هەلی مژێ یان بەکارهێنانی ئەو ڤیتامینە بەنارێکی وە نزمی ئەم پشکنینە دەبێتە هۆی:-

١- نارێکی بەرگری خودی
٢- بڵاوبونەوەی شیرپەنجە لەلایەکی تری لەش و ڕۆشتنی بۆ ئیسک
٣- نارێکی لە غودەی دەرەقی
٤- کەمبونەوەی مەگنیسیوم لە خوێن
٥- ژەهراوی بون بە ڤیتامین د



# SHBG Test
# Sex hormone biuding globulin

ئەو پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی ئاستی هۆرمۆنی گلوبیولین جووتبوون ئەو پرۆتینە دروست دەبێت لە جەرگ لە خوێندا پەیوەستە بە سێ هۆرمۆناتی جوتبونەوە لە هەردوو رەگەزدا ئەو هۆرمۆنانە بریتین لە الاستروجین و تیستۆستیرۆن و دیهدروستیروجین ئەو سێ هۆرمۆنە لە هەموو شوێنێکی خوێندا هەیە، کە بالاترینیان تێستۆستیرۆنە، رێژەیەکی کەم لە پیاودا هەیە رێژەیەکی زۆر لە ئافرەتدا دەبێتە هۆی دروستبونی کێشە لەوانەیە ئاستی بگۆڕی بەهۆی نەخۆشی جەرگ و زیاد غودەی دەرەقی و قەڵەوی.
کەمی هۆرمۆنی الاندرۆجین لەوانەیە لاوازی گشتی دروست بکات کاردەکاتە سەر ئێسک و هەروەها نایەڵێ هەردوو هێلکەدان کاری خۆیان بە رێکی بکەن، نارێکی لە کەمی غدەی تناسلی:- بە زۆری لە پیاواندا روودەدات لەو پیاوانەی کە دەناڵێنن بە دەست کەمی تیستۆستیرۆن وە کەمی بەرهەمهێنانی مەنی پیاو.

### نیشانەکانی کەمی ئەم پشکنینە

١-قەڵەوی ٢-نارێکی کەمی لە غودەی دەرەقی ٣-شەکرەی جۆری دوو ٤-گەورەبونی بەشیک لە کۆتاکان وەک دەست –پێ زۆری گەشە کە دەبێتە هۆی گەورەبونی شانەکان بە تێپەربونی کات .

### نیشانەکانی زیادی ئەم پشکنینە

١-ئیلتهاباتی جەرگ ٢- بەرزی ئاستی غودەی دەرەقی ٣-وەرگرتنی دەرمانی بۆ چارەسەر کردنی جەلتە ٤- ڤایروسی و کەم بەرگری کەمی لە پیاودا دەبێتە کەمی لاوازی جووتبون وە هەروەها لاوازی هاوێشتن .

## چ کاتێک ئەم پشکنینە دەکرێ

دەکرێ کاتێک هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن کەم بێت،وە کەمی هۆرمۆنی جووتبوون لە پیاودا وە هەروەها دەکرێ بۆ ئەو ئافرەتانەی کە نیشانەی هۆرمۆنی پیاویان تێدا بەدی دەکرێ وە هەروەها داوا دەکات کاتی نیشانەکانی هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن بەرزە .

**ئەم هۆرمۆنانە بەرز دەبێت لە حاڵەتی نەخۆشی**

١-زیاد ئیش کردنی غودەی دەرەقی

٢-کەم ئیشکردنی غودەی جووتبون

٣-کەمبونی هەستەوەر الاندروجین لە خانەکاندا

٤-لەناوچونی جەرگ

**نزم دەبێ لە حاڵەتەکانی**

١- زیاد دەردانی پرۆلاکتین ٢- زیاد دەردانی اندروجین

وە هەروەها دەگۆڕێ بە وەرگرتنی دەرمان بۆ چارەسەری غودەی دەرەقی و تیستۆستیرۆن و الاسترۆجین روودەدات

**زیادی لە ئافرەتدا**

١-زیاد بونی موو لە لەش

٢-زیادبونی تایبەتمەندی پیاوان وەک دەنگ گڕی

٣- قەڵاو بون و لە سوری مانگانە چونەوە



# Testosteron Test

بەرهەم دێت لە ئەدرینەل گلاند کە لەسەر kidny ،
هۆرمۆنی تێسۆستیرۆن یەکێکە لە هۆرمۆنە ئەنابۆلیکەکان، ئەم هۆرمۆنانە لە لەشی مرۆڤ بەرپرسیارن لە گەشەپێدانی ماسولکەکان لە دیارترین هۆرمۆنە ئەنابۆلیکەکان بریتین لە هۆرمۆنەکانی (تیستۆستیرۆن) و (ئەنسۆلین) و هۆرمۆنی گەشە (GROWTH HORMON) ئەم جۆرە هۆرمۆنانە رۆڵێکی سەرەکی دەبینن لە کونترۆڵکردن و بنیاتنانی ماسولکەکان. یاریزانی لەشجوانی بەدەر لە پێویستی لەش پێویستیان بەبرێکی زیاتری هۆرمۆنی تێستۆسترۆن هەیە بۆ دروست کردنی ماسولکە بەشێوەیەکی خێرا و زیادکردنی قەبارەی ماسولکەکان.
ئافرەت رێژەیەکی کەمی پێویستە کە بە دوو شێواز دەسورێتەوە
١- free testosterone
٢-بەڵام بەشەکەی تری پرۆتین بەستراوە
پرۆتینەکان (albumin-SHBG) کە تێستیرۆنی هەڵدەگرن لە ناو خوێن
**تێبینی:** وا باشترە ئەوپشکنینە بەیانیان بکرێ

**ئەم پشکنینە بۆ چ دەکرێ**

١- بۆ دەست نیشانکردنی کیس لە رەحم
٢- بۆ ئەو ئافرەتانەی کە موویان زۆرە
٣- هەروەها پەیوەندی هەیە بە نەزۆکی پیاو وئافرەت

**ئەگەر تێستێتیرۆن زۆر بوو چ روودەدات**

١-لە پیاو لەوانیە سەرەتانی هەبێ لە تێستێستیرۆن
٢-لە ئافرەتدا لەوانەیە سەرەتانی هەبێ لە ئدرینال گلاند و ۆڤەریو
٣-لە کوردا نیشانەی زوو باڵغ بونە

**هۆکارەکانی زیادبوونی هۆرمۆنی نێرەکی لە ئافرەتاندا تیستستیرون:-**

**١-کیسی سەر هێلکە دان:** بەزۆری لەم حاڵەتەدا لە سەرەتاکانی قۆناغی گەشە روودەدات وە بە دەگمەن دەبێتە هۆی دەرکەوتنی نیشانەکانی زیادبوونی هۆرمۆنی نێرەکی، هۆکاریش زیاد دەردانی ئەو هۆرمۆنەیە لە هەردوو هێلکەدانەوە کە ئەگەر بەزووی چارەسەر نەکرێ رەنگە ببێتە هۆی نەزۆکی لە ئەنجامی لەکارکەوتنی عەمەلیەی هێلکە دروست کردن.

**٢-گرێکانی سەر هێلکەدان:** گرێی سەر هێلکەدان دەبێتە هۆی دەردانی هۆرمۆنەکانی سەرگورچیلە(کۆرتیزون) وە هۆرمۆنی غودەی دەرەقی ، نەخۆشی کوشینگ ئەم نەخۆشیە بەهۆی زیاد دەردانی هۆرمۆنی نوخامە رژێنەوەیە لە مێشکدا کە بەرپرسە لە رژێنی سەر گورچیلە کە ئەم کێشەیەش دەبێتە هۆی زیاد بوونی نا سروشتی کێشی لەش و قلیشانی پێست و بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

**٣- بوونی گرێ لە غودەی سەر گورچیلە:** ئەمەش دەبێتە هۆی زیاد دەردانی هۆرمۆنی نێرەکی بەهۆکاری کەمی ئەنزیمی دروستکردنی کۆرتیزون

**٤- خراپ بەکارهێنانی هەندێک دەرمانی وەکو دەرمانی تیستیستیرون** کە دەدرێت بە هەندێ وەرزشکار چ مێ بێت یان نێر

**٥- هۆکاری بۆماوەیی**

**چارەسەری زۆری هۆرمۆنی نێرەکی:-**

چارەسەر بەچەند قۆناغێک دەبێت ،، ماوەی چارەسەر لە ٦ مانگەوە دەست پێ دەکات تاوەکو ساڵێک ،،هەر بۆیە چارەسەر بەشەو و رۆژێك نابێت ،، وە لەو چارەسەرانەش کە بەکاردەهێنرێت ئەمانەیە:-

١-بەکارهێنانی دەرمانی دژە دووگیانی (منع) کە هۆرمۆنی ئیسترجینی تێدایە کە بەهۆرمۆنی مێیەکی ناسراوە کە بەهۆی ئەم دەرمانەوە رێگە

دەگرێت لە هاندانی هێلکەدانەکان بۆ دەردانی زیاتری هۆرمۆنی نێرەکی.
٢- ئەو دەرمانانەی کە دژی هۆرمۆنی تیستستیرۆنن.
٣- ئەگەر هۆرمۆنی نێرەکیەکە لە ڕژێنی سەر گورچیلە وە بێت ئەوا دەرمانی کۆرتیزۆنی دەدرێتێ.
٤- بەکارهێنانی ڕێگاکانی جوانکاری بۆ شاردنەوە وکەمکردنەوەی موو لەماوەی چارەسەردا.
٥- هۆکارەکانی هۆرمۆنی نێرەکی لە ژناندا: هۆرمۆنی نێرەکی لە ژنان و پیاواندا بوونی هەیە بەڵام بە ڕێژەی جیاواز، بەجۆرێک کە لە ژناندا ڕێژەکەی کەمترە وەک لە پیاواندا ،، بەڵام کێشەکە لەوێوە دەست پێ دەکات کە ڕێژەکەی زیاتر بێت لە ڕێژەی ئاسایی ،،کەئەمەش کاردەکاتە سەر هۆرمۆنی مێیەکی(ئیسترۆجین )
هۆرمۆنی نێرەکی لە دوو سەرچاوەوەیە لە ئافرەتاندا
١-ڕژێنی سەر گورچیلە
٢-هێلکەدانەکان کە سەرچاوەی سەرەکیە



# Progesterone Test

بەشێوەیەکی سەرەکی ئامادەکردنی ئافرەتە بۆ منداڵبوون، ئەگەر کەم بوو منداڵ بە گرانی دەبێت.

بەشێك لە ژنان بە دەست دووبارە بوونەوەی لەبارچوونی منداڵەکانی ناو سکییانەوە دەناڵێنن، بەتایبەتی لە مانگەکانی سەرەتای سکپرییدا، لێکۆڵینەوە پزیشکییەکانیش ئاماژە بە چەند هۆکارێك دەکەن.

**هۆکارەکان چین؟**

١- کەمی هۆرمۆنی پرۆگیسترۆن لای ژنی سکپر.

٢- خواردنی دەرمانی زیانبەخش لە مانگەکانی سەرەتای سکپرییدا، بەتایبەتی ئەو ژنانەی نازانن سکییان هەیە.

٣- تووشبوونی ژنی سکپر، بە نەخۆشی (تەلکسۆپلازما)، نەخۆشییەکانی (دەردە پشیلە و سەگ).

٤- بوونی گرفتی تەندروستی لە کۆئەندامی زاوزێی مێینە، یاخوود تووشبوون بە نەخۆشییەکانی خوێن.

٥- بوونی گرفتی جەستەیی لە نێوان پیاو و ژن، بە تایبەتی ئەو ژن و پیاوانەی خزمی یەکترن



**ج/ کاتێ ئەم پشکنینە دەکرێ:-**

١- لە کاتی خارج رەحم

٢- یانی بزانی منداڵ لەبارچونە

٣- یان خوێن بەربون

# Estrogen Test

هۆرمۆنێکە بەرپرسە لە گەشەی کۆ ئەندامی زاوزێ، هێلکە لە کیسەیەکدایە پێی ئەوترێت فۆلیکڵ (Follicle) و لەناو هێلکەدانـدا گەشە ئەکات تاوەکو هۆرمۆنی ئێستڕۆجین (Estrogen) هێما ئەدات بە ڕەحم (Uterus) بۆ خۆ ئامادە کردنی بۆ هێلکەکە.
ڕەحم بە دەوری خۆی ناوپۆشەکەی دەست ئەکات بە ئەستور بوون و خۆی ئامادە ئەکات بۆ جێگیر بونی هێلکەی پیتێنراو (Fertilized egg) و لە ئەنجامدا دووگیانی ڕوئەدات.

**سێ جۆریان هەیە**

١- (E1(estrone: پاش ئەوەی ئافرەت دەبێتە ٥٠ ساڵ
ئەو شێوەی هەیە کە ئەویش لە ئەدرینەل گلاند دروست دەبێ
٢- (E2 ( estradiol: لە زۆڤەری بەرهەم دێت لە ئافرەت دا
لە پیاودا لە تێستس و ئەدرینەل گلاندا دروست دەبێ
هانی پێکهێنانی ئێسک دەدات وە کۆلسترۆل ڕێک دێخێ
٣- (E3(oestriol: بە درێژای سک پڕی ئەم شێوەی هەیە
بۆ زانینی نیشی ئۆڤەری بەکاردێ



# Aldosterone Test

پشـکنینی (Aldosterone) سـوودی لـێ وەردەگیرێـت بـۆ دەستنیشـانکردنی ڕێـژەی هۆرمۆنـی (Aldosterone)، (Aldosterone) هۆرمۆنێکـە کـە ڕۆڵێکـی گرنگـی هەیـە لـە ڕێکخسـتنی ڕێـژەی پۆتاسـیوم (Potassium)و صۆدیـۆم (Sodium) لـە خوێنـدا، هەروەهـا کۆنترۆڵـی قەبـارەی خوێـن دەکات (کـە نزیکـەی (٤،٥ بـۆ ٥،٥ لیتـرە) لـە کەسـێکی ئاسـایی پێگەیشـتوودا)، فشـاری خوێـن بەجێگیـری ڕادەگرێـت.
ئەم هۆرمۆنە لەلایەن ڕژێنی سەر گورچیلە(Adrenal Glands)وە دەردەدرێت، کـە دوو ڕژێنـی بچووکـن دەکەونـە سـەر گورچیلـەکان و کاریگەریـان لەسـەر بەشێکی زۆر لـە زیندەچالاکیەکانی لـەش هەیـە.

## کاتێک ئەم پشکنینە ئەنجام دەدرێت:

لەکاتـی دەرکەوتنـی نیشـانەکانی وەک (بەرزبوونـەوەی فشـاری خوێـن، بەتایبەتـی کاتێـک ڕێـژەی پۆتاسـیوم زۆر دادەبەزێـت، کاتێـک کـە بـەرزی فشـاری خوێـن لەلایـەن دەرمانەکانـی تایبـەت بـە بەرزەفشـارەوە (Hyperten-sion) ئاسـایی نابێتـەوە، یـان لەکاتـی تووشـبوونی کەسـێک بـە بـەرزە فشـاری خوێـن لـە تەمەنـی گەنجێتیـدا .
کاتێـک ڕێـژەی (Aldosterone) لـە ڕێـژەی ئاسـایی خـۆی زیاتـر دەبێـت (Hyperaldosteronism) دەبێتـە هـۆی (زیادبوونـی فشـاری خوێـن، لاوازی ماسـولکەکان، دابەزینـی ڕێـژەی پۆتاسـیۆم، زیادبوونـی ڕێـژەی صۆدیـۆم).
کاتێـک ڕێـژەی (Aldosterone) لـە ڕێـژەی ئاسـایی خـۆی کەمتـر دەبێـت (Hypoaldosteronism) دەبێتـە هـۆی (دابەزینـی فشـاری خوێـن، زیادبوونـی پۆتاسـیۆم، کەمبوونـی صۆدیـوم).

**چی پێویستە بکرێت پێش ئەنجامدانی پشکنینە:-**

ئـەم پشـکنینە لەڕێگـەی خوێـن و میـزی کۆکـراوەی ٢٤ کاتژمێـر(Hour Urine-24) ئەنجـام دەدرێـت، کاتـی ئەنجامدانـی شـیکاریەکە زۆر گرنگـە چونکـە چەندیـن بـارودۆخ هـەن کاریگـەری لەسـەر ڕێـژەی (Aldosterone) دەکـەن، هۆرمۆنـی (Aldosterone) لـە بەیانیانـدا بەرزتریـن ڕێـژەی هەیـە و پاشـان بـە درێژایـی ڕۆژ ڕێژەکـەی بـەرەو کەمبوونـەوە دەڕوات.

فشاری دەروونـی و خـواردن (خۆراکـی سوێر)و هەندێـک دەرمـان کاریگـەری لەسـەر ڕێـژەی (Aldosterone) دەکـەن، بارودۆخـی ئـەو کاتـەی نەخـۆش (خوێنەکـەی بـە پێـوە لـێ وەرگیراوە(واتـە لەسـەر هیلاکـی)) یـان (پـاش حەسـانەوەی خوێنەکـەی لێوەرگیـراوە).

**تێکچوونی هۆرمۆنی (Aldosterone) هەیە:**

١-زیادبوونی سەرەکی (Primary Aldosteronism):

کـە بـە (Conn Syndrome) ناسـراوە، کـە دەبێتـە هـۆی دەردانـی ڕێژەیەکـی زۆر لـە (Aldosterone) لەلایـەن (Adrenal Glands)وە، بەرزی ڕێژەی (Al-dosterone) کـرداری هەڵمژینـەوەی صۆدیـۆم (Sodium) و کردنـەدەرەوەی پۆتاسـیۆم (Potassium ) زیـاد دەکات لەلایـەن گورچیلـەوە، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی تێکچوونـی هاوسـەنگی خوێیەکانـی لـەش و زیادبوونـی فشـاری خوێـن.

٢-زیادبوونی لاوەکی (Secondary Aldosteronism):

ئەمەیان لـە تێکچوونـی سـەرەکی باووتـرە و چەنـد گرفتێکـی تەندروسـتی دەبنـە هـۆی تێکدانـی ڕێـژەی (Aldosterone) هـەر هۆکارێـک وابـکات خوێنـی کـەم بچێـت بـۆ گورچیلـە، هەندێـک جـار زیادبوونـی لاوەکـی سـەرهەڵدەدات لەگـەڵ نەخۆشـیەکانی (دڵ و جگـەر و گورچیلـە)دا، لەکاتـی وشـکبوونەوە و کـەم خواردنـەوەی ئـاو سـەرهەڵدەدات، لەکاتـی تەسـکبوونەوەی بۆریەکانـی خوێـن کـە خوێـن بـۆ گورچیلـە دەبـەن.

**٣-دابەزینی ڕێژەی (Aldosterone):**

کەم دەردانی هۆرمۆنەکە (Hypoaldosteronism) دەبێتە هۆی وشکبوونەوە، دابەزینی فشاری خوێن، کەمبوونەوەی صۆدیۆم و زیاد بوونی پۆتاسیوم لە خوێندا.

**پشکنینە پەیوندی دارەکان:-**

هەندێک جار لەگەڵ ئەنجامدانی شیکاری (Aldosterone) شیکاریەکانی Plasma Renin)(Renin-ALD ratio) (Andrenocorticotrophin(ACTH)) (Cortisol))) پێویستە ئەنجام بدرێت.

# PSA Test
# Prostate-Specific Antigen

پرۆستات رژێنێکی ریشاڵەیی هۆرمۆنی یە شوێنەکەی لە دەورویەری بۆری میزەوە لە ملی میزڵدانەوە لە پیاواندا، ئەم گلانە گیراوەیەك دەرژێنێت بۆ ئاسانکردنەوەی جموجۆڵی تۆماوی پیاو باشە لە کاتی دەرچوونی تۆو لە کاتی جووت بوون دا.

ڕێژەی ئاسایی: Normal Ranges

ng/mL 1-4

بەرزی ئەم پشکنینە دەبێتە هۆی:-

هەوکردنی پرۆستات، گەورەبوون و شێرپەنجەی پرۆستات.

کاتێک ئەم پشکنینە نا ئاسایی بوو پێویستە نموونە لە پرۆستات وەربگیرێت و لە ژێر مایکرۆسکۆپ پشکنینی بۆ بکرێت بۆ ئەوەی جۆری نەخۆشیەکە دیاری بکرێت کە نەخۆشیەکە هەوکردنە یان شێرپەنجە.

**نیشانەکانی تووش بوون بە نەخۆشیەکانی پرۆستات:**

١- هەست کردن بە سەرما و تای بەرز.

٢- ئازار لە بەشی خوارەوەی پشت و سەرەوەی ئێسقانی ئەندامی جووتبوون و خوارەوەی حەوز.

٣- ئازار و سوتانەوە لە کاتی میزکردندا لەگەڵ نەتوانای خالی کردنی میزڵدان لە میزەوە.

٤- نەتوانای کۆنترۆڵکردنی نەهێشتنی میزکردن لە کاتی پڕبوونی میزڵداندا.

٥- ئازار لە کاتی دەرچوونی پیسایی لە ڕیخۆڵەدا.

نەشتەرگەری بۆری ئەندامی جووتبوونی نێرینە و ناڤوری میزڵدان و بەستنی دەرەوەی میزڵدان کە دەبێتە هۆی تووشبوون بە هەوکردنی میکرۆبی لە پرۆستات، هەروەها جۆر و ڕێژەی ئەو میزە کە لە میزڵدانەوە دەردەچێت دەبێتە هۆکارێك بۆ هەوکردنی پرۆستات.

**لە نیشانەکانی ئەم حاڵەتە:**

١- ئازار لە شوێنی دەرچوونی پیسایی و لە سەرەوەی ئەندامی جووتبوون و لە هەردوو گون و خوارەوەی پشت و بۆری ئەندامی جووتبوون و دەوروبەری.

٢- دووبارە بوون و سوتانەوە لە کاتی میزکردندا.

٣- کەم دەرچوونی میز لەگەڵ ئازار و خوێن و بۆنێکی نائاسایی.

٤- ئازار لە کاتی ڕشانەوەی تۆماو لەگەڵ خوێندا.

٥- ئازار لە کاتی دەرچوونی پیسایی.

هەوکردنی پرۆستات زۆر جار لە تەمەنی ٢٠ تا ٣٥ ساڵان ڕوودەدات لە نێوان ئەو گەنجانەی کە جووتبوون ئەنجام دەدەن بە شێوەیەکی نائاسایی (شاز) و ناشەرعی.

دووەم: هەوکردنی پرۆستاتی درێژخایەن: ئەمەش بۆ ماوەیەکی زۆر دەمێنێت و هۆکارەکەی دووبارە تووشبوونە بە جۆرەکانی میکرۆباتەوە، ئەمەش بە هۆی خواردنەوەی مەی و برین لە شوێنی دەرچوونی پیسایی و جووتبوونی ناشەرعی و نائاسایی (شاژ) زیاد دەکات. لە نیشانەکانی ئەم حاڵەتە:

١- دووبارە تووشبوون بە هەوکردنی بۆریەکانی میزڵدان.

٢- ئازاری بەشی خوارەوەی پشت و دەوروبەری حەوز و گون و شوێنی پیسایی کردن (کۆم)

٣- ئازار و سوتانەوە لە کاتی میزکردندا.

٤- ئازار لە کاتی ڕشانەوەی تۆماو یان لە کاتی پیسایی کردندا.

٥- تا و دووبارە میزکردنی خوێناوی و میزە چرکێ و زۆری کاتی ئەنجامدانی میزکردندا.



**واتە نیشانەکانی بەستنی بۆری میزەوە ئەمانەن:**

١- کەم دەرچوونی میز لە کاتی میزکردندا.

٢- دواکەوتنی کاتی میزکردن لە کاتی پێویست.

٣- بڕین لە میز (میزە چرکێ) لە کاتی میزکردندا.

٤- ئازار لە سکەوە.

٥- ئازار لە کاتی میزکردندا.

٦- دووبارەبوونی میزکردن لە کاتێکی کورت.

٧- هەست بە پێویستییەکی بەردەوام بۆ میزکردن.

هەندێ جار دەبینین ئازارێك ڕوودەدات لە پرۆستات و هیچ هەڵاوسانێك یان هەوکردنێکی میکرۆبی نییە، بەڵام هەوکردن لە کیسی تۆماو دەردەکەوێت بە بێ ئازار لەگەڵ دەرچوونی پارچەی خوێنی کەم.



# Rheumatology
# زانستی باداری (رۆمانتیزمە)

## R.F Test
## Rheumatoid factor

نەخۆشی رۆمانتیزم بریتیە لە ئیلتهابی درێژخایەنی جومگە کە بەشێوەیەکی سەرەکی کاردەکاتە سەر جومگە بچوکەکانی دەست و قاچ، نەخۆشی رۆمانتیزم کاردەکاتە سەر دیوی ناوپۆشی جومگەکان و ئازارو ئاوسان لە جومگەکاندا دروست دەکات دوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ دەبێتە هۆی تێکچونی شێوەی جومگەکان. ئەم نەخۆشیە کاتێک روودەدات کە کۆئەندامی بەرگری لەش بە هەڵە پەلاماری خانەو شانەکانی لەشی خۆی دەدات و دەبێتە هۆی دروست بونی گرفت لە جومگەکاندا، ئەم نەخۆشیە کاردەکاتە سەر هەموو ئەندامەکانی لەش و دەبێتە هۆی بێ هێزی و تا ئەم نەخۆشیە زیاتر توشی ئافرەتان دەبێت بە بەراورد بە پیاوان وە عادەتەن لە نێوان تەمەنی ٤٠-٦٠ساڵی روودەدات.



**نیشانەکانی نەخۆشی رۆماتیزم:-**

١- ئازار: جومگەکان توشی ئازار دەبێت لە کاتی جولان و ئیشپێکردن

٢- بوونی ئازار لە کاتێکدا بە دەست پەستان بخەیتە سەر جومگە توشبوەکەوە گەرمبونی جومگەکە و ئاوسانی جومگەکە

٣-رەق بوون: رەقبوونی جومگەکان بە تایبەتی لە بەیانیان دا یان دوای ماوایەکی زۆر لە ئسراحەت و ئیشپێنەکردنی جومگەکان بۆ ماوەی چەند کاتژمێر جومگەکان بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک بەردەوام دەبێت.

٤- نەمانی جولەی جومگەی توش بوو بە شیوەی ئاسای پێشوی خۆی

٥- دروست بونی هەڵاوسانێک لە ژێر پێستەوە بە تایبەتی لە قوڵ دا کە پێی دەوترێ گرێ ی رۆمانتیزم

٦-ێتاقەتی، ئازار، تا، دابەزینی کێشی لەش

نەخۆشی رۆمانتیزم لەسەرەتا دا توشی جومگە بچوکەکانی دەست و قاچ دەبێت بەڵام لەگەڵ بەردەوامبونی نەخۆشیەکەو بە تێپەر بونی کات کاردەکاتە سەر جومگەکانی (ئانیشک ،شان ،ئەژنۆ،سمت ،یان حەوز و جومگەی پاژنەی پێ) هۆکارە هاندەرەکانی توش بون بە نەخۆشی رۆمانتیزم .

# Anti ccp Test
# Anti-cyclic citrullinated peptide

ئەم پشکنینە دەکرێت بۆ زانینی بوونی دژەتەن تا بەرگری بکات لە خوێن دژی سیرۆلین.

سیرۆلین: ترشی ئەمینیە کە دروست دەبێت کاتێک ئەرجینین دەگۆرێ بۆ ترشی ئەمینی بە بوونی ئەو دژەتەنانە دەلالەت لە بونی التهابی مفاصل دەکات. ئەو دژەتەنانە وردترین پشکنینە بۆ زانینی التهابی مفاصل. ئەو دژەتەنانە بەرێژەی ٧٧٪ لە لەش دا هەیە.

ئەم دژە تەنە یارمەتی دەرە بۆ زانینی نە خۆشی رۆماتیزم، بەو پێیەی کە زۆربەی ئەو نەخۆشانەی رۆماتیزمیان هەیە ئەم پشکنینە بەرز دەبێت .

**چ کاتێک دکتۆر داوا دەکات**

کاتیک رۆماتیزم ئەرزنی بوو ئەو کات ئیلتهاباتی مفاصلی زۆر دەبێت لەو کاتەدا دکتۆر ئەو پشکنینەی بۆ دەنوسێ.



هەندێ جار ئەرێنی دەبێت بە هۆی هەندێ نەخۆشی وەک:

١- شێرپەنجە

٢- لەناوچونی جەرگ

٣- بونی نەخۆشی گلۆبولین

٤- نەخۆشی هەوکردنی سینگ

٥- قلیشانی پێست رەق بونی پێست

٦- نەخۆشی گورگی سور

٧- نەخۆشی شوغرن






# Anti ds-DNA Test
# (double-stranded DNA Antibody)

ئەم دژە تەنە دەلالەت لە بونی ملیونان خانەی بەرگری دەکات لەناو لەش بە سوپایەک ناو دەبرێت کە بەرگری لە لەشی مرۆڤ دەکات دژی ئەو ڤایرۆسەی یان بەکتریا یان طفیلیات کە دێنە ناو لەش.

**هەندێ لەو نیشانانە کە دەلالەت لە بونی ئەو نەخۆشیانە دەکات**

١- ئازاری ماسولکە

٢- هەوکردنی مفاسلی چەند شوێنێک

٣- بریندواربونی پێست زۆربەی جار بە شێوەی پەپولە دەچێ لەسەر لووت و روومەت

٤- تایەکی نزم

٥- لاوازبون

٦- سڕبون و یان تەزوو هاتن بە دەستوپێ

٧- حساسیەی پێست بە روناکی

٨- هەوکردنی لە ناو چونی بەشەکانی شانە وگورچیلە و سیەکان و دڵ و دیواری دڵ و مێشک وملولەکانی خوێن



# ANA Test
# Antinuclear antibodies

ئـەم پشـكنینە ئەرێنـی دەبێـت واتـە تەنیكـی بێگانـە لـە نـاو لەشدا هەیـە یـان دەلالـەت لـە بونـی نەخۆشـی بەرگـری دەكات كـە دیارترینیـان نەخۆشـی(گورگی سـور).

لەشی مرۆڤ كۆمەڵێ دژە تەنی تێدایە كە هێرش دەكاتە سەر هەر بەكتریاو ڤایرۆسێک كە دێتە ناو لەش هەر یەكێک لەو دژە تەنانە ناوكی هەیە، بەڵام بە ئاسایی نیە لەناو خوێندا لەكەسێكی تـوش نەبـوو كـە وادەكـەن ئـەو ناوكانـە لـە لـەش دروست بێت كاتی جهازی مناعی هێرش دەكاتە سەر تەنە بێگانـەكان ئیلتهابـات دروسـت دەبێ لـە لەشـدا كاتـی جهـازی مناعـی خـودی خـۆی كـار دەكاتـە سـەر بەشـەكانی لـەش.

لـە نـاوک دژە تـەن كـە سیسـتەمی بەرگـری دروسـتی دەكات ANA دژە تەنـەكان كۆمەڵەیەكن لـە تەنی كاتی لەكاردەكەوێ لـە جیاكردنـەوەی لەبەینـی بەرگـری ناوەكـی و بەرگـری دەرەكـی بەمـەش خانـەی دژە تەنـەكان هێـرش دەكاتـە سـەر خانـە ئاسـایەكان.

## كۆمەڵێ لەو نەخۆشانیەكانی سیستەمی بەرگری :-

١- گورگی سور
٢- رۆماتیزم مفاسیل
٣- هەوكردنی بەرگری ماسولكە
٤- نەخۆشی پێست
٥- هەوكردنی غودەی دەرەقی بەرگری
٦- هەوكردنی گورچیلەی بەرگری

٧- نەخۆشی ئەدیسۆن
٩- هەوکردنی قۆلۆن
٨- ئەنیمیا خبیث



# Anti RNP Test

دژە تەنە و شیکردنەوەیەکی خودیە بەکاردێ بۆ جیاکردنەوەی رێگا جیاوازەکانی بەرگری خودی،وە هەروەها ئەگەر ئەرێنی بوو ئەوا دەلالەت لە بونی هەندی نەخۆشی شانەی دەکات

وە دەلالەت لە کۆمەلە پرۆتینەکانی ناو خانە دەکات کە قەبارەی بچوکن

A-B-KD68 وە پێکدێت لە سێ پرۆتین

لە هەندی حاڵەتدا ئەنجامی پشکنینەکە ئەرێنی دەردەچێ وەک:-

١-گورگی سور ٢- تێکچونی ناوکە خانە ٣- نەخۆشی شغرن

٤- خواردنی ئەو دەرمانانەی خوارەوە

- أسيتازول أميد (acetazolamide)
- أمينوساليسيليك أسيد (aminosalicylic acid)
- كاربيدوبا (carbidopa)
- كلورثيازيد (chlorothiazide)
- كلوربرومازين (chlorpromazine)
- كلوفيبرات (clofibrate)
- دايفن هايدانتوين (diphenylhydantoin)
- إيثوكسيمايد (ethosuximide)
- أملاح الذهب (gold salts)
- غريسوفولفين ( griseofulvin)
- هيدرالازين (hydralazine)
- هيدروكسي ترتبوفان (hydroxytryptophan)
- إيزونيازيد (isoniazid)
- ميفينيتوئين (mephenytoin)
- ميثيل دوبا ( methyldopate)
- ميثيل ثيويوراسيل (methyl-thiouracil)




**نیشانەکان ئەم نەخۆشیە چیە:-**

١- بونی ئازاری دیار لە ماسولکەکان کە دەبێتە هۆی ئیلتهاباتی زۆر لە ماسولکە کە دەبێتە هۆی تایەکی زۆر بەرز واتا وا خۆی نیشان دەدات ئینفلۆزا بێت.

٢- دروستبونی ئلتهابات لە پەردەی دەرەوەی دڵ.

٣- دەبێتە هۆی تێکچونی بەشێک لە سییەکان.

٤- کار دەکاتە سەر گورچیلەکان بە رێژەی ٥٠٪ بەهۆی ئەو ئیلتهاباتە زۆرەی کە هەیەتی.

٥- کاردەکاتە سەر کۆئەندامی هەرس بە رێژەی ٨٠٪ کە دەبێتە هۆی سوتانەوەی کۆئەندامی هەرس.

٦- کاردەکاتە سەر کۆئەندامی هەستەوەر کە دەبێتە هۆی ژانەسەرێکی زۆر کە ئیلتهاباتەکە زۆر بڵاوە کە وادەکات پەردەی مێشک ئیلتهابات دروست کات.

٧- نەخۆشی شوغرم دیاردەکەوی بە وشک بونی دەم وچاو

٨- دیارترین نیشانە کە دەبێتە هۆی ئیلتهابتی نینۆک دوای دەبێتە برین دوای رەنگی دەگۆڕی بۆ شین ئەمە دیارترین نیشانەیە.

# Anti smith(sm) Test

پرۆتینێکی بچوکە پێک دێت کە لە چەند پرۆتینێک بەستراون بە دژە تەنەکانی تری نەخۆشی خودی کە بەربڵاوترینیان ئەم پرۆتینەیە بەکاردێت بۆ دیاری کردنی نەخۆشی ذئبە حمامیە .

ذئبە حمامیە: کاردەکاتە سەر هەندێک ئەندامەکانی ناوەوەی لەش لەوانە:

١- گورچیلەکان

٢- دڵ

٣- سییەکان

٤- پێست

٥- مێشک

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

١-جیاکردنەوەی نەخۆشی ذئبە حمامیە لە نەخۆشی خودی

٢-ئازاری مفاصل

٣-تا

٤-ژانە سەر

٥-رەق بونی پێست

٦- کەمبونی کێش

٨-کەم بونی حساسیەی لە پێست

٩-گۆرانی رەنگی میز لەوانەیە رەنگی بۆر بێت .

بونی ئەم دژە لە خوێن دەلالەتێکی زۆر بەهێز لەوە دەکات کە نەخۆشەکە توش

بوە بە نەخۆشی ذئبە حمامیە ) بەتایبەت کاتێک پشکنینی بەرگریەکانی تری لەش systemic lupus erthealtoshs ئەرێنی دەبێت

**هۆکاری ئەرێنی بوونی لە خوێن ئەمانەن:-**

١-ذئبە حمامیە ٢-رەق بونی پێست ٣-التهاباتی ماسولکە ٤-هەوکردنی پێست

ئەو دەرمانانەی کاردەکانە سەر ئەنجامی ئەم پشکنینە

١-دەرمانی دژە دووگیان بون ٢-میضی سیرجید ٣-پنسلین ٤-فینیک بۆ تازون ٥-فینبۆتین ٦-بریمیدون ٧-بروکائین امید ٨-کیندین ٩-رززبین ١٠-ستریمایسین ١١-سلفا دای میثوکسین ١٢-سلفو نادا میدات ١٣- تترا سایکلین

ئەو دەرمانەی وادەکەن ئەنجامەکە ئەرێنی بێت

(Corticateroids)



# ANTI SSA(RO) Test
# Anti –sjogren syndrome A

دژە تەنەن ئەو نەخۆشانە دەیکەن کە دەناڵێن بە دەست نیشانەکانی نارێکی شانەکان, دروست دەبێت لە پرۆتینەکان کە دژە تەنەکان دژی لەش و پرۆتینەکانی لەش دەوەستێتەوە بەکاردێ بۆ جیاکردنەوەی ذئبە حمامیە و متلازمە شوغرین وە نەخۆشی شانەی

(Mixed connective tissue disease)

ئەو دژە تەنانە لەو نەخۆشانە هەیە کە توش بونە بە نەخۆشی شانەی خام یان متلازمە شوغرین یان ذئبە حمامیە یان هەوکردنی پێست لە تاقیگە بە جیهازی ئلایزە دەکرێ.

**کاتێک ئەزمونی دەبێت؟**

۱-نەخۆشی متلازمە شوغرین هەبێت ۲-ذئبە حمامیە ۳-هەکردنی مفاسل هەبێت ٤-ذئبە حمامیە طفلیە ٥-ذئبە حمامیە لە منداڵی تازە لە دایک بوو ٦-گیرانی دڵی منداڵی تازە لە دایک بوو کە دایکەکە توشی ذئبە حمامیە بوە.

**ئەم پشکنینە بەرز دەبێت لە هەریەکە لەو نەخۆشانەی خوارەوە**

۱-اعضاء تناسلی لە ئافرەت ۲-گەورەبونی غودەی العابیە ۳- ئازاری مفاسل

**نیشانەکانی ئەو نەخۆشیە:**

۱- کەمبونەوەی هەستی تام کردن ۲- سکچونێکی وشک ۳- وشک بوونی چاو ٤- وشک بونی دەم گرانی دەم و گرانی لە قسە کردن ٥- وشک بونی پێست و شەق بونی ٦- ئازارو ئەستور بونی مفاسل ۷- ئازاری ماسولکەکان ۸-ئیلتهابی زمان لەوزەتێن ۹- وشک بونی زێ ۱۰-ن ارێکی لە گەدە و ریخۆڵە ۱۱-ئیلتهاباتی قسەبات و سیبەکان.

# Anti SSB (La) Test
# Anti sjorges syndrome type B

دژە تەنی خودین کاردەکانە سەر لەش مرۆڤ بەھەڵە کە پەیوەندیەکی گەورەی ھەیە بە نەخۆشی بەرگری خودی وەک ذئبە حمامیە و متلازمە لە ژێر پێستی منداڵی تازە بوو وە زەردوی، لە ئافرەتی دووگیانی دا دەبەسترێتەوە بە بوونی نەخۆشی گورگی سور کە دەبێتە ھۆی ھەرەشە لەسەر منداڵەکە دەبێتە ناتەواوی لە دروست بونی وەک نارێکی یان ناتەواوی دڵ.

نزیکەی ٠،١ تا ٠،٥ لە سەدا توشی مرۆڤ دەبێت

زۆر جۆر دژە تەن ھەیە ئەم جۆرەیان لاوەکین لە ناو ناوکی خانەدا ھەن

بونی ئەم نەخۆشیە دەبێتە ھۆی یەکێک لەم نەخۆشیانە

١-نەخۆشی بەرگری ٢- شێرپەنجە ٣- ذئبە حمامیە ٤- قلیشانی پێست ٥-ئیلتھاباتی ماسولکە ٦- لەناوچونی خانە ٧-،کردنی جەرگی خودی کە بەھۆی دەرمانی ذئبەوە دروست دەبێ.



# ANTI SCL-70 Test
# Anti scleroderma-70

یەکێکە لە نەخۆشیەکانی بەرگری کە خانەکانی بەرگری دژی خانەکانی لەش دەوەستێتەوە کە کاردەکاتە سەر شانەکانی لەش بەوەش کاردەکاتە سەر پێست و دەمارە خوێنەکان

**نەخۆشیەکە بە دوو شێوە دەردەکەوێ**

١- دیاری کراوی Iocalized واتا بە شێوەکی دەورەدراو

٢- بڵاو بوەوە sclerosis واتا بەشێوەی رەقبوون کە توشی چەندان بەشی لەش دەبێت.

**نیشانەکانی پشت دەبەستێت بە جۆری نەخۆشیەکە:-**

**١-پێست توشبونە کە لە سەر شێوەی پەپولە**

آ- دروستبونی هەوکردن و سوربونەوە و ئەستور بون و ئازار و خوران

ب-پێست چرچ و ماسیانی لێ دێت

ت-کاردەکاتە سەر پێستی لەلای پەنجەی دەست و پێ

**٢-شێوەی مرەی دەردەکەوێ**

آ- گەڕانەوەی ترشی بۆ گەدە و وە هەست کردن بە ترش

ب- ئەگەر هەوکردنی مرەی نەمێنی دەبێتە هۆی بچوک بوونەوەی ڕێرەوی خۆراک و نەخۆش ناتوانێ خۆراک بە ئاسانی قوت بدات.

**٣-ملولە خوێنیەکان**

آ- بونی ملولەی خوێنی بچوک لەسەر دەست و قاچەکان و دەرچون و شینبونیان لە کاتی هەست کردنی بە سەرما.

ب- دروست بوونی ملولە بەشێوەی ماکی سور لەسەر دەموچاو لێو

ت- نەخۆش توشی زەخت دەبێ کاتێک کێشەیەکی لە گورچیلە هەبێ

**٤- سییەکان**

آ- بە زۆر هەناسەدان ب- بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن لە سییەکان

**٥-ریخۆلەکان**

آ- قەبزی  ب- هەندێک جار سکچون

**هۆکاری توشبون بەو نەخۆشیە چیە:-**

هـۆکاری تـا ئیـستا نەزانـراوە بـەڵام زانـاکان کۆکـن لەسـەر ئـەوەی بەهـۆی کارتێکـەری جینـات روودەدات کـە بەرگـری بەشـێوەیەکی نـا ئاسـای کاردەکاتـە سەر لەش، بەڵام هەندی هۆکار هەن دەبنە کارتێکەری توش بون بەو نەخۆشیە

١- توشبون بە نەخۆشیێ ڤایرۆسی

٢- گرنتی توشبون لەلایەن یەکێک لە تاکەکانی ماڵەوە

٣- ئافرەتان زیاتر توشی دەبن لە پیاوان

٤- هەندێک دەرزی کە بەکاردێ بۆ چارەسەری شێرپەنجە

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

١- کاردەکاتە سەر ئیشکردنی سی یەکان کە هەناسەدان نارێک دەکات

٢- لەکارکەوتنی گورچیلە

٣- نارێکی لە دروستبونی لە دڵ ئەشەلی ماسولکەکانی دڵ

٤- کۆبونەوەی ئاو لە دەوری دڵ

٥- نارێکی لە ددانی هەڵومڕینی

٦- لاوازی ئاو هاتنەوە




**تێبینـی:** دکتـۆر دەستنیشـانی نەخۆشـیەکە دەکات دەبێت نەخـۆش ئەم پشکنینە بکات وە ئەشیعە بۆ سـینگ پێویـستە بیگیـرێ.

# C3 Test
# Complement 3

یەکێکە لە کۆمەڵە پرۆتینانە کە فەرمانیان یارمەتی دانی کۆئەندامی بەرگریە لە دژی میکرۆبات بەتایبەتی بەکتریا و ڤایرۆس ئەو نیزامە پێکهاتەیەکی ئالۆزە کە دروستکراوێکی ئالۆزی بەرگری دروست دەکات .

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی پێکهاتەی(مکونات) تەواو لە خوێن، کە دەلالەت لە کۆمەڵە پرۆتینیک دەکات کە فەرمانیان یارمەتی کۆئەندامی بەرگری دەدەن لە دژی میکرۆبی تر دەگۆرێت بە تایبەت بۆ بەکتریا و ڤایرۆس،ئەم پێکهاتەیە دەورێکی گرنگی هەیە لە قۆناغی ناسینی تەنی بێگانە وە دروست کەرێکی ئالۆزی بەرگریە (immune complex) بۆ دژەتەن

لە رێکخەری پرۆتینات زیاتر لە ٢٠ پێکهاتە هەیە، بەڵام دوو لەو پێکهاتانە زیاتر دەکرێ ئەوانیش (C4-C3) لەنەخۆشی هەکردنی ئاستیان نزم دەبنەوە پێکهاتەکان وە لەلایەکی تر نەبونی هەندی پێکهاتە لە کۆرپەلە توشی چەندان نەخۆشی دەکات وەک توش بوو بە بەکتریا کەوا دەکات توشی هەوکردنی (ئیلتهاباتی) سییەکان بێت.

**نیشانەکانی ئەم پشکنینە چیە:-**

١- لاوازی ماسولکە

٢- وشک بونی چاو دەم

٣- ئازاری بەردەوام

٤- ئازاری پێ

٥- نەخۆشی نقرس

٦- مەینی خوێن بەناو دەمارەکان

٧- ژەهراوی بونی

٨- ذئبە حمامیە

٩- ئیلتهابی پەرەی تەنکی دڵ

**نیشانەکانی کەمی ئەم پشکنینە:-**

١- لەکارکەوتنی هەربەشێکی چیندراو

٢-ئلتهاباتی قۆلۆن

٣- هەوکردنی گورچیلە

٤- نەخۆشی دەمار

٥- هەوکردنی جەرگ یان بەشێک لە بوونی جەرگ

٦- نەخۆشی دەمار

**نیشانەکانی بەرزی ئەم پشکنینە:-**

١- هەوکردنی مفاسل

٢- هەوکردنی پێست

٣- تای رۆماتیزم



# C1 Inactvator Test

یەکێکە لە کۆمەڵە پرۆتینانە کە فەرمانیان یارمەتی دانی کۆئەندامی بەرگریە لە دژی میکرۆبات بەتایبەتی بەکتریا و ڤایرۆس ئەو نیزامە پێکهاتەیەکی ئالۆزە کە دروستکراوێکی ئالۆزی بەرگری دروست دەکات،

ئەم پشکنینە حاڵەتی هەلئاوسانی شوێنکەیە کە شێوەی بەش بەش هەلئاوساو دروست دەبێ بەهۆی کۆبونەوەی شلە لە دەرەی دەمارە خوێنیەکان کە خورانی نایێت بە شێوەیەکی گشتی لە جمجمەی سەر بە زۆری دروست دەبێ و لە دەموچاو بە تایبەت لێوەکان لە چەند شوێنێکی تری لەش دەبێت.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

١-ئازاری سک ٢-دڵ تێک هەلاتن و سکچون ٣- دروست بوونی هەڵئاوسان لە دیواری ریخۆڵە لەوانەیە ببێتە هۆی گران فرێدانە دەرەوەی پاشماوە وە هەندێ جار دەگیرێ ٤- هەندێ جار گیرانی دیواری سییەکان کە وادەکات مرۆڤەکە بمرێت ٥- ئاوسانی دەستەکان ٦- ئاوسانی پێیەکان ٧- ئاوسانی ئەندامی زاوزێ.

**تێبینی:** ئەو ئەستور بوونە لە ماوەی ١٢-٣٦ سەعات بڵاودەبنەوە و لەماوەی سێ رۆژ نامینێت پاش وەرگرتنی دەرمان.

**تێبینی:** ئەگەر ئەم پشکنینە ئاسای دەرچوو

ئەوکات دکتۆر گومانی لە هۆکاری کۆبونەوەی ئاو لە لەش دەکات بە یەکێک لەم هۆکارانە:

١- لە کارکەوتنی دڵ و گورچیلە جەرگ

٢- مەینی خوین لە دەمارەکان

٣- نارێکی لە کۆئەندمی بەرگری هەرس

# C4 Test
# Complement 4 test

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی نارێکی لە منداڵی تازە بوو یان بۆ زانینی نەخۆشی بەرگری خودی وەک ذئبە حمامیە یان نەخۆشی دەمار یان ئیلتهابی لە ئەدرینەل گلاندی سەر گورچیلە یان هەوکردنی جەرگ کە دەبێتە هۆی بەرزی C4.
کەم دەبێت لە هەندێ نەخۆشی ئاوسانی بۆ ماوەی بە هۆی کەمی C1 و هەروەها کەم دەبێت لە نەخۆشی ذئبە حمامیە کاتێک خانەی LE cells نابێت.

**هۆکارەکانی بەرزی ئەم پشکنینە:-**

١- شێرپەنجە

٢- هەکردنی پێست و ماسولکە

٣- هەوکردنیمفاسل رۆماتیزم

**هۆکارەکانی نزمبونی ئەم پشکنینە:-**

١-هەوکردنی قصباتی زۆر ٢-خواردنی جگەرە ٣-کەمی بەهۆی ناتەواوی لە کاتی لە دایک بون ٤-کەم دەبێت بەهۆی بەرز بونەوەی الغلوبیولیناتی سار (cry globulinemia) ٥-ئاوسانی بۆماوەی ٦-زیادبونی گاما گلوبیولین لە خوێن ٧- هەوکردنی گورچیلەی ذئابی (lupus nerphritis) ٨-نەخۆشی دەمار ٩- ئلتهابی ناوکەپەتک .

**تێبینی:** کەمی ئەو پێکهاتانە لە لەش وادەکات لەش زوو توشی بەکتریا و ڤایرۆس بێت.

# LE Cell Test
# (lupus erythematosus)

ئەو پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی ئایا توشی گورگی سور بوە یان نا ئەو نەخۆشیە نەخۆشیەکی بەرگریە جیادەکرێتەوە بەوەی کە زەرەر بە شانە جیا جیاکان دەگەیەنێ بەتایبەتی گورچیلە و پێست و هەروەها مفاصل و کۆئەندامی هەستیاری مێشک.
خوێن لە نەخۆش وەردەگیری تێکەڵ دەکرێ لەگەڵ پرۆتین خانەی تایبەت کە لە تاقیگە ئامادەکراوە ئەگەر لە خوێنی نەخۆش دژە تەنی هەبوو بۆ ئەو پرۆتینانە واتە توشی دەبێت خانەکانی مایکرۆفەیج کە هەڵدەستێ بە قوت دانی پرۆتینەکان و ئەوانەش خانەی ئاساین و هەروەها بە ئاسانی لە ژێر مایکرۆسکۆپ دەناسرێنەوە ئەم پشکنینە زۆر باوەرپێکراو نییە بۆ دیاری کردنی گورگی سور چونکە ٪٢٥ لەوانەی توشی نەخۆشی گورگی سور دەبن خانەکانی LE یان نییە لەبەر ئەوە ئەم پشکنینە لەو رۆژگارەدا بەکارهێنانی کەم بوە لە جیاتی ئەو ANA بەکاردێ.

**ئەو دەرمانانەی کاردەکەنە سەری:**

١-هیدرالازین
٢-برۆکاینامید
٣-ڤینتۆین
٤-مضادات حبویە لە خیزانی پنسلین
٥-سولفۆنامیدات
٦-میثیل دوبا
٧-ایزونیازید
٨-ریزربین
٩-فینیل بوتازون

هەروەها حەبی دووگیان نەبونیش لەوانەیە ئەنجامەکەمان بە ئەرێنی درۆینە بداتێ.

**چ کاتێک ئەرێنی دەبێ ئەم پشکنینە:-**

١-گورگی سوری هەبێ

٢-هەوکردنی رۆمانتیزمی هەبێ

٣-هەوکردنی پێست لە جۆری رەقبون و شەق بونی پێست

٤-هەوکردنی جەرگ بە هۆی بەرگری خودی

**چۆن ئەم پشکنینە ئامادە دەکرێ لە تاقیگە دا:-**

وەڵام- نیتۆفیلەکە لە خڕۆکە سورەکان بۆ ئەوە بە سودە بۆ دەست نیشان کردنی نەخۆش کە هەندێک لە خوێن دەخرێتە ناو تیوب کە هیپارینی تیدا بێت سەنترفوج دادەنرێ بۆ ماوەی نیوسەعات وە پاشان مەسحەی لێ دروس دەکرێ و دەخوێنری لە ژێرمایکرۆسکۆپی

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە :-**

١- لاوازی ماسولکە

٢- وشک بونی چاو دەم

٣- ئازاری بەردەوام ئازاری پێ

٤- هەوکردنی مفاصل کە ئەستور سوربونەوە



# P-ANCA Test
# C-ANCA Test
# (Anti neutrophil cytoplasmic antibodies)

بەرگریەکی خودیە بۆ چاودێری کردنی ئلتهاباتی دەمارە بچوکەکانی لەشی مرۆڤ، ئەم پشکنینە بەکاردی بۆ زانینی هەندی نەخۆشی گورچیلە و سییەکان.

**دوو جۆری هەیە**

دژەتەن دژی ئەنزیمی پرۆتینات PR3

دژە تەن دژی ئەنزیمی میلوکسیداس پێی دەڵێن پیانکە دەتوانری بە هۆی ئامادەکردنی خرۆکە سپیەکان کە لە خودی مرۆڤ وەردەگیری کە ئامادە دەکری بەهۆی فۆرمالین و ئیتانۆل کە لە وینەکەی خوارەوە دیارە ئە ئەنزیمە بارگەی کارەبای لاوازە کە تێدا خۆی دەنوێنی بە رەنگی سور وە جیادەبێتەوە لە حبیبات لە کاتی کاری ئامادەکردنی ئیتانۆل لە دەوری خرۆکە سپیەکان کۆدەبێتەوە پێدەڵێن پیانکە.

بەڵام سیانکە کە لە وێنەکە دیارە خالە سەوزەکان کە لە دەوری حبیبات دەمینێتەوە کە لە کاتی ئامادەکردنی بە ئیتانۆل لەبەر ئەوەی هیچ وزمەکی کارەبای نییە یان هەڵناگری.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

١- نەخۆشی گورچیلەی هەبی ئازارێکی زۆری هەبێ.

٢- خوێن هاتن لە میز.

٣- میز زۆر دەکات.

٤- نەستوربونی لەش.

٥- هەناسە تەنگی.

٦- زەختی بەرز بی بێ ئەوەی هۆکارەکای دیار بێت

٧- ئیلتهاباتی زۆر لە سییەکان دەبێتە هۆی دروست بوونی بەڵغەم .

٨- ئیلتهاباتی قۆلۆن.

٩- هەوکردنی مفاسل

٩- هەوکردنی لە دەمارە بچوکەکانی لەش وەکو دەورویەری چاو



# ANTI GBM Test
# Anti –glomerular basement membrane

یەکێکە لە نەخۆشییە بەرگریەکانی خودی پێی ناودەبرێ بە نەرمی بەردەوامی سییەکان و لەگەڵ هەوکردن خێرای گورچیلە و لەگەڵ پەردەی ئەدرینەل گلاندی سەر گورچیلە کە ناسراوە بە ناوی Anti –glomerular basement membrane کە پەردەی دەرەوەی سەرەکی گورچیلە و سییەکان لە ناو دەبات هەتا ئێستا دیار نیە هۆکاری.

**چییە ئەو نەخۆشیە.**

دەناسرێتەوە لە کاتی وەرگرتنی پارچەیەک نمونە لە سی یەکان و گورچیلە کە رەنگی شازیان هەیە بونی ئەو نەخۆشیە لە ملیۆنێک یەک کەس هەیتی بە تایبەتی لەو پیاوانەی سێ یەکی تەمەنیان بەرێ کردوە.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە لە گورچیلە و سی یەکان دەردەکەوێ**

١- لە زۆربەی نەخۆشیەکان hemoptysis بە یەکەم نیشانە دادەنرێ لە زۆربەی نەخۆشیەکان

٢- لەوانەیە لە کاتی گرتنی اشاعە lung filtaration دەربکەوێ

٣- لە کاتی کۆکە

٤- لە کاتی هەناسە تەنگی

بەڵام لە گورچیلە نیشانەکانی تا درەنگ دەرناکەوێ لە تاقیگە کەم خوێنی دەردەچێ و رێژەی دووانە ئۆکسیدی زیاد دەکات، نیوەی ئەو نەخۆشانەی توشی ئەو بەرگریە خودیە دەبن توشی لەکارکەوتنی گورچیلە دەبن یان بوونی خوێن لە میزدا

# Pathergy Test

ئەم پشکنینە ناسراوە بە نەخۆشی بەهچتی کە هەوکردنی زۆر لە دەمارەکان دروست دەکات لە هەموو شوێنەکانی لەش هەتا ئێستا هۆکاری سەرەکی نازانرێ بەڵام لەوانەیە بەهۆی بەرگری خودی بێت.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

١- برینی ناو دەم ٢- هەوکردنی چاو ٣- قلیشان و هەڵسانی پێست ٤- برینی دەرەچەی زاوزێ

-بەربڵاوە بەشێوەیەکی زۆر لە تورکیاو یابان بە تایبەتی و ناونراوە لە لایەن تورکەکانەوە، چونکە زیاتر لە تورکیا بڵاوە، ئەم نەخۆشیە هەموو بەشەکانی لەش دەگرێ تەنها مێشک نەبی کە بە کەمی دەیگرێ، بەڵام گرتنی بە نەخۆشیەکی ترسناک دادەنرێ کە لە شێوەیەکی ئازار بەخش لەسەر گۆرانی هەڵسوکەوتی مێشکی دەکات، لە ریخۆلەکان ئازار لە سک دروست دەکات بە سک چونێکی زۆریش دەبێت کە زۆربەی سک چونێکی خوێناویە، لە زۆربەی نەخۆشیەکان کاردەکاتە سەر دەمارەکان و دەبێتە ئیلتهاب و دەبێتە هۆی دروست بونی کیسی خوێنی لە سەر دیواری دەمارەکان کە دروست دەبێ بەهۆی لاوازی دیواری دەمارەکان بەهۆی ئیلتهاباتی کە لەوانەیە ببێتە هۆی خوێنبەربونێکی زۆر کە پەیوەندی بەو بەشەی کە خوێن بەربونێکەی لێ روودەدات وەک تەقینی دەماری سییەکان کە دەبێتە دروست بونی خوێن بەربوونی لە سییەکان لەوانەیە زیاد بێت و ژیانی بکەوێتە مەترسیەوە سەرەرای بەکارهێنانی چارەسەر و دەرزی ٪٢٥ی نەخۆشیەکان توشی کۆرەبوون دەکات.

# Anti cardiolipin Test (IgG-IgM-IgA)

گەردیلەیەکی چەوریە بەشێوەیەکی ئاسای لەناو پەردەی خانە و پەرەکانی خوێندا هەیە لەکاتی لەبارچونی کۆرپەلە بە تایبەتی دەکرێ چونکە ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە خوێن مەین، یەک دەگرێ کارلێک ڕوودەدا بەمەش anti body لەگەڵ cardiolipin وە ئەگەری هەیە ئەنجامێکی نائاسایمان بداتێ لە هەندێ نەخۆشی وەک (شێرپەنجە—ئایدز).

لەهەندێ حاڵەت دا ئەم پشکنینە دەکرێ :-

١- لەبار چون

٢- thromobocytopine

٣- SLE

**تێبینی:** ئەگەر Igg-Igm دەرنەکەت دکتۆر بەگوێرەی نیشانەکانی تەکید دەزانێ کە هەیتی ئەوا پشکنینێکی تری بۆ دەنوسی ئەویش IgA بەوپشکنینە دەزانین کە ئەو نەخۆشیەی هەیە .

دوو جۆر Anti cardiolipin هەیە

١-کاتی

٢-درێژخایەن

بۆیە دەبێ نەخۆش پاش چەند هەفتەیەک ئەو پشکنینە بکاتەوە بۆ دڵنیا بوون لە جۆرەکەی

**نیشانەکانی Thrombotic چیە**

١- کورت بونەوەی هەناسە دان

٢- سەر ئێشە

٣- ژان و ئەستور بونی دەست و پیەکان

# ANTI PHOSPHO LIPID Test (IgG-Igm)

گەردیلەیەکی چەوریە بەشێوەیەکی ئاسای لەناو پەردەی خانە و پەرەکانی خوێن دا هەیە.
لەکاتی لەبارچونی کۆرپەلە و رۆڵێکی گرنگی هەیە لە خوێن مەیاندن بەتایبەتی دەکرێ، چونکە رۆڵێکی گرنگی هەیە لە خوێن مەین،
anti phospholipid جۆرێکە لە cardiolipin
لەهەندێ حاڵەت دا ئەم پشکنینە دەکرێ:-

١- لەبار چون
٢- thromobocytopine
٣- SLE

Secondary Antiphospholipid syndrome

- Antiphospholipid syndrome (APS) is characterized by recurrent arterial and /or venous thrombosis, fetal loss and thrombocytopenia. High titer of Antiphospholipid antibody can be found in APS patients.

# Lupus anticoagulant Test

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی جەڵتەی خوێن و بۆ زانینی کاتی ثرۆمبۆپلاتین وە بۆ زانینی لە بارچوونی چەند جارێک لە سەر یەک.

-دژە تەنی خودیەکە سیستەمی بەرگری دروستی دەکات بۆ مەینی بەرگری کە بەهەڵە کاردەکاتە سەر خانەکانی لەش کە روودەکاتە سەر چەوری فۆسفاتی و هەروەها ئەو پرۆتینانەی کە بەستراوە فۆسفۆلیبیدات کە لەبەشی سەروی دەرەوەی خانەکان پەردەی خانەکان ئەو دژە تەنانە یارمەتیدەرن لە کاری مەیینی خوێن بەرێگەیەکی دیاری نەکراو کە زیاد دەبێت و کاردەکاتە سەر کەسەکە.

**چ کاتێک ئەم پشکنینە دەکرێ :-**

١-کەسێک کە خوێن مەینی دەمارەکانی هەبێت بەبێ هیچ هۆکارێک یان نیشانەکانی.

٢- ئازارو ئەستوربون

٣- مۆربون و رەنگ بونی لاقەکان لە کاتی مەین

٤- ماندوبونی بەردەوام

٥- ئارەقەکردن

٦- بە پەلە هەناسەدان لەگەڵ گیرانی سیەکان

٧- ئافرەتێك چەند جارێک منداڵی لەبارچێت و نیشانەکانی دەلالەت لە بونی دژە تەن بکات عادەتەن هەتا پاش ١٢ سەعات پشکنینە ناکرێتەوە بۆ دڵنیابون.

**تێبینی:** ئەگەر ئەرێنی دەرچوو پشکنینەکە پاش چارەسەر دەبێ دووبارە بکرێتەوە تاکو بزانرێ زیادی کردیە یان نا چونکە لەش توانای زیاد کردن و کەم کردنی هەیە،وە ژماردنی پەرەکانی خوێن کەمبونی پەرەکانی خوێن لە لایەن ئەو کەسانەی کە دەرمانی دژە مەین وەردەگرێ .

**تێبینی:** ئەگەر ئەو پشکنینیەکە ئەرێنی بوو ئەوا پشکنینی VDRL بۆ دەکەین چونکە بە ئەرێنی بونی VDRL ئەویش ئەرێنی دەبێ.

**هەروەها پشکنینەکە ئەرێنی دەبێ لە کاتی بوونی**

١- نەخۆشی ڤایرۆسی

٢- کەمی بەرگری

٣- کەمی بەرگری خودی

٤- نەخۆشی ئایدز

٥- شێرپەنجە

ئەو دەرمانانەی کە کاردەکاتە سەر ئەم پشکنینەکە

١- فینوثیازینات

٢- بنسلین

٣- کینیدین

٤- هیدرالازین

٥- برکنیاد

٦- فوسیدار

٧- ئەو نەخۆشانەی هیپارین وەردەگرێ











# Anti TTG-a Test
# Anti transglutaminase antibodies

دژەتەنن لە پرۆتینی غلوتامین دەورێکی گرنگی هەیە لە کۆئەندامی بەرگری لە رێگەی کەشفکردنی خانەکان و مەوادەکانی دووری دەکاتەوە کۆئەندامی بەرگری ئەو خانەو مەوادانە لەوانەیە دەرەکی بن وەک ڤایرۆسات یان لەوانەیە لەش خۆی دروستی بکات وەک خانەکانی شێرپەنجەی ئەو دژە تەنانە کاتێک کاردەکاتە سەر خانەی شێرپەنجەیەکانی لەش خودی خۆی پێی دەوترێ دژە تەنی خودی واتا دژی کۆئەندامی بەرگریە کە دەبێتە هۆی نەخۆشی بەرگری ئەو نەخۆشانەی کە زیاتر توشی ئەو بەرگریە خودیە دەبن
١-نەخۆشی ئلتهاباتی ریخۆڵە ٢-کەم بونی کێش ٣-کەم بونی ئاستی هیمۆگلۆبین ٤-کەم بونی ئاستی کۆلیسترۆل ٥-زیاد بونی ئاستی گلوکۆز ٦-نیشانەکانی دیار نین لەکاتی شێر پەنجە ٧-نارێکی لە هەرس کردن



# Anti TTG-G Test
# Anti transglutaminase antibodies

دژەتەنن لەسەر رووی ریخۆڵە و کۆئەندامی هەرس و غودەی تناسلی بەرگری دەکات لە ریخۆڵە
وە غودەی تناسلی لە نەخۆشی ڤایرۆسات مشەخۆرەکان بەرگری دەکات .
ئەم پشکنینە دەست نیشانی ئەم نەخۆشیانە دەکات
١-کەمی بەرگری (مناعە)
٢-نەخۆشی شەکرە
٣- مایلوما

## ئەو دەرمانانەی کاردەکەنە سەر ئەم پشکنینە

١-فینیتون
٢-پنسلین

## کردنی ئەم پشکنینە لە تاقیگە :-

پێویستە نەخۆش ئەو خواردنانە بخوات کە غلوتینی تێدایە یان دەرمانی غلوتین بخوات پێش کردنی پشکنینەکە، یەک هەفتە دکتۆر پێی دەڵێ کە ئەو خۆراکانە بخۆ کە دەوڵەمەندە بە غلۆتین وەک نان معکرونی کە لەش دژەتەن بەرهەم دەهێنێ کاتێک غلۆتینی زۆر لەکاتی راگرتنی غلۆتین هیچ دژەتەنیش نامێنی کە وەڵامی بداتەوە

# Anti Endomysial-A Test
# Anti Endomysial-G Test

ئەم دوو پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی بونی دژی گەنم ئەگەر ئەرێنی بوو ئەوا پێویستە دکتۆر سەیری ریخۆڵە بکات بە نازوور وە دوای پارچەیەک لە ریخۆڵە وەردەگرین بۆ دڵنیا بون لە بوونی نەخۆشی هەستەوەری(حساسیە) دژی گەنم بە دوو رێگا ئەم پشکنینە دەکرێ.

**١- بە شیکردنەوەی دژە تەنەکان**

هەروەک زانراوە لە لەشی نەخۆش توش بوە بە هەستەوەری گەنم کۆئەندامی بەرگری دژە تەن بەرهەم دەهێنی بۆ بەرەنگار بونەوەی لەش کاتێک کەسەکە گلۆتین وەردەگری جا بە هەر سەرچاوەک بێت، پشکنینەکە دەکرێ دەگەرێ بەدوای ئەو دژە تەنانە چونکە بونیان واتە بونی هەستەوەری دژی گەنم لەبەر ئەوە پێویستە کەسەکە گەنم بخوا پێش ئەوەی پشکنینەکە بکات،

چەند پشکنینێکی تر هەیە دەکرێ بۆ دیاری کردنی ئەم نەخۆشیە

١- +TG-IgA

٢- +TG IgG

٣- AGA-IgG

٤- AGA-IgA

٥- EMA-IgA

٦- Total serum IgA

لە نێوان هەموو ئەو پشکنینانە +TG-IgA بە دڵنیا ترین پشکنین دادەنرێ بۆ زانینی بونی ئەم نەخۆشیە وە دکتۆر داوای Total serum IgA دەکات بۆ زانینی کەمی ئەم دژە تەنە کە لە هەندێ مرۆڤ روودەدات وا دەکات ئەنجامیکی نەرێنی بدات وە لە حاڵەتی کەمی Total serum IgA دکتۆر داوای +TG-IgA،+TG IgG بەڵام بە نسبەت Iiadin antibodies ئەم پشکنینە کە کەمتر تەکیدی لەسەر دەکرێ بۆیە رەتکرایەتەوە ئێستا گۆراوە کراوە بە IgG-IgA کە زیاتر بە پشکنینی تەکید

# enterobius vermicularis

نەخۆشی دەبوسیە وە هەروەها ناسراویشە. نەخۆشی ریخۆڵە دیارترین نیشانەکانی خورانی کۆمە کە وادەکات خەو زراو بێت کاتی پێویس بۆ دانانی هێلکە ٤-٨ هەفتەیە زیاتر توشی منداڵانی سەرەتای خوێندن دەبێت هێلکەکانی بەهۆی مایکۆسکۆپەوە دەبینرێ وە کرمەکان لە دەرەچەی کۆم یان توالێت دەبینرێ بەهۆی جولانەوەی یان رەنگی زەردیکی کاڵە.




Enterobius vermicularis egg





# schistosoma mansoni

لەمولولە خوێنەکان دەژین لە نزیک schistosoma ریخۆلە کە نەخۆش توشی VESSELS بەلهاریسیا تووش دەکات کە دەناسرێتەوە کە نێرو مێیە بە یەکەوە دەژین لە رێگەی ئاوەوە دەگوازرێتەوە یان لە رێگەی بەرکەوتنی پێست.








# Ancilostomose

دوو جۆرە گەشەیان هەیە کە تیدا هەیانە ژیانی سەربەست لە ژینگەی دەرەوە دەژی ئەوەیتریان مشەخۆر هێلکە لە ریخۆلە دادەنری پاش ئەوەی دەتروکێ لەسەر زیندەوەر دەژی .



Ovos



*Ancilostoma* – 20 ■ 30 mil ovos/dia
*Necator* – 6 ■ 11 mil ovos/dia



# Strongyloides

دەگوازرێتەوە بە دەست دان لە شتێکە ئەو مشەخۆرەی لەسەر بێ وە دیواری پێست دەبڕێ دەچێتە سیەکان پاشان بۆ ڕێڕەوی هەناسە بۆ دەم تا وەکو بڕواتە بۆ ناو ڕیخۆڵەکان .

**نیشانەکان:**

**١-خورانی ناوچەی کۆم لەوانەیە ببێتە هۆی دروستبونی ئیلتهابات لە پیسایی**








# Iodamoeba butschlii

ئەمیبایەکی مشەخۆرە کە درێژیەکەی ٨-١٠ مایکرۆیە نیشانەکانی زۆر بەیەکتری دەچی تەنها بەپشکنین دەناسرێتەوە.








# balantidium-coli

لە قۆلۆن دەژی بە هۆی دەست لێدان یان خواردن یان خواردنەوەی پیس توش بوو وە گواستنەوەی ئاسان نیە لە کەسێکەوە بۆ کەسیکی تر
نیشانەکانی دەیتە هۆی دروستبونی سک چون لە ٢٠ دەقە جارێک دەیتە دروستبونی قۆلۆن وە دەیتە هۆی مەترسی لە سەر نەخۆشەکە.









# Giardia Lamblia

جیاردیا لامبلیا کە هەندێ جار پێشی ئەوترێ (giardia intestinales)، مشەخۆرێکی قامچی وەشێنە و ناوک ڕاستەقینەیە، لەڕەگەزی (sarcomastigophora)ایە کەوا دەچێتە ناو ڕیخۆڵە باریکە(small intestine) و لەوێدا زۆر دەبێت و وەچە دەخاتەوە و داگیری دەکات، وە (anaerobic)ە واتە لەژینگەی بێ ئۆکسجینی ئەژی،وە بە ڕێگەی(binary fission) واتە پانە دووکەرت بوونی ئاسای زۆر دەبێت، مرۆڤ و هەندێک لە ئاژەڵان توشی نەخۆشی (Giardiasis) دەکات، ئەمەش بەهۆی بەرەکەوتن بە ئاژەڵ یان خۆراک و ئاوی پیس بوو بەم مشەخۆرە توشی دەبین.

**نیشانەکانی جیاردیاسس لەوانەیە دوای دوو ڕۆژ لە توشبوون دەست پێ بکەن، کە ئەمانەن:**

- سکچوونێکی توند
- غازاتی زۆر
- تێکچوونی گەدە
- دڵ تێکهەڵهاتن یان ڕشانەوە

لە ئەنجامدا کەسەکە توشی وشک بوون و لەدەست دانی ئارەزووی خواردن دەبێت و دەبێ بە زووی چارەسەری پێ بدرێ.

ئەو ژەهراوی بوونە دەکرێت کەم ببێتەوە و چارەسەر ببێت لە ماوەی نێوان(٢_٦) هەفتە، بەڵام هەندێک جار دەکرێ ماوەکە زۆرتر بخایەنێت، وە ئەم ژەهراوی بوونە دەکرێت تەنها لە کەسەکە بمێنێتەوە وە دەکرێت بگوازرێتەوە بۆ کەسانی تر.

**چارەسەر دەکرێت بە هۆی:-**

Tinidazole

Metronidazole

Albendazole

**خۆپاراستن:-**

١- شوشتنی دەستەکان بەجوانی پێش نان خواردن و دوای نان خواردن و لە دوای هاتنە دەرەوە لە تەوالێت.

٢- زۆر مامەڵە نەکردن لەگەڵ ئاژەڵان.

٣- پاک راگرتنی شوێنە گەشتیاریەکان.

٤- دوورکەتنەوە لە کاری سێکسی نادروست چونکە لە رێی کۆم یان دەمەوە دەگوازرێتەوە.

٥- دوور کەوتنەوە لە خۆراکی پیس بوو.

٦-شوشتنەوەی سەوزەو میوەکان بە ئاوی کوڵاو پاشان خواردنی.

# STOOL CULLTURE Test

راستە بە شێوەیەکی ئاسایی چەندین جۆر مایکرۆ ئۆرگانیزم هەیە لە پیسایی لەگەڵ ئەوەش چەند جۆرێک مایکرۆئۆرگانیزم هەیە لەو کەسانە نابێت کە باری تەندروستیان باشە.

جگە لە میکرۆرگانیزمەکان تاک خانە وەک ئەمیبیاو کرم دەبێتە سک چون و نارێکی لە ریخۆڵە بۆ دەستنیشانکردنی و زانینی هۆکاری سک چوون و ناریکی یەکەی پێویستی بە پشکنینی پیسای هەیە لەم زەرعە دا لە دوای مایکرۆئۆرگانیزمەکان دەگەرێن وە هەندێ جار لە خانەی خرۆکە سپیەکان دەگەرێن کە دەلالەت لە بونی ئلتهابات دەکات.

کە پێویستە لەکاتی چاندن (زەرع) بە زوترین کات پیسایەکە ببریتە تاقیگە لەبەر ئەوەی هەندێ لە طفلیاتەکان وەکو ئمیبیا یان هەندێک ژەهر کە لە دەرەوەی لەش ناتوانیت بژی ئەگەر کاتەکە زیاتر بیت لە نیو سەعات.

### شتیک کاردەکاتە سەر ئەنجامی پشکنینەکە

١- ئەنتی بایۆتیک کار دەکاتە سەر ئەنجامەکە چونکە نایەلێت بەکتریاکان گەشە بکات .

**تێبینی:** پاش ئەوەی زرعمان بۆ کرد پاش ٢٤ سەعات ئەگەر یەکیک لەو بەکتریانەی تیدا نەبو ئەوا زەرعەکەی خاوینە واتا ئەنتی بەدی بۆ ناکرێت وەک ئەمانەی خوارەوە

١- Shigella

٢- Selmonella

٣- Compilobacer

٤- هیچ طفەلیات و کرم نی یە

بەشێوەی ئاسای لە ریخۆلە بەکتریا هەیە بەڵام عادەتەن ئەو بەکتریایە دیاری

ناکرێت تەنها ئەوانەی سەرەوە دیاری دەکرێت لەگەڵ کیسی ئەمیبیا (omoeba cyst)، بونی خوێن و خانەی خرۆکە سپیەکان دەلالەت لە بوونی ئیلتهابات دەکات لە قۆلۆن

١- سالمۆنیلا: جراثیمی ریخۆلە کە دەبێتە هۆی ئلتهابی قۆلۆن هەندێک جار ئەو جرثومە دەبێتە هۆی تا.

٢- شغیلا: بەکتریای ریخۆلەیە کە دەبێتە هۆی ئلتهاباتی قۆلۆن بە تایبەت لە منداڵان.

٣- قۆلۆنیە (E-COLI): بەکتریایەکە دەبێتە هۆی دروستبونی ئلتهابات لە رێرەوی میز هەندیک لەم جۆرە بەکتریایە وەک H7:0157 دەبێتە هۆی سک چونی خوینی ترسناک.

٤-campilobactir : جۆرێکە لە بەکتریا توشی ریخۆلە دەبێت

٥-cyct: عادەتەن لە ئەمیبیەکان ئەو طفلیاتەیە کە تاک ناوکی هەیە دەبێتە هۆی یئلتهاباتی قۆلۆن.

عادەتەن بەکتریاکە ناپشکینری بەڵکو ئەو ژەهراویە کە دەری دەدات بۆ نمونە لەو نەخۆشانەی کە شک دەکرێ توش بوبن بە جرثومی مطشیە عسیرە (clostridium difficle) بۆ نمونە ئەو کەسانەی ئەنتی بایوتیک دەخۆم و سک چونیان هەیە پێویستە یەکسەر پشکنینی پیسایی بۆ بکرێ.





# STONE ANALYSIS Test

پشکنینی بەردی گورچیلە، بەرد لە ڕێڕەوی میزدا هەیە کە لە هەردوو گورچیلەدا هەیە یان، بەرد پێک دێت لە مەوادی سروشتی کە لە میز دەردەدرێت کە لە هەندێک پرۆتین ئەو مادانەی کە هەنە لە بەرد بریتین لە ئریک ئەسید،کالیسیوم، کالیسویم ئۆکزالات، فۆسفات، کاربۆنات.

## هۆکارەکانی دروست بوونی بەردی گورچیلە:-

چەندین هۆکار دەبنە هۆی زیادبوونی ئەگەری دروست بوونی بەردی گورچیلە لەوانە (کەم خواردنەوەی ئاو، چڕبوونەوەی میز بۆ نموونە ئیشکردن لە شوێنی گەرم دەبێتە هۆی لەدەستدانی بڕێکی زۆر لە ئاو بە شێوەی ئارەقکردنەوە و کەمبوونەوەی میزکردن، بوونی هۆکاری بۆماوەی و ژینگەیی، ئەوکەسانەی بەردی گورچیلەیان هەبووە ئاسانتر دروستی دەکەنەوە.

لە کردنی ئەم پشکنینە چەن شتێکی ئەم بەردە گرنگە ١- شێوە ٢-زبرو لوسی ٣- قەبارە ٤- ڕەملیە یان بەردیە ٥- بلوریە یان شێوەیە،کە تێدا دکتۆری تاقیگە ئەم بەردە ورد دەکات دەیکات بە پاودەر کە چەن ئیشێکی لەسەر دەکات تا بزانی چ جۆرە بەردێکە وە بزانی چ خۆراکێک وا دەکات ئەو بەردە دروست بوە، کە تێدا لەهەموو حاڵەتێک تێدا دەگوترێ ئاو زۆر بخورێتەوە تاکو گورچییلە رزگار بێت لە رملە نیشتوەکان تاکو نەبێتە بەرد و هەروەها بە خواردنەوەی شەربەتی لیمۆ کە ترشی ستریک زیاد دەکات پێی کە ڕێگرە لە دروستبونی بلوراتی کالیسیوم .

## هۆکارەکانی دروست بونی بەرد

١- کەم خواردنی ئەو خواردنانەی کە ئوکزالاتی تێدایە ئەوانەش

١-سپێناخ ٢-مخلل ٣-بیبەری ڕەش ٤-مەعدەنوس ٥-پەتاتە ٦-ترێ ٧- باینجان

٨-بیبەری سەوز ٩-فراولە .
٢-واز هێنان لە چایانەی کە گەلاکانیان ئوکزالاتیان تێدایە لەگەڵ کوڵان زیاد دەکەن
٣- زیاد خواردنی گۆشت و مریشک و ماسی و لەبەر ئەوە ترشی میز زیاد دەکات دەبنە هۆی دروست بونی بەرد
٤- زیاد خواردنی ئەو دەرمانانەی کە ڤیتامین (س) تیدایە چونکە لە هەندی مرۆڤدا دەبێتە ئۆکزالات.
٥- زیاد دەردانی غودەی دەرەقی
٦-زیاد خواردنی دەرمانی کالیسیوم کە یارمەتی دەرە بۆ دروستبونی بەرد
چ بکری باشە بۆ ئەوەی توشی ئەم نەخۆشیە نەبێت یان کەمتر بکرێتەوە بە لانی کەم.
١- هاتنە دەرەوەی ئاو دوو لتر رێژەی ئۆکزالات کەم دەکاتەوە واتا ئاو زۆر خواردن
٢- زیاد جولە کردنی لە ش کە رێگرە لە دروستبونی بەرد
٣-رژینی خێرا هۆکاریکە بۆ دروستبونی بەرد
چۆنیەتی ئیشکردنی ئەم پشکنینە لە لایەن دکتۆری تاقیگە
لەکاتی وەرگرتنی بەردەکە بە ئاوی مقەتەر دەیشۆین دوای وشکی دەکەینەوە بە فلتێر پەیپەر پاشان کێشی دەکەین لەگەڵ رەنگ و زبرو لوسی وبەردەکەش هەمووی تۆماردەکەین پاشان وردی دەکەین دەیکەینە پاودەر،

## رێگاکانی ئەنجامدانی پشکنینەکە :-

چەند رێگایەک بەکاردێن بۆ شیکارکردنی بەردی (گورچیلە) وەک :
.(Spectroscopy, X-ray Diffraction, Chemical Analysis and Mass Spectrometry)
رێگەی باو بۆ پشکنینی بەردەکان بەرێگەی کیمیایی(Chemical Analysis) دەکرێت بۆ دیاریکردنی ئەو پێکهاتانەی بەردەکەی لێپێکهاتووە وەک
Carbonate , Calcium , Magnesium , Oxalate , Phosphate , Ammonium ,)

.(Cystine , Uric acid and Ammonium urate

یەکەم جار سیفەتی بەردەکە دەنوسی وە پاشان ژمارەی بەردەکان لە تەقریرەکە دەنوسین

جا ئەوانەی ئەرێنی بوو وەک ئەوانەی سەرەوە دەنوسین لە راپۆرتەکە .






# Urethral culture Test

ئەم پشکنینە بۆ پیاوان، بە زۆری دەکرێ بە مەبەستی زانینی بونی بەکتریا یان ڤایرۆس لە ریرەوی میز کە دەبێتە هۆی دروست بونی التهابات،ئەم پشکنینە لە بۆری میز دەکرێت .

**چۆنیەتی کردنی**

یاریدەدەری تاقیگە هەلدەستی بە بەکارهێنانی پارچەیەک لۆکە بۆ خاوێن کردنەوەی دەرچەی میز لە ئەندامی زاوزێ بۆ کۆکردنەوەی نمونە پاشان لۆکە بە نەرمی سێ بۆ چوار جار ئامادەدەکرێ دەبێت هەرنا سەعاتێک بەسەربچێت کە میزی کردیە ئینجا پشکنینەکەی لێ وەردەگرین.

پاشان نمونەکە لە ناوندی چاندن(زرع) دادەنرێ واتا چاندنی (زرع)ی بۆ دەکەین وە پاشان سەیر دەکرێ تا بزانرێ بەکتریاکە لەسەری گەشەی کردوە.

**کاتێک ئەم پشکنینە دەکرێت:**

کاتێک نەخۆش هەست بە بونی نیشانەکان دەکات

١-میز کردنێکی بە ئازار

٢-زیاد کردنی میز

٣-سور بونەوەو ئەستور بونی میز

ئەو بەکتریایانەی کە هەیە لە پشکنینەکە برتین لە (سیلان و کلامیدیا)

**سیلان:** بەکتریایەکە دەگوازرێتەوە لە رێرەوی میز لە رێگەی جووت بونەوە دەگوازرێتەوە کە کاردەکاتە سەر پەردەی رێرەوی میز وە دوای دەگاتە (عنق الرحم ) وە دەزگای فالوب لە ئافرەت لە رێرەوی میز.

**کلامیدیا:** بەکتریایەکە دەگوازرێتەوە لە رێرەوی میز لە رێگای جووت بونەوە لە وڵاتی ئەمەریکا زۆر باوە کە دەبێتە هۆی ئیلتهاباتی بەردەوام لە هەریەکە لە پیاو ئافرەتدا زۆربەی جار ئەو بەکتریایە دەبێتە هۆی بونی خوێن لە میزدا






# Blood culture Test

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ دۆزینەوەی مایکرۆئۆرگانیزم بۆ دیاری کردنی جۆرەکەی ئەم پشکنینە دەکری بۆ دیاری کردنی رێژەی توش بونەکەی بە ژەهراوی خوێن کە وا دەکات بگاتە (الالتهاب) ئەوەش هەرەشەیە بۆ ژیانی نەخۆشەکە، لەگەڵ بەرەو پێش چونی نەخۆشیەکە نیشانەکان زیاددەکات وەک

١-بونی ئیلتهابات لە هەموو شوێنێکی لەش

٢-دروست بوونی تۆپەڵەی خوێنی بچوک لە دەمارە بچوکەکان

٣-مەترسی دابەزینی پەستانی خوێن

٤-لەکار کەوتنی یەکێک یان چەند بەشێکی کۆئەندامی لەش

دەبێ سێ نموونە وەربگرێ لە چەند دەمارێکی جیاواز چونکە بەکتریا لە شێوەی پارچە پارچە لە ناو خوێن دا هەیە واتا لە سێ شوێن خوێنەکە وەربگیرێ،چ کاتێک ناکرێ ئەگەر ئەنتی بەدی خواردبێ نابێت ئەم پشکنینەی بۆ بکرێت.

**تێبینی**- ئەرێنی (گرام پۆزەتیڤ) دەبێ کاتیک یەکێک لەو بەکتریایانەی هەبێت

- Staphylococcus epiderminds
- Bacillus species
- Propionibacterium speciesCorynebacterium species
- Clostridium perfringens
- Viridians streptococcus
- Candida tropicalis



**تێبینی:** نەرێنی (گرام نێگەتیف) دەبێت ئەگەر یەکێک لەو تیوبانە پۆزەتیف بێت ئەو بەکتریایانەی هەبێت
- (Streptococci(non-viridans
- Aerobic and facultative gram-ne
- Anaerobic cocci
- Anaerobic gram-negative rods
- Yeast

**نیشانەکانی ئەم پشکنینە**

١- بۆگەنبونی خوێن کە دەبێتە هۆی تایەکی بەرز

٢- خوران ٣- هەناسەدانی خێرا

٤- نارێکی لێدانی دڵ ٥- بەرزبونی خرۆکە سپیەکان

**ئەنجامی ئەم پشکنینە چی دەگەیەنێ:**

ئەگەر دوو لە تیوبەکانی ئەرێنی بوون بە بەکتریا یان کەروو واتە نەخۆشەکە توشبوە بە نەخۆشی خوێن.

تێکچونی خوێن نەخۆشیەکی قورسە دەبێت یەکسەر چارەسەر بکرێت دەبێتە هۆی هەرەشە لەسەر ژیانی نەخۆشەکە بەتایبەت لەوانەی بە دەست لاوازی کۆئەندامی بەرگری دەناڵێنن .

ئەگەر یەکێک لە تویبەکان ئەرێنی بوو دووەکەی تر نەرێنی بوو ئەوا واتە تەنها توشبوە دکتۆرەکە تەماشای حاڵەتی نەخۆشەکە دەکات و نیشانەکانی ئەوەش وا دەکات کە تاقیکردنەوەی بۆ بکرێ ئەویش چەند پشکنینێکە دکتۆر بۆی زیاد دەکات.

# AFB
# (Acid Fast Bacilli)

ئەو بەکتریایە کە شێوەی چیلکەی دەتوانرێ لە ژێر مایکرۆسکۆپ ببینری بژمێردرێ دکتۆر ئەو پشکنینەی دەنوسێ لە کاتێکدا کە شک لە بونی نەخۆشی سیل بکات لە نەخۆشەکە کە دەبێتە هۆی ئیلتهابات لە سییەکان کە لەو نەخۆشانەی کە مەناعەیان کەمە یان تەمەنیان زۆرە یانیش دەناڵێنن بەدەست نەخۆشی ئایدز، بەڵام چارەسەری زۆر گرانە، چونکە بەرگریەکی زۆری هەیە بەرانبەر دژە تەنەکان.

ئەم بەکتریایە بە ئاسانی ناگوازرێتەوە بۆ مرۆڤ. هەندێ جار لە رێگەی ئاژەڵ دەگوازرێتەوە، بۆ ئامادەکردنی ئەم پشکنینە پێویستمان بە شلەی لەشی نەخۆشەکەیە وەک میز و شلەی میشک و بەلغەم بوونی ئەم بەکتریایە ٦-٨ هەفتە بێ ئەنجامەکەی نەرێنی دەبێت بۆیە دەبی زیاتر بی ماوەکەی .
گرتنی بەلغەم مادەیەکی لینجە لە سییەکان دێتە دەرەوە پێویستە لە بەیانیان زوو بکرێت ئەم پشکنینە ٣ رۆژ لە دوای یەک ئەم پشکنینە دەکرێ ئەگەر نەتوانی بەلغەم وەربگرێ ئەوا دەبێت دکتۆر نمونەیەک لە بۆری هەناسە وەربگرێ بە ئازوور.






# SFA Test
# Seminal Fluid Analysis

پشکنینی پیاوەتی (تۆ) یارمەتیدەرە بۆ دیایکردنی ئەو هۆکارانەی کە توانای پیاوانی بۆ وەچەخستنەوە پێوە بەندە. ئەم شیکارییە کۆمەڵێک شیکاری ورد لەخۆدەگرێت، لەوانە دیاریکردنی قەبارە و چڕیی تۆواو (Semen Volume & Density)، ژمارەی تۆوەکان (Sperm Number)، شێوە و ڕواڵەتی تۆوەکان (Sperm Morphology) خێرایی و شێوازی جووڵەی تۆوەکان (Sperm Motility) وە دیاریکردنی چەند هۆکارێکی دیکەی وەکو بوونی (RBC & Pus) دیاریکردنی پلەی ترشێتی و تفتێتی تۆواو(Semen pH)، و بە تێکچوونی یەکێك لەم هۆکارانە ڕەنگە ببێتە هۆکاری لەدەستدانی توانای خستنەوەی وەچە..

لە مرۆڤدا پێویستمان بە نزیکەی ٦٤ کاتژمێر هەیە بۆ دروست بوونی تۆوێکی تەواو پێگەیشتوو کەتوانای پیتاندنی هەبێت (هەربۆیە پێویستە بەر لە ئەنجامدانی ئەم پشکنینە بۆ ماوەی نزیکەی ٧٢ کاتژمێر (سێ ڕۆژ) سەرجێیی نەکرێت تا ئەنجامێکی دروستمان دەست بکەوێت ).. کۆمەڵێک هۆکار کاردەکەنە سەر چۆنییەتی و چەندێتی تۆوەکان لەوانە (جگەرەکێشان و خواردنەوە کهولیەکان و سیستمی خۆراکی ناتەندروست و زیاد بەکارهێنانی مێرووکوژەکان و هەندێ نەخۆشی و تا ی بەرز.

## ئەم پشکنینە چۆن ئەکرێت

**یەکەم :** ماکرۆسکۆبی.بێ مایکرۆسکۆپ.macroscopy

١- قەبارە و لینجی Volium and liquefaction.. سەرەتا سپێرم لە کەسەکە وەر ئەگیرێت.. بەشێوەیەک (ئەگەر لە ماڵ بیهێنێت ئەوا، نابێ لە ٣٠ خولەک زیاتری پێ بچێت) ئەگەر لە تاقیگە وەری گرت ئەوا ٣٠ خولەک چاوەڕێ ئەکەین لە ناو ئینکیوبەیتەر یان ڕووم تێمپریچەر هەتا liquefaction ڕوو ئەدات

ئینجا یەکەم شت قیاسی قەبارەکەی ئەکەین، قەبارەی ئاسایی ٢بۆ ٦ ملم. زۆری قەبارەکەی ئەبێتە هۆی ناتەواوی پشکنینەکە چونکە وا ئەکات سپێرمی زیاتر دەر بکەوێ یاخود ڕێژەی سپرمە ناتەواوەکان بەهۆی زۆری ژمارە و کەمی جێگا توشی تێکشکان و ناتەواوی ئەبن.
ئەگەر بێت و دوای ٣٠ خولەک لیکویفیکەیشن و لینج بوونەوە ڕوو نەدات ئەوا مانای وایە کێشەکە لە شلەی تۆواوەکەیە کەئەم کەسە توانای وەچە خستنەوەی نییە.. چونکە دوای ٣٠ خولەک و لینج بوونەوەی تۆواو.. سپیرم توانای جولەی هەیە بەشێوەیەکی ئاسایی بەرەو هێلکەدان جولە ئەکات. کە ئەم ناوەندە لینج نەبێتەوە ئەوا توانای جوڵەی نامێنێ و هەر لە ناو زێی ئافرەت ئەمرن و بەمەش توانی وەچە خستنەوەی نابێت.

٢- ئاستی pH .. بەشێوەیکی گشتی تۆواو ناوەندێکیتفتە(٦,٢ بۆ ٨) بۆ پاراستنی لە ترشی ناو ڕێڕەوی هێلکەدان. بۆیە گەر ترش بوو ئەوا کێشەیەک لە دەردراوەکانی پرۆستات و گوون هەیە یان لەکاتی دەرچوون (قذف) تووشی بەرکەوتن بوون.

٣-پێوانەی شەکری فرەکتۆز.. fractoz لەکاتی دەرچوونی تۆ و لە گوون هەر لەوێش شەکری فرەکتۆزیشی لەگەڵە بۆ ئەوەی وزەی پێویست بدات بە سپێرم بۆ جوڵە.. نەبوونی شەکری فرەکتز بە واتای نە توانینی جوڵە لە لاین سپێرمەوەوە. چونکە وزەی پێویستی نابێت بۆ جوڵە.

٤- بۆن.odor.. بەشێوەیەکی ئاسایی بۆنی سپێرم و تۆاو بۆنێکی ساردی هەیە و زیاتر لە بۆنی فاس ئەچێت..ئەگەر بۆنێکی تیژ یان بۆنێکی شێوە بۆگەنی هەبوو ئەوا بەواتای بوونی ئیلتهاب یان کێشەیەکی تر دێت.

٥- ڕەنگ..color..بەشێوەیەکی گشتی تۆواو و سپێرم ڕەنگێکی سپی یا شێوە ئاوی هەیە و بوونی ڕەنگی شێوە زەرد یان قاوەیی یان بەرەو سەوز بەواتای بوونی ئیلتهابە وە بوونی ڕەنگی سور یان پەمەی بە واتای بوونی خوێنە لە سپێرم و تۆاوادا.

**دووەم:** مایکرۆسکۆپی.microscopy
ئەم سێ شتە پشکنین ئەکەین لە ژێر مایکرۆسکۆپ
ژمارەی سپێرم
توانای جوڵە
شێوەی سپێرم

**١-ژماردنی سپێرم** sperm count
دوای لیکویفیکەشن و لینج بوون بەتەواوی ٥٠ مایکرۆ لە سپرم وەر ئەگرین و لەگەڵ ٩٥٠ مایکرۆ لە شلەی ژماردن کە پێکهاتووە لە (١مل لە فۆرمالین /٥ گرام بیکاربۆنات سۆدیۆم /١٠٠ ملی لتر ئاو d.w) دواتر قەترەیەک لە تێکەڵەکە ئەکەینە سەر سلایدی ژماردن (نیوبار) یاخود چامبەر.. ئەوەی کە بۆw.b.c بەکار دێت و بە کەڤەرێک دای ئەپۆشین و ٢.٥ بۆ ▫ دەقیقە لێ ی ئەگەڕێین.. ئینجا دەست ئەکەین بە ژماردنی بە شێوەیە کە.
لەهەر لایەک چوارگۆشەیەک ئەخوێنینەوە.. واتا چوار لایە و لە هەر لایەک چوار گۆشەیەک.. چامبەرەکە چوارلای هەیەهەر لایەک ١٦خانەیە.. لە هەر لایەک کە شانزەخانە یە تەنها یەک خانە ئەخوێنینەوە.. واتا لە کۆی ٦٤ خانە تەنها ٤ خانە ئەخوێنیتەوە، ئینجا دوای خوێندنەوەیان ـ هەرچواری کۆ ئەکەینەوە و لێکدانی ٥٠ ئینجا لێکدانی ١٠٠٠
واتا (کۆی چوارخانەکە )×٥٠×١٠٠٠!
بۆ زانیاریشتان لە کاتی ژماردن هەموو سپێرمەکان ئەخوێنیتەوە. بجولێت یان

نەجوڵێت.. شکڵی تەواو بێت یان ناتەواو.
وە ڕێژەی ئاسایی لە نێوان ٤٠ بۆ ١٢٠ ملیۆنە..کەمتر لە ٢٠ و کەمتر لە ١٠ ملیۆن زۆر بە زەحمەت توانای وەچە خستنەوەیان هەیە

**٢-توانای جوڵە**.Motility : دوای ژماردن.. دەست ئەکەین بە جیا کردنەوەی ئەو سپێرمانەی توانای جوڵەیانەیە یاخود بە ناڕێکی ئەجوڵێن یاخود هەر ناجولین..
قەترەیەک لە سپێرم و لینج بووەکە واتا ئەوەنا کە مەحلولمان تێکەڵ کرد.. بەڵک و ئەوەی ک نیو کاتژمێر وازمانلێهێنا و لینج بویەوە وەر ئەگرین و ئەخەینەسەر سلایدێک و بە کەڤەرێک دای ئەپۆشین و لەسەر لێنزی ٤× سەیری ئەکەین و سێ فیلد وەک نمونە وەر ئەگرین لە سێ شوێنی جیای سلایدەکە.
**بۆ نمونە:** لە فیلدی یەکەم سەیر ئەکەین ٧ سپێرم ئەجوڵێن و ٢ ناجوڵێن
وازلەم فیلدە ئەهێنین و سلایدەکە ئەجولێنین بۆ لایەکی تری و فیلدێکی تری وەر ئەگرین بۆ نمونە ئەمەشیان ٤ جولە و ١ بێ جوڵە بوو ئینجا واز لەویش ئەهێنین و ئەچین بۆلایەکی تری سلایدەکە و ئەویش ئەژمێرین بۆ نمونە ئەویش ٧ جوڵا و ٣ نەجوڵاو بوون .

**بەم شێوەیە بە ڕێژەی سەدی ئەی نوسین**
جوڵاو:٧+٤+٧=١٨
٦=٣/١٨
نەجوڵاو:٢+١+٣=٦
٢=٣/٦
ئێستا.. جوڵاو ٦نەجوڵاو ٢
٣٣٪ =١٠٠*٠,٣٣=٦/٢

واتا جوڵاو =٦٧٪
نەجوڵاو =٣٣٪
ئینجا بۆ زیاتر ووردەکاری پێویستە شێوە جوڵاوەکانی جیا بکەیتەوەبەشێوەیەک کە جوڵاوەکانیش سێ جۆرن..ئەبێت ئەم سێ جۆرەش بەهەمان شێوەی پێشوو بژمێریت و بیان کەیت بە ڕێژەی سەدی..جۆرەکانیش ئەمانەن
١- خێرا بۆ پێشەوە..ئەمانە بەشێوەی هێڵێکی ڕاست بۆ پێشەوەئەجوڵێن بە خێرایی
٢- هێواش بۆ پێشەوە...ئەمانەش بەشێوەیکی هێواش بەڵام بە هێڵێکی ڕاست بۆ پێشەوە ئەجوڵێن
٣- جوڵەی ناتەواو...ئەمانەن کە بەشێوەی بانەیی بە دەوری خۆیان ئەسوڕێنەوەیاخود هەر نارۆن لەشوێنی خۆیان بەڵام جوڵەیان هەیە
بە شێوەیک کە بۆ نمونە..دوای ژماردنی جولە و بێ جوڵە ڕێژەی جوڵاوەکان ٨٠٪ بوو و ژمارەیان ٨ دانە بوو
بۆ نمونە جولەی تەوا ٤ بوو
هێواش ٣ دانەبوو
ناتەواو ١ دانەبوو
ئەوا...٨/٣=٣٧,٥=٣٧,٥٪ جوڵەی هێواش..
٨/١=١٢,٥=١٢,٥٪ جوڵەی ناتەواو
٨/٤=٥٠=٥٠,٠٪جوڵەی تەواو و خێرا
ڕێژی ئاسایی
جوڵە ٤٠٪
ڕێژەی جۆری جوڵەکان. جوڵەی خێرا و یەک هیڵ ٣٢٪

**٣-شێوەی سپێرم morphology:** دوای ژماردن و جوڵە ئەم جارەیان تێبینی و فەحسی شێوەی سپێرمەکان ئەکین..وەک ئەزانین سپێرم پێکهاتووە لە سەر و

مـل و کلـک.. قەترمیەک لـە سپرمە لینـج بووەکـە وەر ئەگریـن و ئەیخەینـە سـەر سـلایدێـک ۆ و بـە کەڤـەر دای ئەپۆشـین و بەهەمـان شـێوەی جوڵـە سـێ فیلـد لـە سـێ شـوێنی جیـای سـلایدەکە ئەخوێنینـەوە بـە شـێوەیەک کـە سـپێرمێک بـێ سـەر بـوو بـێ کلـک بـوو بـێ مـل بـوو دوو سـەر بـوو یـان دوو کلـک بـوو یـان هـەر شـێوەیەکی تـری ناتاسـایی بـوو بـە ناتـەوا دای ئەنێیـن و باقـی تـر بـە شـێوای ئاسـایی ئەیژمێریـن.

ئینجـا بەهەمـان شـێوەی پێشـوو هەرسـێ فیلدەکـە کـۆ ئەکەینـەوە بـۆ تـەواو و ناتـەواو و دابەشـی سـێ ی ئەکیـەن و ئەیکەیـن بـە ڕێـژەی سـەدی.

٤- wbc یـان pus cells :زۆرجـار خڕۆکـەی سـپی لەکاتـی خوێندنـەوە؟ یـان سەیرکردنی سپێرم لـە ژێر مایکرۆسکۆپ ئەبینرێت کـە ئەویش هەتا پێنج دانـە بـە بینیـن ئاسـاییە و لـەوە زیاتـر ناتاسـایی یـە و کەسـەکە ئیلتهابـی هەیـە جـا چ لـە ڕێـڕەوی سـپێرم و تـۆواو بێـت چ لـە گونـەکان..

ڕێژەی ئاساییەکەشی ٤ بۆ ١٤ ٪ یە

**تێبینی-** چی کار ئەکاتە سەر ڕوودانی هەڵە.

١. زوو پشکنین کردن واتا نەهێلیت لیکویفیکەیشن بکات.

٢. درەنگ پشکنین کردن واتا زۆر بەسەر لیکویفیکەیشنەکەدا بڕوات.

٣. درەنگ هێنانی سامپل لە لایەن نەخۆش.

٤. پاک نەبوونی تیوب یان کەپی وەرگرتنی سامپڵ.

٥. ئیکسپایەر بوون یان خرابی مەحلولی ژماردن.

٦. دانانی یان گواستنەوەی لە پلەی گەرمی بەرز یان نزمتر لە room tempreture.

لە ئێستادا چەندین ڕێگـەی تـر و بژمێری تـر هـەن بۆ ئەنجامدانـی ئـەم پشکنینە کـە هەندێکیـان کۆمپیتەریـن یاخـود هەنـدێ جـار بەمشـێوەیە پێویسـت ب بۆیـە کردنـی سـپێرم هەیـە بـۆ شـێوەی سـپێرمەکان.

وه لە کاتی بوونی هەڵە یان کێشە لەکەسەکەدا ئەوا ٣بۆ٤ جار ۆبۆی دووبارە نەکرێتەوە لە نێوان ٣بۆ ٦ مانگدا بۆ زۆر زیلاتر دڵنیا بوون چونکە جاری وایە ئەنجامی باش نی یەچونکە کەسکە پێشتر بە ماوەیەک توشی ئیلتهابات یان هەڵامەت یان زەربە و بەرکەوتن یان نەخۆشیەکی تر بوبێتچونکە گوونەکلان هەموو ٧٢ ڕۆژ جارێک سپێرمی نوێ و شلە و پێکهاتەی نوێ بەرهەم دێنێت.



# Semen culture Test

پشکنینی چاندنی (زەرع)ی سپێرمە،بۆ دەکرێ بۆ دیاری کردنی زیندەوەرە بچوکەکان لە سپێرم وە دیاری کردنی جۆرەکەیان و دیاری کردنی ئەنتی بایۆتیک کە کاری تێ دەکات ٢-٣ رۆژ ئەنجامەکەی دەردەچێت ئەگەر زیندەوەری بچوک ژیان لەسەر ناگارەکان ئەوا دەنوسرێ لە گەل جۆری زیندەوەرە بچوکەکان ئەنتی بایوتیک کاتێک دەنوسرێ کە کاری تێبکات وە ئەوانەشی کە کاری تێ ناکات واتا هەمویان دەنوسرێ.

## چ کاتێک ئەم پشکنینە دەکرێ

١- کاتیک سوتانەوە و ئازار هەبێت لەکاتی میز یان مەنی هاتنەوە.

٢- کاتیک سپێرم خوێنی لەگەڵ بوو یان هەست کردن کە وەکو پیشان نیە.

٣- بۆ مندال بە دەست هینان دەکرێ.

٤- ئەگەر خرۆکە سپیەکان خوێن هەبوو لە گەلیدا.

٥- دەردانی نائاسای لە چوک.

٦- لەکاتی وەرگرتنی چارەسەر ئلتهاباتی پرۆستات.

٧- دیاری کردنی ئلتهاباتی پرۆستاتی جەرثومی.

٨- بۆ دیاری کردنی نەخۆشی کە دەگوازریتەوە لە ریگەی جووتبون.

٩- نەزۆکی نەبونی مندال بۆ زانینی هۆکارەکەی.





# occult blood Test

ئەم پشکنینە دەکرێت بۆ زانینی شێرپەنجەی قۆلۆن کە خوێن لە پیسای دا هەیە ناتواندرێ ببیندرێ ئەنجامی ئەرێنی دەلالەت لە بونی خوێن دەکات لە پیسای بەلام بە تەواوی ناتواندرێ بلێ کە شێرپەنجەی هەیە چونکە لەوانەیە نەخۆشی تریشی هەبێ نمونە
مایە سیری یان ئلتهاباتی قۆلۆن کە دکتۆر دەتوانرێ کەشفی بکات لە رێگەی نازوری
قۆلۆن وە پشکنینێکی تری لەگەڵ دەکرێ ئەویش cbc
**تێبینی:** بە گشتی بۆ زانینی نەخۆشی قورعە ی معیدە و ئلتهاباتی ریخۆلە و شێرپنەجەیی خوین دەکری



## SCOTCH Test

ئەم پشکنینە بە زۆری لە مندال هەیە کە دەبێتە هۆی خوران نەخەوتن دەکری کە بەیانی لە خەو هەلسا یەکسەر دانانی شریتیکی شفاف وە بۆ دوو سێ سانیە دەست دانان لە سەری پاشان شریتەکە لادەبەیت دوای لە سەر سلایدی دادەنێ لە تاقیگە، لە کۆئەندامی هەرس دەگوازرێتەوە بە هۆی دەستدان یان خواردنی پیس تووش بوو بە هێلکەی ئەو کرمە،کرمەکە نێرەی پێگەشتوی ٥ملم و مێ یەی ١سم.

**نیشانەکانی:**

١-خورانی ناوچەی کۆم بە تایبەتی کاتی خەوتن

٢-ماندوە کەسەکە

٣- سور بوونەوەی ناوچەی کۆمە و برینداربوون

٤-دروستبونی ئلتهاب

٥-ئازاری سک







# VAGINAL SMEAR TEST

ئەم پشکنینە بۆ ئلتهاباتی زێ دەکرێت،کە لەوانەیە ببێتە هۆی بەکتریا. یان ڤایرۆسات وە دەگوازرێتەوە لە نێوان دووکەس کەپەیوەندی هەیە لە نێوانیان وە دەبێتە هۆی وشک بونی زێ
بە هۆی کەمی هۆرمۆنی الاسترۆجین.

**نیشانەکان:**

لەوانەیە لە کەسێک بۆ کەسێک جیاواز بێت پشت دەبەستی بە ئاستی توش بونەکە هەندێک ئافرەت نیشانەکانیان نیە

١- دەردانی شلەکە بۆنی هەیە

٢- خوران و ئەستوربونی زێ

٣- سوتانەوە لە کاتی میز کردن

٤- ئازار وبێزاربوونی کاتی جووتبون

چ دەگوترێ بە نەخۆشی پێش وەرگرتن

داوا دەکریت لە نەخۆش کەوا ٢٤ سەعات پێش وەرگتن نابێ بشوری وە هەندێک دکتۆر داوای نەکردنی جووتبون دەکەن پێش ٢٤ سەعات.

**ئەنجامەکەی**

کاتێک تەماشای نمونەکە دەکەی لە ژێر مایکرۆسکۆب دەگەرێ بە دوای بەکتریایەکە. کە دەبیتە هۆی دروست بونی بەکتریا لە زێ یان طفیلی تریتشومونناس کە دەبێتە نەخۆشی مشعرات یان لە دوای خمرە ئەگەر لە جۆرێك زیاتریش دەرکەوت لە پشکنینەکە ئاسایە.

دەرکەوتنی نائاسای دەلالەت لە بوونی کێشە دەکات

١-نەخۆشی مشعراتی زێ

٢-خمرە ئلتاهابی دەرچەی زێ
٣-کلامیدیای زێ
٤-ئلتهابی ڤایرۆسی
ئەگەر یەکیک لەم نیشانانەی تێدا بوو لە زۆریەی کات دا ئەگەر بە دەرمان چارسەر نەکرا ئەوا پیویستی بە زەرع دەبێت vaginal culture بۆ دەستنیشان کردنی بەکتریاو جۆری دەرمان بۆ لەناوبردنی بە کتریاکەو نەمانی ئلتهابات. هەندێ جار ئلتهابی زێ دەبێت بەڵام ئەو زیان بەخشانە نەبێت کە بەهۆی بەکارهێنانی بەخاخ یان شامپۆی شوشتنی ئافرەتان یان بەهۆی بەکارهێنانی سابون و معطر دروست دەبێت ئەو کات دکتۆر تەنها دەڵێت لە بەکارهینانی ئەمانە بە دووربە لەکاتی وەرگرتنی چارسەر لەوانەیە دکتۆرەکەت داوای نەکردنی جووتبونی لێ بکات ئەگەر دووگیانی هەبێ یان شکت هەبی کە دووگیانی هەیە بە دکتۆرەکەت بڵێ لە بارەی ئەوەی دووگیانی یان نا پاش چارسەر پێویستە پشکنینەکە دووبارە بکەیەوە بۆئەوەی بزانی کە خاوێن بویتەوە، ئەگەر دوای ٤٠ سالی یان لە سوری مانگانە چویتەوە هەستت بە بونی کەمی الاسترجین کرد یان وشک بونی زێ پێویستە بە دکتۆرەکە بڵێی.



# PAP SMEAR Test

ئەو پشکنینە کردنی زۆر ئاسانە چەند چرکەیەک دەخایەنی لە عنقی رحم وەردەگیری (لە نیوان سەرتای رەحم دەرچەی زێ دایە) باشترین رێگایە بۆ زانینی شێرپەنجەی عنق رحم وە بۆ خۆپاراستن.

**بۆچی دەکرێ:-** بۆ زانینی حاڵەتی زوی شێرپەنجە بە وەرگرتنی مسحە لە عنق رحم لە ناو زێ کە سەری رحمە، هەندێک جار خانەکانی عنق رحم لە خانەی ئاسای دەبێتە خانەی نەخۆشی لەوانەیە ئەوە روویدات بێ ئەوەی بزانی یان هەستی پێ بکرێ.

لەوانەیە ئەو خانە نائاسایانە لەناو ببردرێت لە لایەن دکتۆر پێش ئەوەی ببێتە خانەی شێرپەنجەی ٪٩٠ یان لە ناو ببرێت خانە سەرەتایەکانیان ئەگەر سەرەتای پێت بزانرێ لە ئاستی یەکەمەکانی و چارەسەر بکرێت.

**کێ پێویستی بە پشکنینە عنقی رحم هەیە ؟**

ئەگەر هەتا یەکجاریش بێ جووتبونت ئەنجام دابێت لە ژیانتدا پێویستە دووساڵ جارێک ئەم پشکنینە بکرێ،

**چ دەبێت ئەگەر ئەنجامەکە نائاسای بێت**

**وەڵام:** ئەوە ناگەینی کە توش بوە بە شێرپەنجە لەوانەیە بەس تەنیا پێویستت بە چارەسەری بە دەرمان بێت لەلایەن دکتۆر.

**ئەی کاتی سوری مانگانە نەماوە هەر پێویستە ئەم پشکنینە بکرێ؟**

**وەڵام:** بەڵێ،چونکە مەترسی توشبون بە شێرپەنجە لەگەڵ چونە ناو تەمەنەوە زیاتر دەبێت، بۆیە پێویستە ئەم فەحسە هەمو ساڵێک بکرێت هەتا پاش لە سوری مانگانە چونەوەش بە یەکجاریش.

**لەم کۆتایانە رەحمت دەرهێناوە ئایا هەر پێویستت بێ دەبێ ئەم پشکنینە بکرێ؟**

**وەڵام:** هەر پێویستت پێ ی دەبێت، پێویستە لەگەڵ دکتۆری خۆت قسە بکەیت لەم بارەیەوە

**ئەگەر هەستت بە هەندێک خوێن بەربوون کرد لە عنقی رحم؟**

**وەلام:** ئەگەر خوێن بەربوون یان هەر دەردراوێکی نائاسای هەبوو لە زێ پێویستە بە زوترین کات سەردانی دکتۆر بکەیت.

**قرحە عنق رحم:-**

زیاترین نەخۆشیە کە توشی خانمان دەبێت لە هەموو دونیا ئەلتهاباتی ئەو خانانەی کە لە شوێنی عنق رحم هەیە کە رەنگی سوری خوێن بەربونی راستەقینە دەبێت نەک رەنگی سوری ئاسایی و خوێنی لێ دێت دەبێتە هۆی نارەحەتی لە ئافرەتدا .

**هۆکارەکانی ئەم نەخۆشیە**

١- زەواج کردنی زوو وە منداڵ بوونی زۆری لەسەر یەک دەبێتە هۆی قرحە بە رێژەیەکی زۆر.

٢- چونە ژوورەوەی موادی کیمیای بۆ ناوەوەی عنق رحم کە بەرهەم بێت لە دەرمان یان شتی تر.

٣- ئلتهابات لە بەشی تناسلی لە ئافرەت.

٤- بەکارهێنانی حەبی مەنع یان لەولەب بە بەکارهێنانی بۆ ماوەیەکی زۆر.

٥- خاوێن رانەگرتنی بە تایبەت لە مهبل.

٦- بوونی هەندێ نەخۆشی کە دەگوازرێتەوە بەهۆی جووتبون.



# FANGI CULTURE Test

ئەم پشکنینە دەکرێت بۆ دیاری کردنی فطریات زیندەوەرۆچکەی بچوکن کە دروست دەبێت لە ناوچەی تاریک و شێدار لە هەندێ شوێنی لەش لە ناو پێڵاو جل و بەرگ و هەندێک لە فطریاتەکان زەرەریان نیە، بەڵام هەندێکیان دەبنە هۆی نەخۆشی لەوانەیە هەندێک جار ئەوپشکنینە دەکرێ پێی دەوترێ (نارێنکی فطریات)وە لەوانەیە لە باری جیا جیا بەکاربێت وەک:

١- خوێن

٢- دەموچاو

٣- سەروی خانە وەک برین و یان شوینی تناسلی

٤- نینوک

**نیشانەکان**

١- خوران ٢- سووربونەوەی پێست ٣- گۆڕانی رەنگی نینۆک بۆ زەرد ٤-دروستبونی گەردی سپی لەسەر زمان ٥- دروست بونی خەمیرە مهبلی کە دەبێتە هۆی دەردان رژێن لە مهبل ٦- خوران .

**تێبینی:** زۆربەی توشبونە فطریاتەکان لە پێست و دەم وکۆئەندامی زاوزێ دروست دەبێت وە هەندێک جار ترسناک دەبێت دەچێتە ناوەوەی لەش ناوەوەی سیەکان و خوێن





# LEISHMAN BODY Test

نەخۆشی یەکە بەهۆی طفیلی لشمانیا توش دەبێت بەهۆی بەرکەوتن توش دەبێت دەست پێ دەکات بە دیارکەوتنی نیشانەکانی لەسەر پێست وشک بوونی برینی پێست دوای لەسەر لووت و دەم دیاردەکەوێت پاشان دەبێتە هۆی تاو کەم خوێنی و سک چون وە زیاتر لە ٢٠ جۆر لە لشمانیا توشی مرۆڤ دەبێت دەبینرێ بەهۆی مایکرۆسکۆپ بەعشوائی دەکرێت بە هۆی پشکنینی خوێن، وە دەگوازرێتەوە بەهۆی پێوەدانی مێشوولەی توش بوو بەو طفیلیە کە پێی دەوترێ مێشولەی (رملي)



ئەو طفلیە لشمانیایە دەچێتە جەرگ و سورێنچک و مۆخی ئێسک ئەگەر زوو چارەسەر نەکرێت ئەوا نەخۆشەکە دەبێتە هۆی مردنی.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە:**

١- تا ٢-کەمی کێش ٣- ماندووبون ٤- کەم خوێنی
٥- ئەستووربونی جەرگ

ئەم طفیلیە دووەم طفیلیە لە کوشتنی مرۆڤ بەپلە لە دوای ملاریا دێت

ئەم پشکنینە لە تاقیگە بە دوو شێوە دەکری ١ - لە رێگەی نمونە وەرگرتنی نەخۆش لەو شوێنەی کە بۆتە برین لە ژێر مایکرۆسکۆپ دەخوێنرێتەوە.

٢- لەرێگەی خوێن وەرگرتن .






# Malaria smear Test

ئەم پشکنینە بە پشنینێکی زێرین دادەنرێ بۆ دڵنیابونی لە مەلاریا کە نمونەکە وەرگیرا لە تاقیگە پێویستە یەکسەر بکرێ هەڵنەگیری بۆ ئەوەی بە زووترین کات چارەسەر بکرێ، کاتێک قەترەیەک لە خوێنەکە دەخرێتە سەر سلاید دەخوێنرێتەوە وە رێژەی لە سەدای خرۆکە سورەکان دەخوێنریتەوە،
ئەم نەخۆشیە بە هۆی طفەیلی مەلاریاوە توش دەبی لە رێگەی مێشولەی هەلگر یان دەست دانی شتیک کە هەڵگری ئەم طفەیلی یە بێت چوار جۆر لەمانە توشی مرۆڤ دەبێت
پلاسمودیوم فیفاکس، بیاسمودیومی سپاوی دەبیتە هۆی انتکاس هەندێک جار لە ئافرەتانی دووگیان دەگوازرێتەوە بۆ منداڵەکەی بەهۆی گواستنەوەی ئۆرگان کاتێک توشی دەبێت بەهۆی پێوەدان یان هەر شتێک دەگوازرێتەوە بۆ ناو خوێن و دوای جەرگ پاشا مانەوەی ٧-٣٠ رۆژە پاشان مەلاریەکە دەچێتە ناو خروکە سورەکان.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە زیاتر لە ئەنفلۆزا دەچێت**

١- تا ٢- ئارەقەکردن ٣- ژانە سەر ٤- بوونی ئازارو نارەحەتی ٥- هەندێکیان هەستکردن بە نارەحەتی لە گەدە ٦- رشانەوە ٧- سکچوون ٨- کەم خوێنی بێهیزی، نیشانەکان زیاتر دەبن کاتێک طفەلیەکە دەگوازرێتەوە بۆ جەرگ و دەچێتە ناو خرۆکە سورەکان وە دەبێتە هۆی تەقینەوەی خرۆکە سورەکان، ملاریای فالسیباروم ئەم جۆرەیان زیانیکی زۆری هەیە بۆ سەر ژیانی نەخۆش لەوانەیە کار بکاتە سەر دەماخ وگورچیلە و سی یەکان دەبێتە هۆی نارێکی مێشک وتەنگەنەفەسی گیژبن وە لەوانەیە ببێتە هۆی لەکارکەوتنی بەشەکانی لەش و مردن کاتێک کاردەکاتە سەر مێشک پێی دەوترێ مەلاریای مێشک.

# Throat culture Test

ئـەم پشـكنینە دەكرێـت بـۆ زانینـی التهاباتـی گـەروو وە بوونـی لەوانەیـە ببێتـە هـۆی ئلتهابی بەكتریا و ئلتهاباتـی سینگ و ئلتهابی لەوزەتێن و سـك چـون، ئامانـج لـە وەرگرتـن بـۆ زانینـی بونـی زیندەوەرۆچكـە لـە گـەروو كـە دەبێتـە هـۆی بەكتریـای اتریبتـۆ كۆكـس وبیۆجینـس لـە گـەروو، بـە ئاسـانی دەگوازرێتـەوە بەهـۆی پشـمین و خـواردن وخواردنـەوەی هەلگـر وە دەگوازرێتـەوە بـۆ چـاو و لـووت و دەم ئەگـەر دكتـۆر هەسـتی كـرد بەكتریـا هەیـە لـە گـەروو داوای زەرع دەكات.

**نیشانەكان :**

١- سوربونەوە قـورگ ٢- دروسـتوبنی پەلـەی سـور لـە سـەروی دەم ٣- ئەسـتور بـون ٤- تـا ٥- سـوربونەوەی لەوزەتیـن ٦- ئازاری لـەش ٧- نـان نەخواردن .

ئـەم نیشـانانە ناتوانـی بلێیـن تـوش بـوە بـە بەكتریـا یـان ڤایـرۆس لەبـەر ئـەوە پشـكنینی چاندنـی (زەرع )پێوسـتە بـۆ زانینـی.

یەكەم جار كە دكتۆر گومـان لـێ دەكات پشـكنینی خێرای لـە بۆ دەكات تاكو بزانـی هەیـە یـان نـا كـە شـریتێك بەكاردێنـی ئەگـەر هەبـێ ئـەوا دژەتەنـەكان سـەر شـریتەكە كاردانەوەیـان دەبێـت لـە مـاوەی ١٥-٣٠ خولـەك ئەگـەر نەیبـوو مانـای ئـەوەی نیـە نەرێنیـە لەوانەیـە دكتـۆر هـەر داوای زەرع بـكات.

# Bilharziasis Test

ناوی مشەخۆرە(طفیلیە)کە مرۆڤ توشی نەخۆشی دەکات کاتێک دەچێتە ناو ئاو یان حەوزی مەلەوانی بەهۆی گەرمی لەش وا دەکات مشەخۆرەکە لە کەسەکە نزیک ببێتەوە وە پێستی کەسەکە دەبڕێت وە دەچێتە ناو دەمارەکان تا دەگاتە جەرگ و گەدە و ڕێڕەوی میز، وە منداڵ زیاتر توش دەبن بەهۆی ئاوی پیسەوە،کاتێک هێلکە لە ناو دیواری ریخۆڵە دادەنرێ بەهۆی وەڵام دانەوەی بەرگری خودی (مناعی)کە دەبێتە هۆی نارێکی قۆڵۆن و خوێن کەم بون لە جەرگیش هێلکە دادەنێت دەبێتە هۆی بەرز بونەوەی پەستانی خوێن کە تێدا مشەخۆرەکە دەتوانێ ٤٨ سەعات لە ناو ئاو بمێنێتەوە کە بە بێ ئەوەی لەسەر هیچ سەرچاوەیەک بژی.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە**

**نیشانەکانی دەگۆڕێ بە پێی ئاستەکانی ژیان**

١-لەکاتی برینی پێست بەشێوەیەکی گشتی هەستیاری (حساسیەی) نیە تەنها هەندێکیان شکایەت لە خورانی پێست دەکەن

٢-بە شێوەیەکی گشتی هەست بە هیچ ناکرێ تەنها هەندێک جار دەبێتە هۆی پلەی گەرمی و خوران لە پێست دا.

٣-لە کاتی دانانی هێلکە لە جەرگ دا دەبێتە هۆی لە ناو چونی جەرگ بە بێ ئەوەی نەخۆش هەست بە هیچ شتێك بکات تا ئاستەکانی کۆتای کە دەست پێ دەکات بە

١- بەرز بونی پلەی گەرمی ٢- نەزیف بونی گەدە ٣- گەورەبونی سک ٤- لەکاتی نیشتنی کالیسیوم لەو ماوەیەدا خوێن لەگەڵ میزدا دەبێت

٥- لە یەکێک لە گورچیلە گیران رودەدات کە دەبێتە هۆی لەکارکەوتنی گورچیلە ٦- هەندێک جار دەبێتە هۆی شێرپەنجەی میزەڕۆ(مسانە).

# Gonorrhea Test

نەخۆشی سوزەنک دەگوازرێتەوە لە رێگەی نەخۆشی گواستراوەی دووگیانی بەهۆی بەکتریای نێسریا توشی ئەو شوێنانە دەبێت کە شێدارن لە لەش وەک
١- بۆری میز ٢- چاو ٣- گەروو ٤- کۆئەندامی زاوزێ ٥- دەزگای فالوب
ئەم بەکتریایە دەگوازرێتەوە لە نەخۆشێکەوە بۆ نەخۆشێکی تر لە رێگەی دەم یان دەرەچەی زاوزێ لەو کەسانەی چەندین سەرچاوەی جووت بوونیان هەیە هیچ هیوایەک وەرناگرن باشترین رێگە بۆ خۆ پاراستن دورکەوتنەوە لە جووت بون.

**نیشانەکانی لە پیاواندا:-**

١- بوونی ڕارای و بێزارکەری لە کاتی میز کردندا ٢- دەردانی شلەی نامۆ لە شێوەی ئلتهاب لەچوک
٣- سوربون و ئەستور بونی لە دەرەچەی چوک ٤- ئازار و ئەستوربون لە گونەکان
٥- بوونی ئلتهاب بەردەوام لە گەروو

**نیشانەکانی لە ئافرەتدا**

زۆرینەی ئافرەتەکان نیشانەکانیان دیار نیە یان بەشێوەی نەخۆشیەکی ئاسای دەردەکەوێ بۆیە زۆرگرانە دیاری کردنی بە دیار دەکەوێ وە هەوێنی زێ
١ -دەردانی نامۆ لە زێ (ئاوی، چەوری، یان هەندێک سەوز)٢- ئازارو سوتانەوە لەکاتی میزکردندا
٣- زۆرمیز کردن بەشێوەیەکی بەردەوام و دووبارە ٤- ئلتهابی گەروو
٥- ئازار لە کاتی جووتبون ٦- بونی ئازاریکی زۆر زیاد لە خواروی سک
٧- تا هاتن

**ئەم پشکنینە چۆن دەکرێ:-**

١- وەرگرتنی لینجەکە لە چۆک یان زێ یان لە گەروو وە دانانی لەسەر سلاید کە گەر کتۆری تاقیگە هەست بکات ئلتهابی مفاصل یان خوێن هەیە ئەوا داوا دەکات لە خوێن وەربگیری یان بە وەرگرتنی شلەی مفاصل لە ڕێگەی دەرزی وە پاشان ڕەنگی دەکەن وە تەماشا دەکرێ لە ژێر مایکرۆسکۆپ ئەگەر خانەکان لەگەڵ ڕەنگەکە تێکەڵ بوون سیلان ئەو ڕێگەیە خێراو ئاسانە

٢-وەرگرتنی بەهەمان شێوە بەڵام هەلگرتنی لەسەر ئاگاری تایبەت بە تاقیگە دوای ناو ئینکوبێتەر بۆ ماوەی ٢٤ سەعات دەمینەێتەوە تا ئەو بەکتریای سوزەنکە گەشە دەکات پاشان تا ٢ ڕۆژی تر دەمینیتەوە واتا چاندن (زەرع) بۆ دەکرێ.

ئەم بەکتریایە لە ئافرەتدا توشی زێ دەبێت لەوێش توشی ڕەحم و دەزگای فالوب و هێلکەدانەکان دەبێت وە دەبێتە هۆی نەخۆشی ئلتهابی حەوز دەبێتە هۆی ئازارێکی زۆر زۆر و بێزارکەر وە دەبێتە هۆی گوێزەرەوە لەکاتی جووتبوندا وە لەوانەیە ببێتە هۆی گیرانی دەزاگی فالوب کە دەبێتە هۆی ڕێگری لە دووگیانی یان دەبێتە هۆی دروست بونی دووگیانی لە دەرەوەی ڕەحم .

-لە پیاواندا دەبێتە هۆی ئازارێکی زۆر وە هەروەها دەبێتە هۆی کەم هاوێشتن و منداڵ نەبوون

-کاتێک لە خوێن بڵاو دەبێتەوە هەر یەکە لە پیاو ئافرەتدا توشی ئلتهابی مفاصل دەبن یان تێکچونی دەماری دڵ یان ئلتهابی پەردە تەنکی مێشک یان حبل شوکی ئەو حاڵەتانە شازن بەڵام ترسناکن

**چارەسەری ئەم نەخۆشیە**

عادەتەن بە یەک جار چاک نابێت دەرزی Ceftriaxone وە حەبی (azithromycin) وەردەگرێ بەلکو دەبێ بۆ چەند ڕۆژێک بەردەوام دەبێت تا نەخۆشەکە هەست بە ئارامی دەکات،

## لەکاتی سەردانی کردنی پزیشک

١- نیشانەکانت بڵێ ٢- کۆتا کاتی جووتبوون بڵێ ٣- ئەگەر نەخۆشەکە ئەم بەکتریایەی هەبوو پێویستە هاوبەشەکەی ئاگادار بکاتەوە لەکاتی سەردانی کردنی پزیشک.



# Urin free cortisol Test

ئـەم پشـکنینە دەکـرێ بـۆ پێوانـە کردنـی رێـژەی کۆرتیسـۆل لـە میـزدا، کۆرتیسۆڵ ئـەو هۆرمۆنەیـە کـە غـودەی کظری دەری دەدات کـە دەکەوێتـە سـەر سـەروی گورچیلـە (کلیـە)

فەرمانەکانی کۆرتیسۆل چیە:-

١- دەست دەگرێت بەسەر رێژەی شەکرە

٢- پەستانی خوین رێک دەخات

٣- دژی نەخۆش شەر دەکات

٤- دەوری هەیە لە رێکخستنی مەزاج

٥- دەوری هەیـە لـە کاری خۆراکی و کاربۆهیدراتی، چەوری پرۆتیناتەکان، ئاسـتی کۆرتیـزۆل بەرزدەبێتـەوە بەشـێوەیەکی ئاسـای وە کـەم دەبێتـەوە بـە درێژای رۆژ عادەتـەن بـەرزە لـە کاتـی شـەو رێژەی کەمـە.

**بە چەند رێگایەک ئەم پشکنینە دەکرێ**

یەکـەم رێـگای میـز رێـژەی کۆرتیـزۆل دیـاری دەکرێ لـە بـۆ مـاوەی ٢٤ سـەعات بەهەڵگرتنـی میـز بـۆ مـاوەی ٢٤ سـەعات.

دووەم رێگا لـە خوێن دەکرێ بەڵام زۆر دڵنیا نابێت لـە ئەنجامەکە چونکـە لەوانەیـە ئـەو کەسـە لـە کاتـی کردنـی پشـکنینە لـە مەزاجێکـی بـاش نەبوێت یان لە کاتی دیاری کراو پشکنینە نەکردبێت دکتۆر داوا دەکات کـە نیشـانەکانی نارێکـی کۆرتیـزۆل هەسـت پـێ بـکات

**نیشانەکانی بەرز بونەوەی ئاستی کۆرتیزۆل**

١- نەخۆشی متلازمە کوشنج

٢- زیاد میز کردن

٣- نیشتنی خانەی چەوری
٤- دروست بونی رەنگی وەردی یان ئەرجوانی لەسەر پێست
٥- قەڵەو بون
٦- لاواز بونی ماسولکەکان
٧- بۆ ئافرەتان دەبێتە هۆی نارێکی لە پرچ و دەموچاو سینگ و وە لە مندالدا درەنگ کەوتنی گەشەو میشک.

**ئەنجامی ئاسای ئەم پشکنینە ١٠-١٠٠ ملگرام بۆ ٢٤ سەعات**

ئەنجامی نائاسای ئەم پشکنینە هەموو جارێک بەرزی بە هۆی نەخۆشی متلازمەی کوشەنج نیە بەلکو بەهۆی زیاد دەردانی لە لایەن کظریەوە بەهۆی بوونی وەرەم گرێ لەسەر غودەی کظری.

خواردنی هەندێک دەرمان کە کاردەکاتە سەر کۆرتیزۆل وەک کحول کافایین وە هەروەها بەهۆی پەستی تورەی زیاد دەکات.

کەمی ئاستی کۆرتیزۆل عادەتەن نیشانەکانی دیار نابی تەنها کاتی شلەژانی تورەی بەڵام زیادەکات لەگەڵ بەرەو پێشچونی نیشانەکانی دیاردەکەون.

١- کەمبونی کیش
٢- سەرسوران
٣- لە هۆش خۆچوون
٤- ئازاری سک
٥- سکچون

کاتێک ئاستی کۆرتیزۆل زۆرنزم دەبێت کە ئەمەش هەرەشەیە لەسەر ژیانی نەخۆشەکە کە دەبێتە.

## هۆی ناتەواوی لە غودەی کظری نیشانەکانی

١- رەشبونی پێست ٢- رشانەوە ٣- سکچون ٤- بێتاقەتیەکی زۆر ٥- لە هۆش خۆچون ٦- تاو لەرز ٧- نەخواردن ٨- ئازاری خواردنی پێست ٩- ئازاری سک و قاچ ئەگەر ئەم نیشانانەی پێوە دیار بوو دکتۆر یەکسەر چارەسەری بۆ دەنوسرێ.



## Dexa stimulation Test

ئەم پشکنینە بەکاردێ بۆ جیاکردنەوەی نەخۆشی کوشینج یان نەخۆشی تر بەهۆی بەرزی ئاستی کۆرتیزۆل، دەرمان بە شێوەیەکی کەم (١-٢مغ)بەشێوەیەکی زۆر (٨)ملغ دەدرێت بۆ زانینی ئاستی کۆرتیزۆل. پێش کردنی ئەم پسکنینە دەرزی دیکسامیثارون لێدەدرێ بۆ زانینی ئەنجامی ئاسای نزم بوونی ئاستی کۆرتیزۆل ئەگەر نزم بوو ئەوا نەخۆشی کوشەنجی نیە، وەلام دانەوەی بە دەرزی دیکسامیثارون عادەتەن بەکاردێ بۆ شیکردنەوەی نەخۆشی متلازمە کوشنج.

**لەکاتی کردنی ئەم پشکنینە بە دوو ڕێگا دەکرێ**

١- لە شەو ڕۆژێکدا سەعات ١١ شەو دەرزی دیکسامیثارون لێ دەدرێ بەیانی سەعات ٨ خوێنەکەی لێ وەردەگیرێ.

٢- کۆکردنەوەی میز بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ کۆکردنەوەی میزەکە لە ماوەی ٢٤ سەعات وەردەگیری بەجیا دادەنرێ، پاشان بۆ دیاری کردنی ئاستی کۆرتیزۆل دوای وەرگتنی ٠.٥مغ دەرزیەکە وەردەگری لە هەر ٦ سەعات جارێک ئەم دەرزیە وەردەگیری دوای لە تاقیگە پشکنینی بۆ دەکری.

ڕێژەی ئاسای لە ڕێگای یەکەم ٥ مگرامە

لە ڕێگای دووەم لە ڕۆژی سێیەم ١٥ مگرامبێت

**ئەگەر ئەنجامەکە ئاستی کۆرتیزۆل ئاسای بێ ئەوە چی دەگەیەنێ**

ئەگەر وەلامی دەرزیەکە نەداوە واتە کوشەنجە لەوانەیە بەهۆی بونی گرێ کظری کە کورتیزۆل دەردەدات بونی وەرەم لە غودەی نخامی یان بونی وەرەم لە لەش دا

**شێوەکانی لە تاقیگەدا**



متلازمە کوشەنج دەرباز بوو بە وەرەمی کظری
دەرزی کەم = نەگۆڕ
دەرزی بەرز = نەگۆڕ
متلازمە کوشەنج پەیوەندی بە وەرەم هەیێ
١- نەگۆڕ
٢- نەگۆڕ
متلازمە کوشەنج وەرەمی غودەی نخامی
دەرزی کەم = نەگۆڕ
دەرزی بەرز= ئاسای
کاریگەری لاوەکی ئەم دەرزیە بۆ سەر نەخۆشەکە
١- نەزیف بونی زۆر
٢- لەهۆشچون یان سەرسوڕان

# Urine metanephrine Test
# (Metanephrine) واتا بێ پلازمایە

ئەم پشکنینە بەکاردێ بۆ زانینی وەرەمێکی دیار کە پێ ی دەڵێن phechromocytomas وە هەروەها ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ دوور بون لە وەرەمی قاتم یان هەر گرێیەکی نادر لە غودەی کظری دوای لابردنی گرێش ئەم پشکنینە دەکرێ، لە میز دەکرێ چونکە هۆرمۆنات دەگۆڕێ لە خوێن و زۆر نامێنێتەوە، بۆ ماوەی ٢٤ سەعات میزەکە دەبێ ئامادەبکرێ پاشان دەبرێتە تاقیگە بۆ ئەوەی نیشی لەسەر بکرێت، ئەو گرێیانە هۆرمۆنی زیاد دەردەن پیان دەوترێ کاتیکۆ لامینات

کاتیکو لامینات دەردەدرێ لە غودەی کظری وە ئاستی دەگۆڕێ بە پێی پەستانی لەش و عاطفەی وە لەوانەیە بگۆڕێ بەهۆی:

١- پلەی گەرمی دەرەوە
٢- خوێن بەربون یان خوێن کەمی
٣- وەرزشکردن
٤- کەمی شەکر لە خوین
٥- لە هەستان و دانیشتن وە بە پێچەوانەوەش

**وەرەم قاتم:** ئەو گرێیە لە ناو غودەی کظری دروست دەبێت وە گەورە دەبێ پێویستە لاببرێ چونکە گەر لانەبرێ لەگەڵ غودەی کظری کاردەکەنە سەر پەستانی خوێن وە ترسی شیرپەنجە و گواستنەوەی بۆ بەشەکانیتریش لێ دەکرێ.

**نیشانەکانی وەرەم قاتم**

١- بەرزبونی پەستانی خوێن
٢- لێدانی دڵ بە خێرای
٣- ئارەقەکردنێکی زۆر
٤- کەم بونی کێش
٥- ژانەسەرێکی بەرز ماوە بۆ ماوە

٦- پێست وشکی
٧- بونی قەڵەقیەکی زۆر بێ هۆ
نیشانەکانی بەرەو پێشچونی گرێیەکە
١- ئازارێکی زۆرو شین بونی ژێر پێست
٢- کەمبونی کێشی زۆر بێ هۆ
٣- ئازاری سینگ و سک و پێست و ئێسک
٤- گەورەبونی سک
٥- ئەستوربونی لاق
٦- رەشبونی ژێر چاو
٧- تا

**چ خواردن و خواردنەوەیەک کاردەکاتە سەری**

١- قاوە ٢- چا ٣- شکولاتە ڤانیلا ٤- دەرمانی هەستەوەر(حساسیە)
٥- خواردنی وەک جوز و ئافۆگادۆ مۆزو پەنیر

بەرزی ئەم پشکنینە دەلالەت لە بونی وەرەم قاتم دەکات بەڵام پێویستی بە پشکنینە ترە بۆ تەکید کردنەوەی لە بونی وەرەم.

بونی زیاد دەردانی کاتیکولامینات وەک تەقینەوەیەکی ئلتهابی دەبێت کە تیدا کاریان رێکخستنی
١- لێدانی دڵ ٢- پەستانی خوێن ٣- شەکرە.



# Gynco disease

# نەخۆشی ئافرەتان

## TORCH PANEL Test

ئەم پشكنینە دەكرێ بۆ زانینی چەند نەخۆشیەك كە دەبێتە هۆی دروستبوونی نارێكی لەمندالی تازە بوودا، كاتێك مندالْ دەبێت بە نارێكی كە دەرباز بوە واتا نەمردوە بەلام با ناتەواوی لە دایك بوە

لە توشبونی ئەو نەخۆشیە كە ئافرەتە دووگیانەكە توشی هەندێ نەخۆشی بوە لەماوەی دووگیانیدا، وە كۆمەڵێ پشكنین دەكرێ بۆ ئەوەی بزانرێ دژە تەن هەیە لە لایەن كۆئەندامی بەرگری كە وەڵام دانەوەیە دژی ئەم نەخۆشیە.

**چ كاتێك گونجاوە ئەم پشكنینە بكرێ**

١- قەبارەی بچوكە لەچاو تەمەنی دووگیانبونەكە

٢- كەڕ بون

٣- درەنگی گەشە

٤- بونی عەیب لە دڵ

٥- گەورەبونی دڵ

٦- كەمبونی پەرەكانی خوێن

هەندێك جار ئەم پشكنینە بۆ ئافرەت دەكرێ پیش دووگیانی یان لە كاتی زووی دووگیانیدا ئەگەر ئەم پشكنینە ئەرێنی بێت ئەوا ئەگەرێكی زۆری هەیە كە تووشی ئەم ڤایرۆسە بوبێ.

**تێبینی-** ئەم پشكنینە دەكرێ بۆ ئەو ئلتهاباتە كە زەرەر بە مندالْی ناو سكی دایكی(جنین) دەگەیەنێ لە ماوەی دووگیانیدا.

ئەم پشكنینە پێنج جۆر دەگرێتەوە.

(TOXO PLASMA(IGG-IGM
(RUBELLA (IGG-IGM
(CMV(IGG-IGM
HSV
Including syphilis

Toxo plasma: عادەتەن لە پیسای پشیلە دەگوازریتەوە کە لە دایک دەگوازرێتەوە بۆ منداڵ کە منداڵ توشی ناڕیک لە دایک بون دەبیت ئەگەر چارەسەر نەکرا دەبێتە هۆی (کوێری و کەڕی و جەڵتە و ناتەوازنی لە میشک).

Including syphilis: ئەم نەخۆشیە دەگوازرێتەوە بەهۆی پەیوەندی جووتبون کە لە دایک لەوانەیە بگوازرێتەوە بۆ منداڵ کە دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ بە مردوی لە دایک ببێت یان لەوانەیە ببێتە هۆی زوو لە دایک بوون وە نارێکی لە دروست بونی یان کەمی کێش یان کەڕی.

Rubella: ئەم نەخۆشیە پێی دەڵێن سورێژەی ئەلمانی نەخۆشیەکی ڤایرۆسیە کە بە ئاسانی لە کەسێکەوە بۆ کە سێکی تر دەگوازرێتەوە بەهۆی پژمینی کەسی توش بوو یان سک چون لە ئافرەتی دووگیاندا ئەگەر توش بێت بەو ڤایرۆسە لەوانەیە بگوازریتەوە بۆ منداڵ کە دەبێتە هۆی حاڵەتێکی ترسناک کە دەبێتە هۆی لەبارچونی بونی منداڵ زووتر لەکاتی دیاری کراودا، بونیمندال بە مردوی یان نارێکی لە گەشە.

Cmv: باوترین ناریکی دروستبونی منداڵە لە منداڵی تازا لە دایک بوو کە دەبێتە هۆی کەڕی و نارێکی گەشەو کەم ئەقلی،

Hsv: دەگوازرێتەوە لە رێگەی جووتبون ئەگەر کەسەکەی بەرانبەر توش بوو وە لە کاتی دووگیانی کە دەبێتە هۆی کەمی کێش وە لەبارچون وە زوو مندال بوون پێش کاتی دیاری کراو، وە کاردەکاتە سەر پێست و چاو و دەم وە ناریکی لە دەماغ، دەبێتە هۆی کێشەی ترسناک بۆ ناسەقامگیری بۆیە

پیویستە لە ئاستەکانی زووی نەخۆشەکە بزانرێ بۆیە پێویستە بە زووی ئەو پێنج پشکنینەی سەرەوەی بۆ بکرێت.

Torch Panel

Test Details

- TOXOPLASMA GONDII: IgG & IgM
- CYTOMEGALO VIRUS: IgG & IgM

MEDILAND

DIAGNOSTIC INSTITUTE

## Androgrn panal Test

ئەندرۆجین بە هۆرمۆنی پیاوی زیاتر دەناسرێ بەڵام دەورێکی گرنگی هەیە لە ئافرەتانیشدا، لە پیاودا پشتگیری دەکات لە دروستبونی سپێرم وە پەرە پێدانی توانای چووتبون لە پیاودا.
لە ئافرەتدا ئەندرۆجینات دەردەدرێ لە هێلکە و غودەی کظری کە ئەندرۆجینات بەشیکی زۆری دەگۆرێ کە ئافرەت دەری دەدات بۆ هۆرمۆنی الاسترۆجین، الاسترۆجین هانی توانای چووتبون دەدات وە هەروەها کاردەکات لە سمەکی بطانەی رەحم وە رێکخستنی سووری مانگانە، ئەو الاندروجیناتەی ناگۆرێت بۆ الاسترۆجین دەورێکی گرنگیان دەبێ لەبەتوانا بونی چووتبون وهێواش کردنەوە.
لە ئافرەتدا بەرزی ئەندرۆجین دیارترین نیشانەیە کە دەلالەت لەبونی لەکارکەوتنی هێلکە دەکات، ئەگەر کێشە هەبوو لە دووگیان بوون ئەواپشکنینی ئەندرۆجین دەکرێت بۆ ئەوەی بزانری هۆکاری ئەمەیە کە دووگیان بون دروست نەبێ.
لەو ئافرەتانەی کەوا مووی زیادیان لێ دێت یان دەنگ گرپان هەیە وە هەندێک جار کە دکتۆر گومان دەکات کە نەخۆشەکە کیسس هەیە بۆیە دکتۆر ئەم پشکنینی بۆ دەنوسێ.

### کەی ئەم پشکنینە بکرێ باشە:-



دەتوانری لە هەر رۆژێکی سووری مانگانە دا بکرێت، لە پیاوان لە هەموو کاتیک دەکرێ، بەرزی ئەندرۆجین واتا گرێ ی هێلکەی هەیە کە خاوێن نیە واتە گرێیەکی پیسە، بۆیە دکتۆر داوا دەکات کە گرێیەکە لابیرێت.

## Post Coital Test

ئەم پشکنینە دەکری کاتی درەنگ کەوتنی دووگیان بوون، هۆکاریکە بۆ درەنگ کەوتنی دووگیان بوون لە ئافرەتدا زۆر پشت بەو پشکنینە دەبەستریّ لەلایەن دکتۆرەکانەوە، سەرەرای گرنگی وە دەبێتە هۆی درەنگ کەوتنی دووگیان بوون لە هەندی ئافرەتدا،

ئەم پشکنینە پیّ ی دەوتری پشکنینی دوای جووتبون کە رۆژی هێلکەدانان دیاری دەکریّ بە پیّ ی سوری مانگانە بە پیّ ی رێنمای دکتۆر وە جووتبون لەوکاتە دەکریّ، وە پاش شە ش سەعات دوای جووتبون نمونە وەردەگیری لە زیّ رەحم بۆ بینینی مەنی تاوەکو بزانریّ کە ئاسایە یان جولەیان ئاسایە ئەمە ئەوە دەگەیەنی کە ئافرەتەکە هیچ کێشەیەکی نیە لەلایەن ئەو شلە لینجەی کە دەردەدرێت لە عەنقەی رەحم وە کێشە لە شلەی مەنیەکە دا هەیە ئەوکات، بەڵام لە کاتی نەبونی مەنی لە دەوری عنق رەحم یان بینینی مەنی بە مردویەتی یان نەجولاویێت ئەوا واتە کێشەی لە شلەی دەردراوی عنق رەحم هەیە ئەوەی دەری دەدات دژە تەنەکان نایەڵن مەنیەکان رەحم ببرن ئەمەش وادەکات کە تلقیح صناعی لیّ دەدرێت بەڵام پێش ئەوە چەند جارێک پشکنینە دووبارە دەکریتەوە،

لێرە وا بۆمان دەردەکەوێت لە ئافرەت دا هێلکەی پێگەیشتوو باش هەیە وە پشکنینی پیاوەکە باشە بەڵام دووگیانی روونادات بەهۆی بوونی دژە تەن کە لە شلەی عنق رەحم هەیە ئەو دژە تەنانە هەلدەستن بە کوشتنی مەنی پێش ئەوەی بگاتە قناتی فالوب، وە هەندیّ جار ئەو دژە تەنانە لە مەنی پیاوەکە خۆی دا هەیە هەروەها ئەویش وادەکات مەنی بمرێت،

**تێبینی:** بوونی گرێی خاوێن لە رەحم
لێرەدا دەردەکەوێ کە عنق رەحم دەورێکی گرنگی هەیە لە بونی منداڵ هەروەک چۆن ئێستا پشکنین و دەرمان ئاسان بوە بەڵام دکتۆرەکان گرنگی نادەن بە گرنگی عنق رەحم بۆ منداڵ بوون.
بۆیە پێویستە پیاوەکە Immunobed test بکات ئەو پشکنینە دیاری دەکات ئایا دژە تەن هەیە لە پیاوەکە یان نا دژی مەنی کە پێ ی دەوترێ (ASA-anti sperm antibodies) بوونی ئلتهابات لە عنق رەحم نایەڵێ دووگیان دروست بێت هەرچەندە هێلکە باش پێگەشتوو بێت و مەنیەکانیش هیچ کێشەیان نەبێت
کێشەی رەحم دەکرێ بە دوویەش
١- عیوب خلقیە(عەیبی دروست بوون)
١- رەحم تەسک بێت ٢- سورانی رەحم
٢- ئلتهاباتی عنق رەحم
دەورێکی گەورەی هەیە لە نەبوونی دووگیان بون بە تایبەت ئەو ئلتهاباتەی کە توشی دەبێت بەهۆی توش بوون بە میکرۆبی کلامیدیا کە ئەو ئلتهابە وا دەکات مەنی ئەو ژینگەی تێ ی دایە بیگۆڕی و وادەکات بێ هێز بێ بمرێ.
شلە کە دەورێی عنقی رەحم دەدات دەورێکی گرنگی هەیە چونکە ئەو رێگا بە تۆ دەدات بچێتە ناو عنقی رەحم وە تێپەربون بۆ ناو فالوب.



# IUI Test
# Intrauterine insemination

ئەم پشکنینە بۆ پیتاندن دەکرێ،کە تێدا تۆ لە پیاوەکە وەردەگیری پاشان لێدانی دەرزی تایبەت بەو پشکنینە کە مەنی تێدایە لە رەحمی ئافرەتەکە دەدرێ بۆ ئاسانتر کردنی پیتاندنی ئەم تۆیە دەگاتە قەناتی فالوب.

**کەی دەکری ئەم پشکنینە:**

١- نەزۆکیەکی بێ هۆ ٢- بونی نەخۆشی لەوانەیە لە شلەی عنق رەحم

٣- کەم هاوێشتنی تۆ

کەی نابێ ئەم دەرزیە لێ بدرێ:

١- ئەو خانمانەی کە نەخۆشی قەناتی فالوبیان هەیە

٢- ئەو ئافرەتانەی کە مێژویان هەیە لەگەڵ ئلتهاباتی زۆر

٣- ئەو ئافرەتانەی نەخۆشی بطانەی رەحمیان هەیە

**تێبینی-** رێژەی سەرکەوتنی ئەم پشکنینەکە ٢٠%

تلقیح صناعی: بریتیە لە ناردنی تۆی پیاو بۆ رەحمی ئافرەت لە رێگەی دەرزی تایبەت بەو پشکنینە کە تۆی پیاوی تێ دایە.

**کاتێک دەکرێ:-**

١- کاتێک پیاو تەمەنی تێپەڕاندوە و ناتوانی نەوە بنێتەوە

٢- کاتێک پیاو زوو تۆی دێتەوە و ناچێتە عنق رەحم

٣- کاتێک تۆی هێواشە لە جولە

٤- کاتێک ئافرەت زۆر حەساس و دەبێتە هۆی رەق بوونی ماسولکەی مهبل لەکاتی جووتبون وە پێی دەوترێ تەشەنوجی مهبل.

٥- کاتێک ئافرەت توشبوە بە بەرگری خودی کە دەبێتە هۆی کوشتنی تۆی پیاو کە لەکاتی دروست بونی و پێگەشتنی هێلکە لە کاتیکی دیارکراو کە دکتۆر دیاری دەکات تۆی وەرگیراو دەبرێتە تاقیگە دەشوریت لەلایەن کادیری تاقیگە و پاشان بە هۆی دەرزیەکە دەبرێتە ناو رەحم.

**لەچ کاتێک تۆی پیاو بەکارنایەت بۆ تلقیح**

١- کاتێک تۆی پیاوەکە هەمووی مردوبون یان ناجولێن یانیش بە دەرمانیش چاک نابن

٢- کەمی ژمارەی تۆی کە کەمترین لە ٨ ملیون لە ملیلتریک ئەگەر لە جۆری هێواش بوو

٣- لە کاتی لادانی غودەپرۆستات لە پیاودا

٤- کاتێک پیاو تایبەت مەندی بۆماوەی هەبوو کە شک دارە بۆ سەلامەتی وەک کەم عەقل و شێتی .

٥- کاتیک تاقیگە ئیشارەت دەکات کە کرۆمۆسۆمی پیاو نەگونجاوە لەگەڵ کرۆمۆسۆمی ئافرەتەکە بەهۆی نزیکی خزمایەتی،

٦- کاتیک ئافرەت مندالی تری ناتەواوی بوو

**دوو رێگا هەیە بۆ تلقیح**

١- کە پشت دەبەستێ بە پێگەشتنی هێلکە

٢- بەهۆی دەرمانی کلومید هێلکە پێنەگەشتوەکە پێ دەگەیەنرێ

**تێبینی-** پێویستە لەسەر پیاو ٣٦-٧٢ سەعات جووتبون نەکات پێش تلقیح وە پاشان دەتوانرێ جووتبون بکرێت تەنها ئەگەر نەزیف بون هەبوو لەکاتی تلقیحەکە پێویستە ٤٨ سەعات چاوەڕێ بکەن.

**مانای شوشتنی تۆی پیاو چییە؟**

یەکێکە لە رێگاکان لە تاقیگە بەکاردێ کە تۆی جیا دەکاتەوە لە شلەی تۆ وە بۆ جیاکردنەوەی تۆ جولاو نەجولاو بۆ ئامادەکردنی بۆ تەلقیح صناعی IUI یان IVF.





# Anti sperm Ab Test

کۆئەندامی بەرگری دژە تەن دروست دەکات ئەو دژە تەنانەش دژی تۆی پیاو دەوەستن کە تێدا کۆئەندامی بەرگری بەهەڵە لە دژی تۆیەکە لە شلەی تۆ دەوەستن لە ناویان داباو دەیانکوژێ. لەوانەیە ئەم دژە تەنە لە ئافرەت وە لە پیاو دا دروست بێت زۆر گرانە کە وا منداڵیان ببێت، هۆکارەکانی لە پیاواندا.

١- بە هۆی نەخۆشی پرۆستات ٢- وەڵام دانەوەی بەرگری بە هەڵە

٣- بەهۆی نەشتەرگەری گون ٤- نەخۆشی گون ٥- دەوالی گون

٦- لەوانەیە دژە تەن لە ئافرەت دا دروست بێ دژی تۆی پیاو

٧- شێرپەنجە گون ٨- سەدمەی دەرونی.

**چارەسەری ئەم دژە تەنە چیە:**

١- لە پیاودا دکتۆر دەرمانت دەداتی بۆ کەم بونەوەی وەڵام دانەوەی دژە تەنی بەرگری.

٢- لە ئافرەتدا بە لێدانی تلقیح صناعی.



# First trimester Test
# Quandriple test

ئـەم پشـكنینە دەكـرێ بـۆ زانینـی توشـبونی كۆرپەڵـە بـە ناتـەواوی لـە كرۆمۆسـۆمەكانی ئـەو ناتەواویـەی كـە دبینرێتـەوە بـەم پشـكنینەكە لـە كرۆمۆسـیۆمی ١٣-١٨-٢١ كـە تێدا پشـكنینی خوێـن لـە سـێ مانگـی یەكەمـی حەمـل ئـەم پشـكنینە دەكرێ كـە پشـكنینی (سـماكە رقبـە)ی بۆ دەكرێ، بینراوەتـەوە كـە ترسناكی دروستبونی ناتـەواوی كرۆمۆسـۆمی ٢١ زیـاد دەكات هەرچەنـد سـمک رەقبـەی كۆرپەلـە زیـاد دەكات .

**ئەو پشكنینانەی پێویستە بیكات:**

١- جۆری خوێن ٢- CBC ٣- دژە تـەن (مناعـە) ٤- سۆریكەی ئەلمانی
٥- VDRL ٦- ڤایرۆسی كەمی مناعە ٧- ڤایرۆسی B

پێویسـتە پشـكنینی ژێ مەوجـات سـەروی دەنـگ بـۆ زانینـی بونـی یـان نەبونـی نەخۆشـی متلازمـە داون كـە لـە ١١-١٤ هەفتـە دەكـرێ

پشـكنینی DNA لـە دوای ١٥ هەفتـە لـە دووگیـان بـوون دەكـرێ بـۆ زانینی نەخۆشی كرۆمۆسـۆمی و چینی وە هەروەها بۆ هەندێک نارێكی لە دروسـت بونـی بەهـۆی بۆماوییـ.

**ئەم پشكنینە بۆ چی دەكرێ:**

- بۆ زانینی نەخۆشی خوێنی منجلی
- بۆ زانینی هەرناریكی و ناتەواویەک لە كۆرپەلە
- وە هەروەهـا دەكـرێ بـۆ زانینـی بونـی ناریكـی لـە دڵ وە لایەنـی دی نارێكـی بەشـی تـری كۆرپەلـە

**پشکنینی هەرسێ پرۆتین دەکرێ وەک:**

١- پرۆتینی کۆرپەلە(alpha-AFP)

٢- غودەی تناسلی( HCG )

٣- استریولی سەربەست (free estriol)

وە هەروەها پشکنینی ژێ سەروی دەنگی بۆ دەکرێ

کە بەینی جلەو رەقبە و فقرات غضبەی دیاری دەکات

زیادبونی پرۆتینی ئەلفا توشبوون بە شێواندنی زیاد دەکات لە کۆئەندامی هەستەوەر کە دەبێتە هۆی کرانەوەی دیواری سک نەخۆشی گورچیلە کە پەیوەندی پرۆتینی هەیە لە میزدا، توشی نەخۆشی پێستی دەبێت منداڵەکە ئەمەش دەبێتە هۆی ترسناکی دووگیانی کە دەبێتە هۆی زوو لە دایکبونی کۆرپەلە وە کەمی ئەم پرۆتینە دەبێتە هۆی نەخۆشی کظری لە کۆرپەلە.

# Quandriple test

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی منداڵ کە توشی بوە بە مەنگۆلی یان توش نەبوە خوێنەکە وەردەگیری لە دایکی دووگیان یان بەمتلازمە داون لە کرۆمۆسۆمی ٢١ کە پیویستە سێ پشکنینی پرۆتینی بۆ بکرێ هەمان نیشانەکانی First trimester test هەیە.




(a) Amniocentesis

# Triple Test

ئەم پشکنینە دەکرێ لە سێ مانگی یەکەمی دووگیانی بۆ زانینی ئایە کۆرپەلە توشی مەنگۆلی بوە یان توش نەبوە بۆیە پێویستە ئەم سێ پشکنینی بۆ بکەین (AFP-HCG-Estriol).

١- الفامیتوپروتین:- مادەیەکی پرۆتینی یە کۆرپەلە دەری دەدات

٢- حاڵە مشیمە:- هۆرمۆنێکی مشیمە دەری دەدات

٣- الاستریول:- هۆرمۆنێکە کە مەشیمە و کۆرپەلە دەری دەدات

چۆن دەکرێ پشکنینی سێ مانگی یەکەمی خوێن لە دایک وەردەگیری.

## کەی پێویستە ئەم پشکنینە بکرێ

لە ماوەی ١٥-٢٠ هەفتە پێویستە بکرێ وە باوترینیان لە ماوەی ١٦-١٨یە.

## بۆ کێ پێویستە ئەم پشکنینە بکرێ

بۆ هەموو ئافرەتێکی دووگیان بەڵام زۆر تەکید لە ئافرەتانە دەکرێنەوە کە نەخۆشی بۆماوەیان هەیە

١- بونی پێشوی خێزانی لە چینەکان

٢- بۆ هەموو ئافرەتێک کە تەمەنیان سەروی ٣٥ساڵە

٣- خواردنی دەرمان لە لایەن دایکی دووگیانەوە کە زیان بە کۆرپەلە دەگەیەنێ

٤- بونی نەخۆشی شەکرەو خواردنی ئەنسولین لە کاتی دووگیانی

٥- بونی گومانی ڤایرۆسی لە دایکی دووگیان

٦- زۆر بەرکەوتنی کەسی دووگیان بە تیشک

**پ- چ نەخۆشیەک دەبینرێتەوە بەهۆی پشکنینی سێنەی دووگیان؟**

**وەڵام:** پشکنینەکە بەراورد دەکری بە تەمەنی دایک کێشی و وە تەمەنی دووگیانیەکەی وە ئەو پشکنینە دەکرێ بۆ ئەوەی بزانی کۆرپەلە تا چەند زەرەری بەرکەوتوە وەک

١- نارێکی کۆئەندامی مێشک لە کۆرپەلە بە تایبەتی شۆک مشقوق (انشقاق صلب) وەک کەمی سحائیە قطنیە وە نەبونی جومجومەی دواوە ئەو کێشانە دەزانرێ بە بەرزبونی الفا فیتۆپرۆتین لە خوێنی دایک پێویستە بە هیچ جۆرێک هەڵە لە تەمەنی دووگیان بونەکە نەکرێ رونکردنەوەیەکی هەڵەت دەداتێ

٢- بەڵام لە کاتی نزمی الفا فیتۆپرۆتین لەگەڵ ناناسای الاستریول و HCG کە دەلالەت لە بونی کۆرپەلەیەکی ناتەواو دەکات وەک مەنگولی

٣- بونی دووکۆرپەلە لە یەک سك دا

٤- بونی هەڵەیەک لە حساباتی دووگیانی



# Tumor marker

# نیشانەدەری نەخۆشی شێرپەنجە

## ACE Test
## Angiotensin converting enzyme

ئەنزیمێکە یارمەتی رێکخستنی پەستانی خوێن دەدات وە ئیش دەکات لە زۆر بەشی لەش وەک هەستەوەرەکانی مێشک و جەرگ و دڵ و سی یەکان دیارترینیان نیشانەی دروست بونی گرێی بچوک (وەرەم)

ئەو ئەنزیمە بەشێوەیەکی سەرەکی لە سی یەکان بەرهەم دێت کاریشی رێکخستنی پەستانی خوێنە بەهۆی گۆرانی (انجیوتنسین یەکەم) بۆ (انجیوتنسین) کە هەڵدەستێ بە فراوان کردنی دەمارەکان بۆ رۆشتنی Al dosterone لە غودەی کظری دایە

**کەی ئەم پشکنینە دەکرێ :-**

کاتێک گرێ ی بچوک دروست دەبێ لە ژێر پێست

نیشانەکانی نزمی ئەم پشکنینە کە نەخۆشەکە توشی یەکێک لەو نەخۆشیانە بووە:-

١- کورتیکو ستیروئیدات

٢- ئەو دەرمانانەی کە دەبێتە هۆی کەم بونەوەی پەستانی خوێن

٣- لەکارکەوتنی دڵ کە دەبێتە هۆی چالاک کردنی الانزیمی وەک انالابریل یان کابتوبریل کە دەبێتە هۆی کەم بوونی ئاستی ئەنزیمەکە

٤- برسیەتی بۆ ماوەیەکی زۆر

٥- نەخۆشی سیل

٦- گرێی سیەکان

نیشانەکانی بەرزی ئەم پشکنینە کە نەخۆشەکە توشی یەکێک لەو نەخۆشیانە بووە:-

١- نەخۆشیەکانی سییل ٢- لەناوچونی سییەکان ٣- نەخۆشی التاهاباتێکی زۆر کە دەبێتە هۆی دروست بونی گرێ ی بچوک ٤- نەخۆشی جەرگ ٥- گیرانی سییەکان نەخۆشی غوشیە ٦- شێرپەنجەی خوێن ٧- شێرپەنجەی غودەی لیمفاوی ٨- زیادی کالیسوم ٩- نەخۆشی کظری .

**تێبینی-** ١- ئەو پشکنینە ناکرێ بۆ ئەو نەخۆشانەی کە لە ژێر تەمەنی ٢٠ ساڵی دان چونکە نەتزیمەکە بەرزە .

٢- لە سەدا( ٥)ی خەلکی ئاسای رێژەی ئەم نەخۆشیەیان زۆرە ئەو دەرمانانەی کە رێژەی کەم دەکات بۆیە پێویستە نەخۆش هیچ دەرمانیک نەخوا لە کاتی کردنی ئەم پشکنینە لە تاقیگە:-

١- کادیموم ٢- کابتوبریل ٣- استروجین ٤- ارجنین ٥- متروئیدات

**تێبینی-** لەوانەیە رێژەی ئاسای دەرچێ ئەوانەی نەخۆشی گرێی بچوکیان هەیە کاتێک چارسەری کۆرتیزۆل وەردەگرن.



# CEA Test
# Carcinoembryonic antigen test

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ چاودێری کردنی چارەسەری شێرپەنجە وە بۆ چاودێری کردنی چەند و چۆن وەڵام دانەوەی شێرپەنجە وە گەڕاندنەوەی سەر لەنوێ وە بۆ زانینی قەبارەو چەندیەکی، وە دەکرێ بۆ زانینی دیاری کردنی شێرپەنجە.

## کاتێک ئەم پشکنینە دەکرێ ؟

کاتێک کە دەزانرێ کە شێرپەنجەی قۆلۆن یان پەنکریاس یان سینگیان یان سیەکان یان هێلکەدان یان لە غودەی دەرەقی یان هەر شێرپەنجەیەکی تر پێش ئەوەی دەست بە چارەسەر وەرگرتن بکات وە لە کاتی وەرگرتنی چارەسەر و دوای تەواو بونی چارەسەرئەم پشکنینە دەکرێ .

**بە چەند رێگایەک دەتوانین نمونە وەرگرین بۆ کردنی ئەم پشکنینە:**

١- لە خوێن ٢- لە شلەی لەش وەک شلەی پرۆتینی لە ناوچەی سک یان شلەی بلوری لە سینگ

بەڵام هەندێ جار بەرز دەبێ وە ئەوەناگەینێ کە شێرپەنجە بێت، لەوانەیە بەرز بێت بەهۆی

١- جگەرەکێشان ٢- دووگیانی بەڵام گرنگی بەکارهێنانی بۆ دووبارە هاتنەوەی گرێ وە گرنگە بۆ چاودێری کردنی نەخۆشی دوای نەشتەرگەری ٣- نەخۆشی ئلتهاباتی قۆلۆن وەک ئلتهاباتی قۆلۆنی تقرحی، ٤- لەکاتی بونی قرحە معدە ٥- ئلتهاباتی پەنکریاس.

CEA- مادەیەکە لە سەروی خانەکان هەیە یەکێکە لە پرۆتیناتەکانی

سوكەری كە لە لایەن كۆئەندامی هەرس دروست دەكرێ لەكاتی گەورەبونی كۆرپەلە كە بە ئاستێكی زۆر كەم دروست دەبێ لە خوێن لە پاشان نامێنی.

**تێبینی:** لە پاش لابردنی گرێ ی شێرپەنجە و وەرگرتنی چارەسەر لە ماوەی ١-٤ مانگ دەگەڕێتەوە باری ئاسای خۆی.

**نیشانەكانی ئەم نەخۆشیە**

١- بونی ئازار لە سک ٢- بونی خوێن لە پیسای ٣- ئازارو غازاتی دووبارە بونەوەی لە سەر یەک

٤- هەست كردن بەوەی كە ریخۆڵە تەواو بەتاڵ نی یە ٥- كەم بونی كێش بە بێ هۆكار

٦- بەردەوام هەست كردن بە ماندوبون.



# VMA Test
# Vanillylmandelic acid

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ دیاری کردن و دووربون لە گرێی خانە سەرەتایەکان وەرەمی گرێی غودەی صم عصبیة وە بۆ زانینی کاریگەری ئەو چارەسەرەی کە وەری دەگرێ.

**چ کاتێك ئەم پشکنینە دەکرێت**

کاتێک هەستت بە گەورە بونی سکی منداڵەکەت کرد یان دەوری چاو یان نەتوانینی رۆشتنی یان ئازار لە ئێسک.

**پشکنینەکە چۆن وەردەگیرێ**

-کۆکردنەوەی میز بۆ ماوەی ٢٤ سەعات دەکرێ بۆ زانینی رێژەی الایبینیفرین والنورادینالین بەکاردی بۆ زانینی گرێی عصبیە و هیتر.

**بۆچی داوای میزی ٢٤ سەعات دەکرێت؟**

وەڵام: چونکە ترشی VMA دەگۆرێ لە ماوەی رۆژیکدا بۆیە داوای میز دەکرێت بۆ ئەوەی بزانرێ کە لەم ماوەیەدا چەند ئەم ترشە دەردەدات.

**تێبینی:** ترشی فانیلیک ماندیلیک لە میز دەردەدرێ لەگەڵ کاتیکولامینات وەک ترشی هومو فانیلیک، میتا نیفرین، لورمیتا نیفرین، بەرزی ئەم پشکنینە لە میز دەلالەت لە بونی وەرەم یان گرێ دەکات.



# CA125 Test
# cancer antigen 125

ئەو پرۆتینەیە لە خوێن دا دروست دەکرێ لەلایەن خانەی شێرپەنجەی هێلکە، دەکەوێتە سەروی خانەی وە هەندێک لە بونی خانەی ئاسایی بونی ئەم پشکنینە کە دەکرێ بۆ زانینی ئاستی شێرپەنجە لە خوێن کە دەلالەت لە بونی شێرپەنجەی هێلکە دەکات بەڵام حاڵەتی تریش هەیە دەبێتە هۆی زیادبوونی ئەنجامی پشکنینەکە.
وەک لەکاتی بونی سك و سوری مانگانە و هەندێ شێرپەنجەی تر جگە لە شێرپەنجەی هێلکە ئەم پشکنینە گرێی خاوێن و پیس لە یەک جیادەکاتەوە.

## ئەو نیشانانەی کەوا دەردەکەون لە ئافرەتێکی توشبوو

١- بینینی خوێن لە ئەندامی زاوزێ
٢- نارێکی لە سوری مانگانە
٣- ئەستوربونی رەحمی ئافرەت لەناکاو
٤- بونی ئازار لە ناوچەی پشت

## جۆرەکانی گرێ

١-گرێ ی خاوێن: ئەو خانانەی خاوێن و شێرپەنجەی نین لە لەش بلاو نابنەوە دەتوانی بە ئاسانی لابرێت بە لابردنی هێلکەدان یان ئەو بەشەی کە گرێیەکەی لەسەرە.
٢-گرێی پیس: ئەم جۆرەیان گرێ ی پیسە کە بڵاو دەبێتەوە لە لەش کە خانەی شێرپەنجەیەکان دروست دەبن لە لایەن ئەو گرێیە شێرەپەنجەیە کە دروست بووە.

## سێ جۆر گرێی هێلکەمان هەیە

١- گرێی خانەی جرثومی: دەست پێ دەکات لە هێلکەدان

٢-سنورمال تومروس: دەست پێ دەکات لە خانەکانی شانەی ضام وە استروجین و بروجیسترون بەرهەم دێت

٣- Epithelial tumores: ئەو گرێیانە دەست پێدەکەن لە سەر رووی هێلکەدان.

## هۆکاری بەرزبونەوە

١- ئیلتهاباتی بەتانەی رەحم

٢- بە شەمع بونی جەرگ

٣- بڵاوبونەوەی گرێ لە هەریەک لە سینگ و ناوەوەی رحم -جەرگ- لیمفگریەکان - هێلکەدان - پەنکریاس

٤- دەردانی هێلکە

٥- ئیلتهاباتی زۆری پەنکریاس

٦- نەخۆشی ئیلتهاباتی حەوز

٧- سک لە سێ مانگی سەرەتادا



# CA15-3Test
# Cancer antigen

ئـەم پشـکنینە دەکـرێ بـۆ چارەسـەرکردنی شـێرپەنجەی سـینگ وە بـۆ چاودێـری کردنـی هاتنـەوە و نەهاتنـەوەی شـێرپەنجە،

**کاتێک ئەم پشکنینە دەکرێ:-**

کاتێـک دەرمانی شێرپەنجەی سینگ وەردەگرێ یان نەخۆشـەکە دەرمانی تـەواو دەبێت بەشـێوەیەکی سـەرەکی بـەکار نایـەت بـۆ دەستنیشـانکردنی شێرپەنجەی سـینگ بـە تـەواوی بـەڵام دەورێکـی گرنگـە بـۆ زانینـی وەڵام دانـەوەی لەشی نەخۆش بۆ دەرمانـی شێرپەنجەکە وە هەروەهـا بـەرز دەبێت لـە کاتی بونی کیس هێلکـەی خاوێن وە لـە کاتـی لـە ناوچونـی جـەرگ.

**ئەم پشکنینە بەرز دەبێ لە هەندێ حاڵەتی ناشێرپەنجەی:**

١- لەناوچونی جەرگ ٢- نەخۆشی سیل ٣- نەخۆشی سینگ

٤- نەخۆشـی ئلتهاباتـی حـەوز ٥- نەخۆشـی بطانـەی رەحـم ٦- شـیردان و دووگیانـی ،

بەرز دەبێت لە کاتی بونی گرێ ی پیس یان شێرپەنجە:

١-شـێرپەنجەی سـیەکان(خانەی بچـوک) ٢-شـێرپەنجەی سـیەکان کـە خانـەکان بچـوک نیـن ٣-شـێرپەنجەی جەرگ٤-شـێرپەنجەی قۆلـۆن ٥-شـێرپەنجەی هێلکـەدان ٦-شـێرپەنجەی بطانـەی رحـم ٧-شـێرپەنجەی پەنکریـاس

**شێرپەنجەی سینگ چیە:-**

پاش هەرزەکاری سینگی ئافرەت پێک دێت لە شانە و غودەی بچوک کە شیر بەرهەم دەهێنێت لە کاتی بوونی شێرپەنجە خانەکان زیاد دەکەن بە شێوەیەک کە لەش ناتوانێت رێگری لە زیادبونەکە بکات.

نیشانەکانی شێرپەنجەی سینگ:-

١- بونی ئازار لە سینگ کە ناگۆرێ لەکاتی سورِی مانگانەدا

٢- سور هەڵگەرانی و گۆرانی بۆ رەنگی پرتەقالی

٣- گۆرانی بۆ شێوەی گۆ

٤- دەردانی شلەی ئاقو لە گۆ لەوانەیە خوێنی لەگەڵ بێت

٥- گۆرانی شێوەی قەبارەی سینگ

٦- هەڵومران یان شەق بونی پێستی سینگ یان گۆ

-عادەتەن شێرپەنجەی سینگ لە بطانەی ناوەوە دروست دەبێت لە دەزگای شیر وە لە وێوە بڵاودەبێتەوە بۆ بەشەکانی تری لەش،هیچ هۆکارێکی سەرەکی نیە وەکو ئێستا کە ببێتە هۆی دروست بونی شێرپەنجە بەڵام هەندێک هۆکار کاردەکاتە سەری وەک

١- تەمەن ٢- بۆماوەی٣- ئەو ئافرەتانەی کە وا پێشتر شێرپەنجەی سینگیان گرتوە ئەگەری هەیە دووبارە توش ببنەوە

٤- توشبون بە هۆرمۆنی الستروجین بۆ ماوەیەکی زۆر توشبونی بە شیرپەنجەی سینگ زیاد دەکات

٥- زیاد بونی قەڵەوی زیاد بونی کێش دوای لە سوری مانگانە چونەوە لە ئافرەتدا بەهۆی بەرزبونی هۆرمۆنی الاسترۆجین

٦- چارەسەری هۆرمۆنات زیاد لە پێویست یان خواردنی مەی یان دەرمانی دژە دووگیان بوون.

# CA19-9 Test
# Cancer antigen

ئەو پرۆتینەیە لە سەرویخانەی شێرپەنجە ی هەیە دەتوانرێ لە خوێن ببینرێت کاتێک خانەی شێرپەنجەی هەبێت لە رێگەی تاقیگە.
عادەتەن ئەم پشکنینە وەک نیشانەیەک بەکاردێ بۆ دیاری کردنی خانەی شێرپەنجەی پەنکریاس بەڵام ناتوانرێ بەتەنیا وەک یەک لاکەرەوەیەکی شێرپەنجەی دابنرێ بەکاردێ بۆ زانینی بونی شێرپەنجی پەنکریاس یان چەند جۆریکی تری شێرپەنجە، بەڵام هەندێ جار بەرز دەبێت بەبێ بونی شێرپەنجەی وەک بونی ئلتهاباتی پەنکریاس یان گیرانی قنات صفراء.

## بۆ چی دەکرێ ئەم پشکنینە:

١- بۆ زانینی وەڵام دانەوەی چارەسەری دەرمان لەچەند جۆرێکی شێرپەنجە.
٢- بۆ زانینی شێرپەنجەی پەنکریاس ئەگەر هەبێ بۆ زانینی ئایا هەر بەردەوامە لە گەشە یان هاتنەوەی شێرپەنجە دوای چارەسەر وەرگرتن.

## ئەم پشکنینە بەرز دەبێت لە هەندێ حاڵەتی نا شێرپەنجەی:

١- نەخۆشی جەرگ یان ئلتهاباتی جەرگ ٢- ئلتهاباتی زراو یان گیرانی زراو
٣- ئلتهاباتی پەنکریاس ٤- بوونی کیس ٥- نەخۆشی نارێکی لە کاری سیەکان یان گورچیلە یان کۆئەندامی هەرس،

**بەرز دەبێت لە حاڵەت بونی شێرپەنجە:**
١- هەندێک جۆری شێرپەنجەی پەنکریاس ٢- قۆلۆن و راگیر(مستقیم)
٣- گەدە ٤- جەرگ ٥- سیەکان
٦- سینگ ٧- رەحم ٨- هێلکەدان .
بەرێژەیەکی زۆر بەرز دەبینری لە کەسانەی کە شیرپەنجە پەنکریاسیان هەیە.
ئەگەر دوای چارەسەر هەر بەرز بوو واتە شێرپەنجەکە بە شیوەیەکی باش وەڵامی دەرمانەکان ناداتەوە یان هەربەردەوامە لە گەشە دەگەریتەوە.

**کەی ئەم پشکنینە دەکرێ :**
کاتێک کە دکتۆر دەستنیشانی کردوە بە شێرپەنجەی پەنکریاس یان نیشانەکانی لێ بەدی دەکرێ کە شێرپەنجەی پەنکریاسی هەیە.
نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە :
١- ئازاری سک وپشت ٢- رشانەوە ٣- ئارەزو نەکردنی خواردن ٤- کەم بونی کێش بە بێ هۆکار
٥- ئارەقە کردن لە هەندێ حاڵەتدا ناتوانرێ رێگری لەسەر گلوکزە بکرێ لە خوێن.
ئەو شێرپەنجە دروست دەبێت لە شانەکان کە ئەنزیم دەردەدەن بۆ هەرس کردنی خۆراک لە دەزگای کە ئەنزیمەکان هەڵدەگرێ لە ریخۆڵە نزیکەی ٩٥٪ی شێرپەنجەی پەنکریاس ئەم جۆرەیە.
- لە سەرەتا بەرزە پاشان کەم دەبێتەوە بە ورگرتنی دەرمان و لادانی شێرپەنجەکە بە سەرکەوتوی بە نەشتەرگەری بەڵام ئەگەر هەر بەرز بوو ئەوا واتا دەرمانەکەی کە دراوەتە پێ ی کارناکات لەسەر شێرپەنجەکە یان دووبارە دەبێتەوە شێرپەنجەکە.

# Factor Disease
# نەخۆشی کارتێکەری خوێن مەیین

## Factor Test

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ ئەوەی بزانرێ ئاستی یەکێک یان زیاتر لەو فاکتەرانە کەمە یان زیادە لە کاری میینی خوێندا، فاکتەری مەیینی خوێن پرۆتینن کە هەیە لە خوێنکە بەگرنگ دادەنرێ لەکاری مەیینی خوێن، پێویستە هەر یەک لە فاکتەرەکان بە برێکی دیاری کراو هەبن بۆ ئەوەی پرۆسەی مەین بە باشی رووبدات بەڵام ئاستیان بەشێوەی جیاوازە. فاکتەری مەیینی خوێنن کە بریتین لە کۆمەڵە فاکتەر ئەوانیش
factor II-factor V Leiden-factor VII-factor VIII-factor IX –factor) (X-factor XI-factor XII

ئەگەر لە یەکێک لەو فاکتەرانە کەم بوون ئەوا ئەمانەی خوارەوە روودەدات

١- خوێن مەیین لە ناو دەمارەکان روودەدات

٢- نەخۆشی جەرگ

٣- هەندێ جۆری شێرپەنجە

٤- ژەهراوی بون بە پێوەدانی مار

٥- کەمی لە VT K

٦- وەرگرتنی چارەسەری وارفەرین

٧- گواستنەوەی برێکی زۆر خوێن بۆ نموونە گواستنەوەی خرۆکە سورەکان

٨- ناریکی لە A,B هیموفیلیا فاکتەری بۆ ماوەی کە بەستراوە بە فاکتەری ٨- ٩

٩ -ئەوانەی کە فاکتەریان کەمە چەند نیشانەکیان لێ بەدەردەکەوی کە یەکێک لەوان کەمبونی PTT-PT

١٠- ئەوانەی کە کەمبونێکی زۆریان هەبێ لە فاکتەرەکان کە تێدا خوێن بەربون هەر لە زووەوە توشیان دەبێت وەک خوێن بەربونی کوران لەکاتی سونەت کردنیان بەهۆی کەمی
(factor VIII-factor IX – factor XIII)

وە ئاستی ئەم پشکنینە بەرز دەبێ بەهۆی ئەمانەی خوارەوە

١- لەکاتی بوونی ئلتهابێکی زۆر

٢- نەخۆشی گران

٣- هەندێک مرۆڤ (factor VIII) بە بەردەوام بەرز دەبێت لێیان کە وادەکات جەڵتەی دەماری روویدات.

## چ کاتێک پێویستە ئەم پشکنینە بکرێ:

١- کاتێک کە خوێن بەربونێکی بێ هۆ دروست دەبێبۆ ماوەیەکی درێژ

٢- بوونی نارێکی لە ئەنجامی pt-ptt

# Protein S Test

پشکنینی (Protein S) سوودی لێ وەردەگیرێت بۆ دەستنیشانکردنی ڕێژەی (Protein S) لە خوێندا، (Protein S) یەکێکە لە گرنگترین پرۆتینەکان کە بەشێوەیەکی سروشتی لەلایەن جگەرەوە دروست دەکرێت، وەک دژەمەیاندنێکی سرووشتی کاردەکات (Anticoagulant) و نایەڵێت خوێن بەشێوەیەکی ناتەندروست و ناڕێک لەناو لەشدا بمەیەت و هاوسەنگی کرداری مەیاندنی خوێن ڕادەگرێت، لەکاتی کەمبوونەوەی بڕی (Protein S) لە لەشدا دمێتە هۆی زیادبوونی مەترسی خوێن مەیین (تۆپەڵبوونی خوێن لەناو مللولە خوێندا) بەتایبەتی لە ئافرەتانی دووگیاندا.

پرۆتین ئێس پلازما پرۆتینێکی گرنگە بە دوو شێوە هەیە لە لەشدا (Bound) (Free)، لەش بۆ بەرهەم هێنانی ئەم پرۆتینە پشت بە (Vitamin K) دەبەستێت، پرۆتین ئێس (Protein S) بە یارمەتی پرۆتین سی (Protein C) کاردەکات و یەکدەگرن پێکەوە ڕێگری دەکەن لەهەر خوێن مەینێکی نائاسایی و کۆنترۆڵی چالاکیەکانی هەریەک لە فاکتەر پێنجی چالاککراو (Factors Va) و فاکتەر هەشتی چالاککراو (Factors VIIIa) دەکەن، لە سیستمی خوێن مەیندا و یارمەتیدەر دمێت لە ڕاگرتنی هاوسەنگی لە خوێن مەیندا، کەمی ڕێژەی پرۆتین ئێس (Proteins S) دمێتە هۆی سەرهەڵدانی چەندین گرفتی پەیوەست بە مەیاندنەوە (Excessive Clotting Disorder) و هەندێک جار مەیاندنی ناوەکی دروست دمێت و بەبێ بوونی برین و دمێتە مەترسی لەسەر ژیان.

پرۆتین ئێس (Protein S) بە دوو شێوە دەردەکەوێت لە خوێندا ()(Free Protein S) (Total Protein S)، بەڵام تەنها (Free Protein S) توانای یەکگرتنی هەیە لەگەڵ پرۆتین سی (Protein C) دا.

پێویستە هەردووک (Total Protein S)(Free Protein S) لە بڕ و فەرماندا ئاسایی بن.

دەکرێت بڕی (Total Protein S) ئاسایی بێت بەڵام بڕی (Free Protein S) کەم بێت.

دەکرێت هەردووکیان پێکەوە بڕو چالاکیان کەم بکات.

بەگشتی سێ جۆر نائاسایی بوون لە پرۆتین ئێس (Proteins S) دا ڕوودەدات:

جۆری یەکەم (Type I): کەمبوونی ڕێژەی پرۆتینەکە.

جۆری دووەم (Type II): ڕێژەی ئاسایی پرۆتینەکە بوونی هەیە بەڵام چالاکی پرۆتینەکە کەم دەکات.

جۆری سێهەم (Type III): ڕێژەی (Total Protein S) ئاساییە بەڵام ڕێژەی (Free Protein S) نائاسایی دەبێت.

هۆکار و مەترسیەکانی کەمی ئەم پشکنینە:-

هۆکاری کەمی پرۆتین ئێس (Proteins S) دەکرێت بۆماوەیی بێت (لە باوانەوە بۆ نەوەکان بگوازرێتەوە) و بەهۆی بوونی گۆڕانێکی بۆماوەیی (Mutations) لە جینی (gene PROS1) ڕوویدات کەدەکەوێتە سەر کرۆمۆسۆمی سێ (chromosome 3)، دەبێتە هۆی تێکچوونی (فەرمانی و بڕی) پرۆتینەکە.

هەندێک جار کەمی پرۆتین ئێس (Proteins S) هیچ مەترسیەکی تەندروستی دروست ناکات، بەڵام دەکرێت چەندین گرفتی تەندروستی بەدوای خۆیدا بێنێت وەک:

کاتێک بڕی (Proteins S) زۆر کەم بێت ڕاستەوخۆ دوای لەدایک بوون دەکرێت ببێتە هۆی (DIC) (Disseminated Intravascular Coagulation) (Purpura Fulminans) لە منداڵی ساوادا، هەندێک جاریش دەکرێت تا هەرزەکاری هیچ نیشانەیەکی دەرنەکەوێت.

لەوکەسانەی کە بڕی پرۆتینەکە مامناوەندە دەکرێت هیچ گرفتێکی تەندروستی دروست نەکات تا ئەوکاتەی بەهەر هۆکارێک بڕەکەی کەمتردەبێت لە بڕی پێویست، دەبێتە هۆی:

تۆپەڵبوون و مەیینی خوێن لە لە نێو مللولەکانی خوێندا (بە تایبەت لە مللولەکانی ژێرپێست دا) (Deep Vein Thrombosis) نیشانەکانی: (ئازار و نەرم بوون و ئاوسانی دەست و قاچ، شینبوونەوەی بێ هۆکاری پێست ).

گیرانی بۆری خوێنی سیپەکان (Pulmonary Embolism) نەگەیشتنی خوێن بە سیپەکان نیشانەکانی: (هەناسەبڕکێ و هەناسە توندی، ئازاری سنگ لەکاتی

هەناسە داندا، دڵ پەلەپەل کردن و لێدانی دڵی نارێک، بورانەوە و لە هۆش چوون و کۆکەی خوێناوی .

١- دروست بوونی گرفت لەکاتی سکپڕیدا (بەهۆی تۆپەڵ بوونی خوێنەوە .

٢- خوێن بەربوونی نائاسایی (کە دەبێتە هۆی شینبوونەوە) لە بەشە جیاوازەکانی لەشدا.

٣- مەترسی لەسەر ژیان بەهۆی وارفارینەوە (Warfarin).

٤- گیرانی مللولە باریکەکانی مێشک بەهۆی خوێنی تۆپەڵ بووەوە.

مانایی پشکنینەکە چی دەگەیەنێت:

بەگشتی پشکنینی بۆ ڕێژەی پرۆتینەکە دەکرێت:

١- ڕێژەی ئاسایی پرۆتینەکە نیشانەیە بۆ ڕێک و پێکی سیستەمی مەیاندنی خوێن (ئەگەر بەشەکانی تری سیستەمەکە گرفتی نەبێت).

٢- کەمی ڕێژەی پرۆتینەکە مانایی بوونی گرفتە لە سیستەمی مەیاندن و کۆنترۆڵ کردنیدا (دەبێتە هۆی زیادبوونی مەترسیەکانی مەیاندنی خوێن و گیرانی مللولەکانی خوێن ).

- بەرزبونی ڕێژەی پرۆتینەکە بەگشتی گرفتێکی تەندروستی مەترسیدار دروست ناکات.

بابەتی پەیوەندیدار:

پشکنینە پەیوندیدارەکان:

.((Protein C, Antithrombin III, Factor V, Fibrinogen, PT & PTT (INR)

# Test Protein C

ئەم پشکنینە سوودی لێ وەردەگیرێت بۆ دەستنیشانکردنی ڕێژەی (Protein C) لە خوێندا، (Protein C) یەکێکە لە گرنگترین پرۆتینەکان کە بەشێوەیەکی سروشتی لەلایەن جگەرەوە دروست دەکرێت، وەک دژەمەیاندنێکی سرووشتی کاردەکات (Anticoagulant) و نایەڵێت خوێن بەشێوەیەکی ناتەندروست و نارێک لەناو لەشدا بمەیەت و هاوسەنگی کرداری مەیاندنی خوێن ڕادەگرێت، لەکاتی کەمبوونەوەی بڕی (Protein C) لە لەشدا دەبێتە هۆی زیادبوونی مەترسی خوێن مەیین (تۆپەڵبوونی خوێن لەناو مللولە خوێندا) بەتایبەتی لە ئافرەتانی دووگیاندا.

(Protein C) پلازما پرۆتینێکی گرنگە کە بەشێوەیەکی سروشتی لە لەشدا لەلایەن جگەرەوە دروست دەکرێت، لەش بۆ بەرهەم هێنانی ئەم پرۆتینە پشت بە (Vitamin K) دەبەستێت، پرۆتین سی (Protein C) بە یارمەتی پرۆتین ئێس (Protein S) کاردەکات و پێکەوە ڕێگری دەکەن لەهەر خوێن مەینێکی نائاسایی و کۆنترۆڵی چالاکیەکانی هەریەک لە فاکتەر پێنجی چالاککراو (Factors Va) و فاکتەر هەشتی چالاککراو (Factors VIIIa) دەکەن، لە سیستمی خوێن مەیندا و یارمەتیدەر دەبێت لە ڕاگرتنی هاوسەنگی لە خوێن مەیندا .

بەشێوەیەکی ئاسایی لەکاتی برینداربوونی مللولەکانی خوێن، پرۆسەیەکی سروشتی لەلەشدا چالاک دەبێت (Hemostasis)بۆ سارێژبوون و وەستاندنی خوێنبەربوون، خەپلەکانی خوێن (Platelets) بە هاوکاری پرۆتینەکانی بەرپرس لە مەیاندن (Coagulation Factors) کە یەک بەدوای یەک چالاک دەبن بۆ سارێژبوونی برینداریەکە. پرۆتین سی (Proteins C) بە هاوکاری پرۆتین

ئێس (Protein S) پاش سارێژبوونی برینەکە کۆنترۆڵی مەیاندنەکە دەکەن بە بەرِاگرتنی هەریەک لە فاکتەر پێنج و فاکتەر هەشتی چالاککراو (Factors Va & VIIIa).کەمی رێژەی پرۆتین سی (Proteins C) دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی چەندین گرفتی پەیوەست بە مەیاندنەوە (Excessive Clotting Disorder) و هەندێک جار مەیاندنی ناوەکی دروست دەبێت و بەبێ بوونی برین و دەبێتە مەترسی لەسەر ژیان.

بەگشتی دوو جۆر ناتاسایی بوون لە (Proteins C) دا ڕوودەدات:

جۆری یەکەم (Type I): کەمبوونی رێژەی پرۆتینەکە.

جۆری دووەم (Type II): رێژەی ئاسایی پرۆتینەکە بوونی هەیە بەڵام چالاکی پرۆتینەکە کەم دەکات و توانایی چوونە نێو سیستمی مەیاندنی نامێنێت. (لە جۆری یەکەم کەمترە ).

هۆکار و مەترسیەکانی کەمی پرۆتین سی (Proteins C):

هۆکاری کەمی پرۆتین سی (Proteins C) دەکرێت بۆماوەیی بێت (لە باوانەوە بۆ نەوەکان بگوازرێتەوە) و بەهۆی بوونی گۆڕانێکی بۆماوەیی (Mutations) لە جینی (PROC gene) ڕوویدات کە دەبێتە هۆی تێکچوونی (فەرمانی و بڕی) پرۆتینەکە. یان بەهۆی یەکێک لەم هۆکارانەوە ڕەنگە بڕی پرۆتینەکە کەم بکات.

١- وەرگرتنی دەرمانی تایبەت بە خوێن (ڕوونکردنەوە) (Anticoagulant Therapy) وەک (Warfarin).

٢- بوونی نەخۆشی جگەر و گورچیلە و لەکارکەوتنیان.

٣- کەمی ڤیتامین کەی (Vitamin K).

٤- بڕیین و لێکردنەوەی بەشێك لە ڕیخۆڵەباریکە.

٥- بەکارهێنانی زۆری ئەنتی بایۆتیک (Antibiotics).

٦- خانەی شێرپەنجەیی و بەکارهێنانی هەندێک چارسەری کیمیایی.
٧- هەوکردن (Sepsis).
٨- ڕوودانی مەیاندنێکی زۆر لە بەشێکی لەشدا (دەکرێت بەهۆی بریندار بوون یان نەشتەرگەریەوە بێت).
٩- بوونی ڤایرۆسی ئایدز (HIV).
١٠- لەکاتی سکپڕیدا.
١١- هەندێک جار بارودۆخەکان کاتین و پاش ئاسایی بوونەوەی بارودۆخی کەسەکە بڕی پرۆتینەکە ئاسایی دەبێتەوە.

**مەترسیەکانی کەمی ئەم پشکنینە:-**

هەندێک جار کەمی پرۆتین سی (Proteins C) هیچ مەترسیەکی تەندروستی دروست ناکات، بەڵام دەکرێت چەندین گرفتی تەندروستی بەدوای خۆیدا بێنێت وەک:

١- کاتێک بڕی (Proteins C) زۆر کەم بێت ڕاستەوخۆ دوای لەدایک بوون دەکرێت ببێتە هۆی (Disseminated Intravascular Purpura Fulminans) (DIC) (Coagulation) لە منداڵی ساوادا، هەندێک جاریش دەکرێت تا هەرزەکاری هیچ نیشانەیەکی دەرنەکەوێت.

٢- لەوکەسانەی کە بڕی پرۆتینەکە مامناوەندە دەکرێت هیچ گرفتێکی تەندروستی دروست نەکات تا ئەوکاتەی بەهەر هۆکارێک بڕەکەی کەمتردەبێت لە بڕی پێویست، دەبێتە هۆی:

٣- تۆپەڵبوون و مەینی خوێن لە لە نێو مللولەکانی خوێندا (بە تایبەت لە مللولەکانی ژێرپێست دا) (Deep Vein Thrombosis) نیشانەکانی: (ئازار و نەرم بوون و ئاوسانی دەست و قاچ، شینبوونەوەی بێ هۆکاری پێست ).

٣- گیرانی بۆری خوێنی سیپەکان (Pulmonary Embolism) نەگەیشتنی

خوێن بە سییەکان نیشانەکانی: ( هەناسەبڕکێ و هەناسە توندی، ئازاری سنگ لەکاتی هەناسە داندا، دڵ پەلەپەل کردن و لێدانی دڵی ناڕێک، بورانەوە و لە هۆش چوون و کۆکەی خوێناوی )

٤- دروست بوونی گرفت لەکاتی سکپڕیدا (بەهۆی تۆپەڵ بوونی خوێنەوە)

٥- خوێن بەربوونی نائاسایی (کە دەبێتە هۆی شینبوونەوە) لە بەشە جیاوازەکانی لەشدا.

٦- مەترسی لەسەر ژیان بەهۆی وارفارینەوە (Warfarin).

٧- گیرانی مللولە باریکەکانی مێشک بەهۆی خوێنی تۆپەڵ بووەوە.

مانایی ئەم پشکنینە چی دەگەیەنێت:

١- ڕێژەی ئاسایی پرۆتینەکە نیشانەیە بۆ ڕێک و پێکی سیستمی مەیاندنی خوێن (ئەگەر بەشەکانی تری سیستمەکە گرفتی نەبێت )

٢- کەمی ڕێژەی پرۆتینەکە مانایی بوونی گرفتە لە سیستمی مەیاندن و کۆنترۆڵ کردنیدا (دەبێتە هۆی زیادبوونی مەترسیەکانی مەیاندنی خوێن و گیرانی مللولەکانی خوێن )

٣- بەرزبونی ڕێژەی پرۆتینەکە بەگشتی گرفتێکی تەندروستی مەترسیدار دروست ناکات.

# Fibronogen Test

پرۆتینی فایبرۆنۆجین دەورێکی گرنگی هەیە لەخوێن مەیین لەکاتی بریندار بون یان خوێن بەربون بەرهەم دێت لە جەرگ دا بە فاکتەرێکی کارتێکەری دادەنرێ لە خوێن مەیندا کە پێ ی دەوترێ (factor) لەکاتی خوێن مەین فایبرۆنۆجین دەگۆرێ بۆ فایبرین بەهۆی (thrombin)، ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی مەیینی خوێن وە هەندێ جار بۆ یارمەتی دانی زانینی توش بونی بە نەخۆشی دڵ و دەمارەکان .

کەی ئەم پشکنینە دەکرێ

١- خوێن بەربونێکی بێ هۆ هەبێ یان بەردەوام

٢- خوێن مەیین هەبێ

٣- ptt-pt ئەنجامێکی نا ئاسای هەبێ

٤- شیبونەوەی خوێنی هەبێ یان چارەسەری وەرگرێ

٥- بۆ دەستنیشانکردنی نەخۆشی بۆ ماوەی (homozygous and heterozygous)

٦- لە حاڵەتی دروست بونی فایبرۆنۆجین

٧- دیاری کردنی مەینی خوێن لە دەمارەکان

٨- بۆ وەڵام دانەوەی چارەسەری خوێن مەین

نایترۆجین:کارتێکەرێکی مینی یەکەم پرۆتینێکی گەرمی دیاری کراو (ثابت)ە لەجەرگ بەرهەم دێت

هۆکارەکانی بەرزبونی ئەم پشکنینە

١- ئلتهابی مفاسل رۆماتیزم

٢- تای دەریای سپی ناوەند

٣- نەخۆشی دەوری (periodic disease)

٤- ئلتهابی جەرگ

٥- نەخۆشی قورس

٦- خوێن مەین

هۆکارەکانی کەمی ئەم پشکنینە

١- لەبارچونی کۆرپەلە

٢- کەمخوێنی

٣- سوتانی ترسناک

٤- شێرپەنجە

٥- بە مۆم بونی جەرگ

٦- مەینی خوێن لەناو دەمارەکان

٧- کەمی خرۆکە سورەکان

٨- گرێی نقودی (multiple myloma)

٩- شۆک بوون

١٠- بە جرثوم بوونی خوێن للەلایەن جراثیمەکان

١١- پێوەدانی مار

١٢- کاردانەوەی خوێن گواستنەوە

ئەو دەرمانانەی کە وا دەکەن ئەنجامەکە کەم بێت

١- اسبارجیناز ٢- بریدوبریل ٣- ژەهراوی بون بە (Phenobarbital)

٤- الستروتبوکیناز ٥- یورەکیناز

**تێبینی-** لەوانەیە ئاستی فایبرۆنۆجین زیاتر بێت لەبری پێویست لە کۆتا سێ مانگی دووگیانی، ئەو دەرمانانەی کە نایەڵن ئەنجامەکە راست دەرچێ

Heparin –warfarin

# Polymerase chain reaction
# پشکنینی (PCR)

سەرەتا کورتە باسێکی ئەم پشکنینە دەکەین کە تێدا بە چ ئامێرێک دەکری گرنگترین کارەکانی وە بۆ چ نەخۆشیەک دەکرێ وە چەند پشکنینیشی پێ دەکرێ سەرەتا ئەم پشکنینە لە بەشی (molecular) کە بەرێگای (Real Time PCR)ئەنجام دەدرێ کە بە وردترین ئامێر دادەنرێ بۆ زانینی دەستنیشانکردنی ڤایرۆس و بەکتریاکان.

**گرنگترین کارەکانی PCR:**

١- بۆ دیاری کردنی ناسنامەی باوکایەتی

٢- بۆ دیاری کردنی جیناتی

٣-کۆپی بونی جیناتیەکان(جیناتی بۆماوەی)وە دیاری کردن و دەست نیشانکردنی چەندین جۆری شێرپەنجە وە نەخۆشیە درێژ خایەنەکان بە تایبەت لە پشکنینەکانی (HPV,HSV,HIV,HCV,HBV)

بۆ دیاری کردنیان بەڵام پێویستی بە دوو یان چوار هەفتە هەیە تەواوبونی پشکنینەکە.

**ئەم پشکنینانە بە شێوەکی گشتی بۆچی بەکاردێت:-**

١- بۆ زانینی طفرت(واتا هەر گۆرانکاریەک لە جیناتی روویدات) ئەمەش بە دانانی ئامێرێکی تایبەت بە طفرت بۆ زانینی جیناتی تایبەت بەخۆی بەو رێگایە دەزانین ئایە نەخۆشیەکە لەسەرجووت کرۆمۆسۆمیە یان تاک کرۆمۆسۆمە

٢- بۆ زانینی بسمەی بۆماوەی

٣- بۆ زانینی ڤایرۆسات بە رێگایەکی ورد بۆ دیاریکردنی جۆری ڤایرۆسەکە و چەندیەتی
٣- بۆ زانینی رێژەیDNA
٤- بۆ دیاری کردنی کرۆمۆسۆمی داواکراو لە تێکەڵی جینیەکان
٥- بۆ کاری Microarrays
٦- بۆ زانینی بە پەلە بەستنەوەی ترشی DNA و پرۆتینی DNA
٨- بەکاردی بۆ گۆڕانی جیناتەکان بۆ ئەوەی گونجاو بێ لەگەڵ ئەنزیمەکان
وە چەندان کاری تر........هتد

## لەبەشی PCR تێدا ئەم پشکنینانەی پێدەکری کە بریتین :

١- Molecular Virology

(HBV-HCV-CMV-BK-EBV)

Quantitative and quanlitative Detection by Real time PCR

٢- Molecular Bacteriology

(MTBC Test)

Quantitative and quanlitative Detection by Real time PCR

٣- Molecular hematology

(JAK2-BCR-ABL)

Quantitative and quanlitative Detection by Real time PCR

(FV Leiden-FVR2-FVCambridge-MTHFR677-MTHFR1298-FMF)

by Real time PCR

٤- Immuno Genetic

(HLA B27-HLA B5-HLA B51-HLA B52- HLA DQ2,8)

Antigen detection by Real time PCR

# Test BCR-ABL1 Fusion gene

# Philadelphia Chromosome

# پشکنینی فیلادلفیا کرۆمۆسۆم

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ دەستنیشانکردنی خانەی شێرپەنجەیەکانی خوێن بەتایبەت (Chronic Myelogenous Leukemia (CML)

کرۆمۆسۆمێکی ناتاسایی و ناتەواو و کورتە، دروست دەبێت لە ئەنجامی گواستنەوەی جین (Reciprocal Translocation) لەنێوان کرۆمۆسۆمی ژمارە ٩ لەگەڵ کرۆمۆسۆمی ژمارە ٢٢، کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدان و زیادبوونی خانە شێرپەنجەییەکانی خوێن بەتایبەت

(Chronic Myelogenous Leukemia)(CML)

کەواتە (BCR-ABL1) پێکدێت لە ئەنجامی گواستنەوەی بەشی (ABL1) ی کرۆمۆسومی ٩ لەگەڵ بەشی (BCR) کرۆمۆسۆمی ٢٢، لەئەنجامدا هەردوو کرۆمۆسۆمی ناتاسایی (Philadelphia Chromosome) دروست دەبێت.

لە ئەنجامی کاریگەری جینی (BCR-ABL1) پرۆتینێکی ناتاسای بەرهەم دێت لە لەشدا، کە بریتیە لە ئەنزیمی (Tyrosine Kinase)، ئەم ئەنزیمە دەبێت هۆی گەشەکردنی کۆنترۆڵ نەکراوی خانە شێرپەنجەییەکانی خوێن، کاتێک ژمارەیەکی زۆر لە خانەی ناتاسایی شێرپەنجەیی دەست دەکەن بە زیادبوون لە نێو خانە تاساییەکانی خوێن(Precursors) لە مۆخی ئێسکدا نیشانەکانی شێرپەنجە دەست بە دەرکەوتن دەکەن، چارەسەری سەرەکی ئەم خانە شێرپەنجەییانە (Tyrosine Kinase Inhibitor)(TKI)ـە.

**دەستنیشانکردنی ئەم نەخۆشیە پشت دەبەستێت بە چەند پشکنینیک ئەمانەن:-**

١- پشکنینی (CBP)بۆ دیاریکردنی ژمارە و شێوە و قەبارە و بارودۆخی خرۆکەکانی

خوێن (کە لەم بارەدا زۆرێک لە خرۆکە سپیەکانی خوێن کامڵ نەبوون ).
٢- پشکنینی بۆماوەیی بۆ جینی (BCR-ABL1).
٣- پشکنینی مۆخی ئێسک.
٤- زیادبوونی یوریک ئەسید لە خوێندا (Serum Uric Acid).

**چەند ڕێگایەکی شیکاری کردنی جینی (BCR-ABL1) هەیە:-**

١- پشکنینی (Cytogenetics (Chromosome Analysis or Karyotyping) .
٢- پشکنینی (Fluorescence in Situ Hybridization (FISH) .
٣- پشکنینی (Genetic Molecular Testing (Qualitative or Quantitative)
٤- پشکنینی (Polymerase Chain Reaction (RT-PCR)
٥- پشکنینی (Polymerase Chain Reaction (PCR) دروستترینیانە بۆ دەستنیشانکردی جینی (BCR-ABL1) لە لەشدا و پشتی پێدەبەسترێت بۆ دەستنیشانکردنی (CML) و چاودێریکردنی چارەسەری.

**کاتێک ئەم پشکنینە ئەنجام دەدرێت:-**

**لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی:**

هەردوو ڕەگەز (نێر و مێ) تووش دەبن بەتایبەت لە تەمەنی نێوان ٤٠-٦٠ساڵی دا.
١- ماندوێتی و شەکەتی.
٢- دابەزینی کتوپڕی کێش.
٣- ئارەقکردنەوە بەتایبەت لە شەواندا.
٤- گەورەبوونی سپڵ.
٥- کەم خوێنی.

**تێبینی-** نزیکەی ٥٠٪ نەخۆشەکان هیچ نیشانەیەکیان نییە (Asymptomatic) تەنها لەکاتی ئەنجامدانی پشکنینی (CBP) ی خوێن دەردەکەوێت.

# JAK2 v617f Mutation Test

ئەم پشکنینە یارمەتیمان دەدات بۆ دەستنیشانکردنی نارێکی لە کاری مۆخی ئێسک دا((MPNs)Myeloproliferative Neo-plasms) بۆ جیاکردنەوەی لە هۆکارە لابەلا ناجیناتەکان (کاتی یان درێژخایەن)، کەبۆتەهۆی زیادکردنی خانە جۆر بە جۆرەکانی خوێن (خرۆکەی سوری خوێن و جۆرەکانی خرۆکەی سپی خوێن و خەپلەکانی خوێن

جینی (The Janus Kinase 2) کە بە (JAK2 ) ناسراوە فەرمان بە دروست کردنی پرۆتینی (JAK2 Protein) دەکات، ئەم پرۆتینەش هانی گەشەکردن و دابەشبوون و تایبەتمەند بوون و کۆنترۆڵکردنی بڕی بەرهەم هێنانی خانەکانی خوێن دەدات کە لەلایەن مۆخەوە دروست دەکرێن. هەرگۆڕانێک لەم جینەدا(JAK2) ڕوبدات کاریگەری دەبێت لەسەر کار و چالاکی مۆخی ئێسک.

**تێکچوونەکانی جینی** (JAK2 Mutations)**:**

بەشێک لە گرفتەکانی مۆخی ئێسک پەیوەندیدارە بە تێکچوونی جینی (JAK2 ) و بە Myeloproliferative Neoplasms ناسراوە کە لەم بارەدا مۆخ بڕێکی زۆر خرۆکەی سور و سپی و خەپلەکانی خوێن دروست دەکات کە زیادە لە بڕی پێویست، تەنها بە گۆڕینی یەک جوت نیکلۆتاید (Base Pair) جۆرێک لە (Point Mutation) ڕوودەدات، بە جێگرتنەوەی ئەمینۆ ئەسیدی (Valine) بە (Phenylal-anine)، ئەنجامەکەی گۆڕان لە پرۆتینی (JAK2 Protein) دروست دەبێت کە وادەکات بەردەوام هانی مۆخ بدات بۆ دروستکردنی خانەکانی خوێن.

**بەشێک لە (MPNs) باوەکان کە پەیوەندیدارن بە تێکچونی (JAK2):**

١- مۆخی ئێسک ڕێژمیەکی زۆر خرۆکەی سور بەرهەم دێنێت (Polycy-themiaVera(PV)), (JAK2 gen Mutation Positive ~95%).

٢- بەرهەم هێنانی ڕێژمیەکی زۆر لە خەپلەکانی خوێن لەلایەن مۆخی ئێسکەوە Essential Thrombocythemia (ET)),(JAK2 gen Mutation) (Positive ~50%

٣- مۆخی ئێسک ڕێژمیەکی زۆر لە خەپلەکانی خوێن و ئەو خانانەی بەرپرسی سارێژ بوونن بەرهەم دێنێت 50% PMF),(JAK2 gen Mutation) Positive .

ئەنجامی پشکنینەکە پێویستە لەلایەن پزیشکی پسپۆڕی نەخۆشییەکانی خوێن و مۆخی ئێسک هەڵسەنگاندن و بەراوردکاری وردی بۆ بکرێت لەگەڵ ئەمانەی خوارەوە تاوەکو پێکەوە ئەنجامەکە تەواوبێت:

١- وەرگرتنی مێژووی نەخۆشی یەکە بە وردی (Medical History, Surgi-cal History, Family History, Drug History, ....)

٢- وەرگرتنی نیشانەی نەخۆشی یەکە (Clinical Data).

٣- پشکنینی گشتی خوێن (CBP, Blood Film Examination, ESR, CRP).

٤- سۆنەری سکی نەخۆشەکە.

٥- پشکنینی مۆخی ئێسک (Bone Marrow Aspiration & Biopsy) لەوانەیە پێویست بکات.

٦- خاڵەکانی سەرەوە پێویستە پێکەوە بەراورد و شیکاریی وردی بۆ بکرێت لەگەڵ ئەنجامی پشکنینی (JAK2) لەلایەن پزیشکی پسپۆڕی نەخۆشییەکانی خوێن و مۆخی ئێسک بۆ نوسینی ڕاپۆرتەکە.

**نیشانەکانی (MPNs):**

هەندێک کات دەکرێت کەسەکە هیچ نیشانەیەکی نەبێت، لە سەرەتادا بەڵام بە تێپەڕبوونی کات نیشانەکانی تەشەنە دەسەنن.

١- گەورەبوونی سپڵ (Splenomegaly) یان جگەر (Hepatomegaly).

٢- زوو ماندوبون.

٣- نەمانی نارەزووی خواردن.

٤- ئازاری جومگەکان.

٥- سەر ئێشە و سەرگێژخواردن.

٦- خوێن بەربوون.

٧- گرفتی بینایی.

٨- لاوازبوونی هەست.

٩- خورانی پێست.

١٠- بەردی گورچیلە.

١١- تۆپەڵبوونی خوێن لە بۆریەکانی خوێندا.

١٢- دابەزینی کتوپڕی کێش.

١٣- تالێهاتن

١٤- چەندین نیشانەی تری نەخۆشیەکە بەگوێرەی جۆری نەخۆشی یەکە.



# BK Test

ئەم ڤایرۆسی لەخێزانی (Polyomavirus) و بۆماوەماددەکەی پێکهاتووە لە دوو شریتی دی ئێن ئەی (Double-Stranded DNA)، دابەش دەبێت بەسەر شەش گروپدا، زۆر کەس لە قۆناغی منداڵیدا دەکرێت دووچاری ئەم ڤایرۆسە ببن بەڵام بەدەگمەن دەبێتە هۆی نەخۆشی و نیشانەی قورس، بەشێوەیەکی گشتی چەند نیشانەیەکی هاوشێوەی هەڵامەت بە سووکی لە کەسەکەدا دەردەکەوێت، کاتێک ڤایرۆسی (BK) دەچێتە ناو خوێن دەبێت و بڵاودەبێتەوە بەلەشدا بێئەوەی کاریگەریەکی توندی لەسەر تەندروستی کەسەکە هەبێت، پاش تەواوکردنی چالاکیە سەرەتاییەکانی ڤایرۆسەکە لەنێو خانەکانی ڕێڕەوی میزی کەسەکەدا دەمێنێتەوە بەشێوەیەکی شاراوە (La-tent)، بێ ئەوەی کێشەی تەندروستی دروست بکات کەزۆرکەسدا، بەڵام کاتێک سیستەمی بەرگری لەش بەباشی کار ناکات یان لەکار دەخرێت (بەدەرمان) ڤایرۆسەکە چالاک دەبێتەوە.

**ئەوهۆکارانەی مەترسی ڤایرۆسەکە زیاد دەکەن:**

**١- تەمەن:** لەگەڵ هەڵکشانی تەمەن دا سیستمی بەرگری لەش بەرەو لاوازبوون دەچێت، لە کاتی هەبوونی ڤایرۆسەکەدا ڕەنگە دوای چوونە تەمەنەوە کێشەی تەندروستی دروست بکات.

**٢- ئەندام چاندن:** ئەوکەسانەی کە نەشتەرگەری چاندنی ئەندامیان بۆئەنجام دەدرێت، دەرمانی پێدەدرێت بۆ لاوازکردنی سیستمی بەرگری لەش. لە کاتی هەبوونی ڤایرۆسەکەدا کێشەی تەندروستی دروست دەکات.

**٣- لاوازی سیستمی بەرگری:** هەندێک نەخۆشی وەک ئایدز(AIDS)، شەکرە، سیستمی بەرگری لەش لاواز دەکەن، لە کاتی هەبوونی ڤایرۆسەکەدا کێشەی تەندروستی دروست دەکات.

**نەشتەرگەری چاندنی ئەندام و ڤایرۆسی (BK):**

بوونی ئەم ڤایرۆسە لەلەشدا ترسناک نیە و کەسەکە بێ دەرکەوتنی هیچ نیشانەیەک ژیانی ئاسایی خۆی بەسەر دەبات، بەڵام کاریگەری خراپی هەیە لەسەر ئەو کەسانەی کە نەشتەرگەری چاندنی ئەندامیان بۆ ئەنجام دەدرێت وەک (چاندنی گورچیلە و مۆخی ئێسک ..هتد) دوای چاندنی ئەندامەکە کەسەکە دەرمانی تایبەتی پێدەدرێت بۆ لاواز کردنی سیستمی بەرگری لەش (Immunosuppressive) تا وا لە لەش بکات ئەندامەکە قبوڵ بکات، بەمەش لەش دەکەوێتە بەر مەترسی توشبوون بە نەخۆشیە جۆراو جۆرەکان لەنێویشیاندا ڤایرۆسی (BK)، ڤایرۆسەکە دووبارە چالاک دەبێتەوە بەهۆی کاریگەری دەرمانەکانەوە، وا لە لەش دەکات ئەندامەکە رەت بکاتەوە، بۆیە پێویستە پێش و پاش چاندنی هەرئەندامێکی لەش پشکنینی بۆ ڤایرۆسی (BK) ئەنجام بدرێت.

**نیشانەکانی ئەم ڤایرۆسە:-**

**دەکرێت هیچ نیشانەیەکی نەبێت لە سەرەتادا، بەڵام بە لاوازبوونی سیستمی بەرگری نیشانەکانی تەشەنە دەکەن لەوانە:**

١- گرفتی بینایی و لێڵ بوونی بینین.
٢- گۆڕانی ڕەنگی میز بۆ قاوەی سورباو.
٣- بوونی ئازار لەکاتی میزکردندا.
٤- بەناڕەحەت میزکردن.
٥- زووزوو میزکردن (میزە چورکێ )
٦- کۆکە و هەڵامەت و هەناسە توندی.
٧- تا و ئازار و بێ هێزی ماسولکەکان.
٨- دڵەکوتێ.
٩- هەندێ جار گرفتی مێشک و جگەر دروست دەکات.

**تێبینی-** گواستنەوی ڤایرۆسەکە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەبێت، بەڵام تا ئێستاش چۆنیەتی گواستنەوەکەی بە تەواوی ڕوون نییە بەڵام دەکرێت لە ڕێگەی یەکێک لەمانەوە بگوازرێتەوە.
(لیک، تەڕی ناولووت و قوڕگ (چڵم و بەڵغەم)، کۆکە، میز، دایک دەیگوازێتەوە بۆ کۆرپەکەی ناو سکی.)
چەند پشکنینێک پێویستە ئەنجام بدرێت بۆ دەستنیشانکردنی ڤایرۆسی (BK)، بەتایبەت لە کەسانەدا کە نەشتەرگەری چاندنی ئەندامیان بۆ ئەنجام دەدرێت تا دڵنیابینەوە لەوەی کە ئەندامە چێندراوەکە پارێزراو دەبێت، پشکنینەکانیش ئەمانەن:
١- شیکاری گشتی میز (Urinalysis).
٢- شیکاری بایۆپسی (Renal Biopsy) بۆ گۆرچیلە یان میزەڕۆ.
٣- شیکاری (PCR) کە لە هەمووی دڵنیاتر و هەستیارترە بۆ دەستنیشان کردنی گەشەسەندنی ڤایرۆسەکە.

# HPV Test

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی ئەو ڤایرۆسە، باوترین جۆری ڤایرۆسە کە لەڕێگای جووتبوونەوە بگوازرێتەوە (STI)، ئەم ڤایرۆسە چەند جۆرێکی جیاوازی هەیە کە دەبنە هۆی دروستبوونی بالوکە (Warts) لە چەند شوێنێکی جیاوازی لەشدا، هەندێک جار (HPV) بێ ئەوەی هیچ مەترسی و برینێک دروست بکات ڕاستەوخۆ لەناودەچێت، بەڵام هەندێک جۆریان دەبێتە هۆی دروست کردنی کێشەی تەندروستی وەک دروست بوونی بالوکە لە ئەندامی زاو و زێ (Genital Warts) و ناو دەم و قاچ یان مەترسی دروست بوونی شێرپەنجە

## چۆنیەتی گواستنەوەی ڤایرۆسەکە:-

ڤایرۆسەکە دەگوازرێتەوە بە بەرکەوتنی ڕاستەوخۆی پێست-بە-پێست، زۆرکەس توشدەبن لە ڕێگای ئەنجامدانی جووتبون لەگەڵ کەسانی هەڵگری ڤایرۆسەکە، لە هەندێک حاڵەتی دەگمەندا دایکی توشبوو دەیگوازێتەوە بۆ منداڵەکەی لە کاتی منداڵبووندا.

جۆرەکانی ڤایرۆسەکە بە ژمارە پێناس کراون بەپێی (Genotype)کانیان، کە ٣٦ (Genotype)ی جیاوازن و دابەش دەکرێن بەسەر دوو گروپدا:

١- **کەم مەترسیەکان** (Low-risk HPV). کە (Genotype)کانیان بریتین لە (٨١,٦٧,٦٩,٧٠,٧١,٧٢,٨٩,٨٤/٥٥,٥٤,٦١,٦٢/٦,١١,٤٠,٤٢,٤٣,٤٤)

٢- **مەترسیدارەکان** (High-risk HPV). کە (Genotype)کانیان بریتین لە (١٦,١٨,٢٦,٣١,٣٣,٣٥,٣٩,٤٥,٥١,٥٢,٥٣,٥٦,٥٨,٥٩,٦٦,٦٨,٧٣,٨٢١).

زۆرێک جۆری ڤایرۆسەکە نابێتە هۆی شێرپەنجە بەڵام هەندێکیان دەبێتە هۆی شێرپەنجە لە بەشە جیاوازەکانی لەشدا ئەگەر زوو چارەسەر نەکرێت وەکو شێرپەنجەی ملی منداڵدان (Cervix) و کۆم و ئەندامانی زاو و زێ ی نێر و

مێ، شێرپەنجەی گەروو (Oropharyngeal). زیاتر لە (70%)ی شێرپەنجەی ملی منداڵدان (Cervical Cancer) بەهۆی (HPV16)(HPV18) یە...
ئەو جۆرانەی ڤایرۆسەکە کە دەبێتە هۆی دروست بوونی بالوکەی ئاسای جیاوازن لەوانەی دەبنە هۆی شێرپەنجە، بۆ دیاریکردنی پلەی مەترسی ڤایرۆسەکە پێویستی بە پشکنینی تاقیگەیی هەیە بۆ دیاریکردنی جینی ڤایرۆسەکە...
زۆر جار بەرگری لەش بەرنگاری ڤایرۆسەکە دەبێتەوە بەرلەوەی بالوکەکان دروست بکات.

**ئەو هۆکارانەی ئەگەری توشبوون بە ڤایرۆسەکە زیاد دەکەن:**

**٣- سێکس:** بوونی پەیوەندی سێکسی لەگەڵ کەسانی هەڵگری ڤایرۆسەکە.
**٤- تەمەن:** هەندێک جۆری ڤایرۆسەکان تووشی تەمەنێکی دیاریکراو دەبن.
**٥- لاوازی بەرگری لەش:** ئەوکەسانەی بەرگری لەشیان لاوازە ئەگەری توشبوونیان بە ڤایرۆسەکە زیاترە.
**٦- برینداری پێست:** بوونی برین و قڵیش لە (دەرەوە و ناوەوەی لەش) ئەگەری تووشبوون بە ڤایرۆسەکە زیاد دەکات.
**٧- بەرکەوتنی کەسانی توشبو و بەکارنەهێنانی دەستکێش لەکاتی دەست دان لە شوێنی برینەکان.**

**نیشانەکان و دەستنیشان کردنی ڤایرۆسەکە:**

زۆرجار ڤایرۆسەکە بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەک دروست بکات خۆی لەناودەچێت، بەڵام ئەگەر لەناونەچێت دەبێتە هۆی دروستکردنی بالوکە هەندێک جار دکتۆرەکەت دەتوانێت تەنها بە بینین دەستنیشانی بکات، بەڵام ئەگەر دیار نەبوون و لە ناوەوەی لەش بوون یان بۆ دیاریکردنی پلەی مەترسی ڤایرۆسەکە پێویست بە پشکنینی زیاتر دەکات.




## پشکنینی (DNA) ڤایرۆسەکە

بۆ ئەنجامدانی ئەم پشکنینە دکتۆرەکەت نمونەیەک لە بەشە تووشبووەکە وەردەگرێت لە ڕێگەی (نمونەیەک لە شلەی ناو لەشی ئافرەت یان شلەی (لینجی) ئەندامی نێرینەی پیاو یان بالوکەی دروستبووی دەوروبەری ئەندامی زاو و زێ یان ناودەم) و دەینێرێت بۆ تاقیگەی تایبەت بە شیکاری (Viral DNA) تا جۆری جینی ڤایرۆسەکە دیاری بکرێت، ئایا مەترسی دارە و ڕەنگە ببێتە هۆی شێرپەنجە یاخود نا !! چونکە ئەو شێرپەنجەیەی بەهۆی (HPV)یەوە دروست دەبن هیچ نیشانەیەکیان نییە تا قۆناغە کۆتاییەکانی گەشەکردنی شێرپەنجەکە، بۆیە پشکنینی (DNA) پێویستە تا پێشوەخت مەترسیەکانی ڤایرۆسەکە بزانرێت.



# HCV Genotyping Test

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی ڤایرۆسی جگەری جۆری (HCV)، یەکێک لە بڵاوترین ڤایرۆسەکان لە جیهاندا، نزیکەی ٪۳.۳ (دووسەد ملیۆن) لە دانیشتوانی جیهان هەڵگری ئەم ڤایرۆسەن، کە دەبێتە هۆی هەوکردنی جگەر و تێکدان و لەکارخستنی خانەکانی جگەر، هیچ ڤاکسینێک (Vaccine) بۆ ڤایرۆسی جگەری جۆری (HCV) تا ئێستا بەکارناهێنرێت.

لەکاتی سەردان کردنی کلینیکی پزیشکی ددان یان ئەنجامدانی نەشتەرگەری .. هتد، پێویست بە پشکنینی دژە تەن (Antibody) بۆ ڤایرۆسەکە ئەنجام دەدرێت، لەکاتی دەرچوونی ئەنجامی ئەرێنی بۆ ڤایرۆسی جگەری جۆری (HCV) پێویستە ڕاستەوخۆ پشکنینی ((HCV RNA (Quantitative بۆ ڤایرۆسەکە و پاشان پشکنینی جینۆتایپین (Genotyping) بۆ ڤایرۆسەکە ئەنجام بدرێت.

**پشکنینی جینۆتایپین** (Genotyping)**:**

ڤایرۆسی جگەری جۆری (HCV) دابەش دەبێت بەسەر چەند شێوە و چەشندا (کە زیاتر لە ٥٠ چەشنن و دابەش دەبن بەسەر ٦ جینۆتایپی سەرەکیدا کە لە ناوچەیەک بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازیان هەیە)

(.(1a, 1b, 2a, 3a, 3b and 6a )

شیکاریی جینۆتایپین (Genotyping) چەشنی ڤایرۆسەکە دیاریدەکات و جینۆتایپەکەیمان بۆ دەستنیشان دەکات، بۆ ئەوەی بتوانرێت چارەسەریەکی تەواو و دروست بدرێت بە نەخۆش پێویستە دەستنیشانی جینۆتایپی ڤایرۆسەکە بکرێت تا چارەسەرەکەی ووردتر بێت چونکە هەر چەشنێک لە ڤایرۆسەکە چارەسەریەکی دیاریکراوی خۆی هەیە.

کاتێک کەسێک ئەنجامی پشکنینی دژەتەنی بۆ ڤایرۆسی جگەری جۆری (HCV) ئەرێنی دەبێت، پێویستە ڕاستەوخۆ پشکنینی (HCV RNA (Quantitative))) بۆ ئەنجام بدرێت تا ڕێژەی دڵنیایی ڤایرۆسەکە لە لەشدا

دیاری بکرێت، دوای دەرچوونی ئەنجامەکانی و بەرلە وەرگرتنی چارسەری، پێویستە پشکنینی جینۆتایپین (Genotyping) بۆ ڤایرۆسەکە ئەنجام بدرێت.
تا ڕێژەی ڤایرۆسەکە لە لەشدا زیاتر بێت (پشکنینی جینۆتایپین (Genotyp-ing) ئەنجامەکەی دروستتر دەبێت)
(کە پێویستە HCV Viral Load >1000 IU/mL) ئەم ڕێژەیە دەکرێت گۆڕانی بەسەردابێت بە پشت بەستن بە جۆری (Kit)ی پشکنینەکە.

**هەنگاوەکانی دەستنیشان کردنی چارسەری:**

١- ئەنجامدانی شیکاریی دژەتەن(Antibody) بۆ ڤایرۆسی جگەری جۆری (HCV).

٢- بۆ هەموو ئەنجامێکی دژەتەنی ئەرێنی بۆ ڤایرۆسی جگەری جۆری (HCV)، پێویستە پشکنینی ((HCV RNA (Quantitative) بە ڕێگای ((Polymerase Chain Reaction (PCR) ئەنجام بدرێت (هەندێک جار پێویستە شیکاریەکانی فەرمانی جگەریش ئەنجام بدرێت بۆ دڵنیابوون لە سەلامەتی جگەر و کاریگەری ڤایرۆسەکە لەسەر جگەر ).

٣- پاش دیاریکردنی ڕێژەی ڤایرۆسەکە لە لەشدا پێویستە پشکنینی جینۆتایپین بۆ ڤایرۆسەکە ئەنجامبدرێت بۆ دیاریکردنی چارسەری دروست باشترین دەرمان بەپێ ی چەشنی ڤایرۆسەکە (بەتایبەت لەوکاتەی ڕێژەیەکەی بەرز بوو لەلەشدا ).



# HLA-B27 test
# Human Leukocyte Antigen B27

ئەم پشکنینە ئەنجام دەدرێت بۆ دیاری کردنی بوون و نەبوونی پرۆتینی جۆری (HLA-B27) لەسەر خرۆکە سپیەکان، پرۆتینێکە دەکەوێتە سەر ڕوکاری خرۆکە سپیەکانی لەش، پرۆتینی (HLA-B27) لە گروپی ئەو پرۆتینانەیە کە یارمەتی سیستمی بەرگری لەش دەدەن بۆ ناسینەوەی لەشە خانەکان و جیاکردنەوەی لەشەخانەکان لە خانە بێگانەکان بە لەش، بوونی پرۆتینی (HLA-B27) لەسەر خرۆکە سپیەکان وادەکات سیستمی بەرگری لەش هێرش بکاتە سەر خانە ساغ و تەندروستەکانی لەش، ئەمەش دەبێتە هۆی توشبوون بە
(Autoimmune Disease)کان کە پەیوەندیان بە پرۆتینی (HLA-B27) هەیە وەک (Juvenile Rheumatoid Arthritis)(Ankylosing Spondylitis).

ئەو (Autoimmune Disease) پەیوەندیان بە پرۆتینی (HLA-B27) هەیە زیاتر دوچاری پیاوان دەبێت، لە ئافرەتانیشدا هەیە بەڵام ڕێژەکەی کەمترە و نیشانەکانی سوکترە، زیاتر لە سەد نەخۆشی پەیوەندی دار هەن بە پرۆتینی (HLA-B27) وە، بە گشتی نیشانەی نەخۆشیەکەش لە دوای تەمەنی سیساڵی سەر هەڵدەدەن.

بوونی پرۆتینی (HLA-B27) لەسەر خرۆکە سپیەکان بەهۆی هۆکارێکی بۆماوەییەوە دەبێت کە لە باوانەوە بۆ نەوەکان دەگوازرێتەوە، ئەگەر ئەندامی خێزانێک (HLA-B27) ئەرێنی بوو وە نیشانەکانی نەخۆشیە پەیوەندی دارەکانی بە پرۆتینی (HLA-B27) تیا دەرکەوت ئەوا هەمان مەترسی لەسەر ئەندامانی تری خێزانەکەی زیاد دەکات.

## کەی پشکنینی پرۆتینی (HLA-B27) ئەنجام دەدرێت:

پشکنینی (HLA-B27) بۆ کەسێک ئەنجام دەدرێت کە نیشانەکانی تازە

تێدا دەردەکەون یان ماوەیەکی درێژە پێوەی دەناڵێنێت لەوانەش ئازار و هەوکردن لە فەقەرات و مل و سنگ و جومگەکان و چاو، بەمەش گومانی نەخۆشیە (Autoimmune Disease) کانی پەیوەندیدار بە پرۆتینی (HLA-B27) لێ دەکرێت.

**باوترین ئەو نەخۆشیانەی کە پەیوەندیدارن بە پرۆتینی - :**HLA-B27

بوونی پرۆتینی (HLA-B27) لەسەر خرۆکە سپیەکان دەبێتە هۆی دوچار بوون بە کۆمەڵێک نەخۆشیی (Autoimmune Disease) لەوانە:

**١- نەخۆشی ((Ankylosing Spondylitis (AS)):** نیشانەکانی بوونی ئازار و هەوکردن و وردە وردە ڕەقبوونی بڕبڕەی پشت و مل و سنگ، نەخۆشیکە لە قۆناغەکانی سەرەتادا بە (X-ray) دەرناکەوێت.

**٢- نەخۆشی (Reactive Arthritis):** نیشانە باوەکانی هەوکردنی جومگەکان و چاو و میزەڕۆ و زیان گەیاندن بە پێست.

**٣- نەخۆشی ((Juvenile Rheumatoid Arthritis(JRA)):** جۆرێکە لە هەوکردن و ئاوسانی جومگەکان لە منداڵدا.

**٤- نەخۆشی (Anterior Uveitis):** ئاوسان و خورانێکی وەڕسکەری چینی ناوەندی چاو.

٥- هەندێک جار (HLA-B27) پەیوەندی بە هەوکردنی درێژ خایەنی ڕیخۆڵەکانەوە هەیە.

**دەستنیشانکردن و شیکاریە پەیوەندیدارەکان بە (HLA-B27):**

**لەو کەسانەدا کە کۆمەڵێک نیشانەی تایبەتیان تێدا دەردەکەوێت لەوانە:**

٦- ڕەقبوون و هەڵئاوسانی بڕبڕەی پشت و مل و سنگ.

٧- ئازاری جومگەکان.

٨- هەوکردنی جومگەکان و میزەڵان و زیان گەیشتن بە پێست.

٩- هەوکردنی چاوەکان.

دەکرێت لەگەڵ شیکاری پرۆتینی (HLA-B27) دا چەند شیکاریەکی دیکەی خوێن و میز ئەنجام بدرێت بۆ دڵنیابوونەوە و دەستنیشان کردنی (-Au

toimmune Disease) کە، لەوانە :

((Rheumatoid Factor (RF)

((Erythrocyte Sedimentation Rate(ESR)

((C-reactive Protein (CRP)

ئەگەر پشکنینی (HLA-B27) ئەرێنی بوو مانای وایە ئەگەری مەترسی توشبوون بە (Autoimmune Disease)کان زۆرە لەو کەسەدا، ئەگەر کەسەکە نیشانەکانی تێدا دەرکەوتن مانای دووچار بوون بە نەخۆشیە (Autoimmune Disease) کانی پەیوەندی دار بە پرۆتینی (HLA-B27) دەگەیەنێت، ئەگەری توشبونەکە بەو نەخۆشیە زیاتر دەبێت ئەگەر هەڵگری نیشانەکان (گەنجێکی تەمەن سەرو سی ساڵ) بێت.

ئەگەر پشکنینی (HLA-B27) نەرێنی بوو، وە نیشانەکانی نەخۆشیەکەی تیا دەرنەکەوتبوو، مانای سەلامەتی کەسەکە دەگەیەنێت، بەڵام دەکرێت کەسێک دژە پەیداکەری (HLA-B27) نەرێنی بێت وە دوچاری نەخۆشیە (Autoimmune Disease) کانیش ببێت.



# HLA-DQ2/DQ8 Test
# Human Leukocyte Antigen

ئەم پشکنینە دەکرێ بۆ زانینی تووشبوونی بە هەستیاری پڕۆتینێکی وەک گلوتین (Gluten) لەکاتی خواردنی پڕۆتینەکە دووچاری هەستیاریی دمێت کە بە هەستیاری گەنم
(Celiac Disease) ناسراوە یەکێکە لەگروپی ئەودژەپەیداکەرانەی کە دەکەونە سەر ڕووی خرۆکەسپیەکانی خوێن و دوو جینی سەرەکی دەگرێتەوە (HLA-DQ2 )(HLA-DQ8)، بوونی جینەکانی (HLA-DQ2/DQ8) لە بۆماوەماددەی کەسێکدا دمیخاتە بەر مەترسی.
نەخۆشیەکە کە بە هۆی هێشی سیستمی بەرگری لەشەوە(Autoimmune Disorder) بۆ مەمیلەکانی ناوپۆشی ڕیخۆلە (Villi) پەیدا دمێت، لەکاتی خواردنی ئەو خۆراکانەی کە پرۆتینی (Gluten) لە پێکهاتەیاندایە وەک گەنم (Wheat) و جۆ (Rye and Barley) لەلایەن ئەو کەسانەی کە هەستیاریان بەو جۆرە لە پرۆتین هەیە، خرۆکە سپییەکانی خوێن وەکو تەنێکی بێگانە و بەهەڵە هێرش دمبەنە سەر خانەکانی ناوپۆشی ڕیخۆڵەکان و لەکاریان دەخەن ئەمەش دمبێتە هۆی تێکشکان و لەکارخستنی مەمیلەکان، بەمەش کرداری هەڵمژینی خۆراکەمادده و ڤیتامین و خوێیەکان کەمدەکاتەوە
لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی هەستیاری گەنم یان بوونی هەستیاری گەنم لە ئەندامێکە نزیکی خێزاندا پێشنیاری ئەنجامدانی ئەم پشکنینە دەکرێت، پشکنینی (HLA-DQ2/DQ8) ئەوە دەستنیشان دەکات کە کەسەکە هەڵگری جینی (HLA-DQ2/DQ8) یاخود نا، ڕێژەی مەترسی توشبوون بە هەستیاری گەنم دیاردەکات.
بۆماوە ڕۆڵێکی گرنگ دەگێرێت لە توشبوون بە نەخۆشیەکە، جینی (HLA-DQ2/DQ8) لە باوانەوە بۆ نەوەکان دەگوازرێتەوە، لەکاتی دەرکەوتنی هەستاری گەنم (Celiac Disease) لە ئەندامی خێزانێکدا دەکرێت ئەندامەکانی تری

خێزانەکە هەڵگری هەمان جینبن، لەکاتی خواردنی پرۆتینی (Gluten) یان (گەنم) لە پەرچە کردارێکدا سیستمی بەرگری لەش هێرش دەکاتە سەر خانەکانی ڕووپۆشی ناوەوەی ڕیخۆڵە.

**نیشانە باوەکانی هەستیاری گەنم:**

١- ئازاری سک و با کردن، با لێبوونەوە.
٢- پیسایی خوێناویی.
٣- بەردەوام سکچوون یان بەردەوام قەبزی.
٤- پیسایی چەور و بۆن ناخۆش.
٥- دڵتێکەڵاتن و هەندێجار ڕشانەوە.

دەکرێت کۆمەڵێک نیشانەی تریش بەدوای خۆیدا بێنێت:

١- کەمی ئاسن.
٢- خوێن بەربوون.
٣- ئازاری جومگە و ئێسک.
٤- داخورانی مینای ددان.
٥- بێهێزی و لاوازی.
٦- دابەزینی کێش.

بوونی جینی (HLA-DQ2/DQ8) مانای هەبوونی هەستیاری گەنم ناگەیەنێت (دەکرێت کەسێک جینی (HLA-DQ2/DQ8) ئەرێنی بێت و دوچاریی هەستیارییش نەبێت) بەڵام نەبوونی جینەکە مانای سەلامەتی کەسەکە و دووری لە هەستیاری بە پرۆتینی (Gluten) دەگەیەنێت.

پشکنینی جینی (HLA-DQ2/DQ8) دەنوسرێت بۆ ئەوکەسانەی کە گومانی هەستیارییان بە پرۆتینی گلوتین لێدەکرێت ،

**هەندی پشکنینی تری لەگەڵی بۆ دەکرێ وەک:-**

١- Anti-tissue Transglutaminase Antibody (tTG)
٢- Endomysial Antibody

٣- CBC
٤- ESR
٥- CRP
٦- Vitamin D and B12 and folate
٧- Iron, Iron Binding Capacity or Transferrin, and Ferritin

هەندێک جار بۆ دەستنیشانکردنی تەواوی نەخۆشیەکە پێویستە پشکنینی (Biopsy) (وەرگرتنی نمونەی لە خانەکانی ناوپۆشی ڕیخۆڵە) ئەنجام بدرێت، لە هەندێک بارودۆخی تایبەتدا کە لەلایەن پزیشکی پسپۆڕەوە بڕیار دەدرێت بۆ دڵنیابوون لە بارودۆخی ڕیخۆڵەکان و کاریگەریەکانی نەخۆشیەکە لەسەر ڕیخۆڵەکان.



# HLA-B51/52 Test
# Human Leukocyte Antigen B5

ئەم پشکنینە ئەنجام دەدرێت بۆ دیاری کردنی بوون و نەبوونی پرۆتینی جۆری (HLA-B51/52) لەسەر خرۆکە سپیەکان، پرۆتینی (HLA-B51/52) لە گروپی ئەو پرۆتینانەیە کە کە یارمەتی سیستمی بەرگری لەش دەدەن بۆ ناسینەوەی لەشە خانەکان و جیاکردنەوەی لەشەخانەکان لە خانە بێگانەکان بە لەش. دژە پەیداکەری (HLA-B5)پرۆتینێکە دەکەوێتە سەر ڕوکاری خرۆکە سپیەکانی لەش .

بوونی پرۆتینی (HLA-B51/52) لەسەر خرۆکە سپیەکان وادەکات سیستمی بەرگری لەش هێرش بکاتە سەر خانە ساغ و تەندروستەکانی لەش، ئەمەش دمێتە هۆی توشبون بە (Autoimmune Disease) کە پەیوەندیان بە پرۆتینی (HLA-B51/52) هەیە وەک (Behcet's Disease).

بوونی پرۆتینی (HLA-B51/52) لەسەر خرۆکە سپیەکان بەهۆی هۆکارێکی بۆماوەییەوە دمبێت کە لە باوانەوە بۆ نەوەکان دەگوازرێتەوە.

باوترین نەخۆشی کە بەهۆی پرۆتینی (HLA-B51/52) لەسەر خرۆکە سپیەکان دووچار دمبینەوە نەخۆشیی (Behcet's Disease).

## نەخۆشی (Behcet's Disease) چییە؟

نەخۆشیەکە کە بەهۆی هێرشی سیسمی بەرگری لەشەوە بۆسەر خانەکانی لەش خۆی توشمان دمبێت (Autoimmune Disease)، هەندێک جار بەهۆی ڤایرۆس یان بەکتریاوە توشمان دمبێت، ئەو کەسانەی کە پرۆتینی (HLA-B51/52) ئەرێنی بێت لەژێر مەترسی توشبوون بەم نەخۆشیەدان.

نەخۆشیەکە دمبێتە هۆی هەوکردنی بۆریەکانی خوێن لە سەرجەم ئاستەکاندا (خوێن بەر، خوێن هێنەر، ملولەکانی خوێن) و زۆرینەی ئەندامەکانی لەش

لەبەر مەترسی ئەم نەخۆشیەدا دەبن، وە بە چەند شێوەی جیاواز کاریگەریەکانی دەردەکەون وەک:

١- برینی ناودەم (برینێکی بە ئازار و شێوە بازنەییە و ناوەڕاستەکەی زەرد یان سپی باو و لێوارەکانی سوورن، دەکرێت دانەیەک یان چەند دانەیەکی لێ دەربکەوێت، ئەم برینە لە سەرجەم بەشەکانی ناو دەم وەک زمان و لێو و پوک و سەرجەم بەشەکاندا دەکرێت دەربکەوێت، ماوەی ١٠ بۆ ١٥ ڕۆژ دەخایەنێت و دەکرێت لە ساڵێک دا دوو بۆ سێ جار دەربکەوێت ،ئەمەش بە نیشانەیەکی سەرەتایی نەخۆشیەکە دادەنرێت

٢- برین لە کۆئەندامی زاوزێ (نێر و مێ) دروست بوونی برینی قوڵ و سوریاوی بە ئازار، ئەم برینانە دەکرێت لە سەرجەم بەشەکانی کۆئەندامی زاوزێ دا دەربکەون.

٣- سەرهەڵدانی گرفتی پێست (Erythema Nodosum) و دروست بوونی پەڵەی سور و پاشان خڕبوون و کۆبوونەوەی کێم لە نێویدا، ئەم برینانە دەکرێت لە بن مووەکانیشدا دەربکەون.

٤- هەوکردنی چینی ناوەندی چاو (Uveitis)، ئازار، لێڵ بوونی بینایی، بێزار بوون بە ڕووناکی، بینینی چینێک لە (Pus ) لە نێو چاو هەندێک کات، سوربوونەوە، بەردەوام بوون و مانەوەی بێ چارەسەری ڕەنگە ببێتە هۆی لەدەستدانی بینایی.

٥- هەوکردنی بۆریەکانی خوێن و سەرهەڵدانی گرفتی تەندروستی لە سوڕی خوێندا (Thrombophlebitis).

٦- هەوکردنی جومگە و ئازار و ڕەقبوون و هەڵئاوسان، (Arthritis) لە جومگەکانی ئەژنۆ و ئانیشک و حەوز دا.

٧- برینی لە کۆئەندامی هەرسدا، دەبێتە هۆی دڵ تێکەڵاتن، سکچوون، بوونی خوێن و ئازار.

٨- هەندێک جار نەخۆشیەکە زیاد لە ڕادە پەرە دەسێنێت و کار لە کۆئەندامی

دەمار دەکات دەبێتە هۆی سەرئێشە و تێکچوونی باری دەروونی و تورەیی و تالێهاتن و تێکچوونی هاوسەنگی و لەبیرچونەوە و ڕەقبوونی مل.
٩- نیشانەکانی نەخۆشیەکە دەکرێت تەشەنەبسێنێت بۆ گورچیلە و میزەڵان و ماسولکە و ئێسک و بەستەرەشانەکانیش بگرێتەوە.

**ئەو سەرچاوانەی کە سوودم لێ بینیوە:-**

- Lab test online red

-Lab test online blue

-Medlineplus lab test in formation

ویکیبیدیا موسوعه حره-

مختبرات صعیه-

مختبر دبابو-

-Lab test online —american association For clinical chemistry



Hawre Mustafa

# Laboratory Science

ئەم پەرتووکە لە خۆگرتنی چەندین
پشکنینی جۆراوجۆر تایبەت بە تاقیگە
دەستنیشانکردنی نەخۆشی و روون
کردنەوەی نەخۆشیەکە، بە هۆی کەمی
دەستەبەری ئەم جۆرە پەرتوکانە لە نێو
کتێبخانەکانماندا بۆیە ئەم پەرتووکە
گرنگیەکی زۆری هەیە بۆ هەموو تاکێکی
خوێنەر و پێویستە هەموو کەسێک
ئارەزووی کڕین و لە خۆگرتەی ئەم
پەرتووکەی لا دروست بێت بەوپەڕی
تواناوە کاری خۆمان ئەنجام داوە بۆ
ئەوەی توانیبێتمان خزمەتێکی بچوکی
کۆمەڵگای خۆمان بکەین.

**٦٠٠٠ دینار**





چاپخانەی رۆشنبیری